**وەزارتی رۆشنبیری**

**بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان**

www.roshnbiri. org
khanaywargeran@yahoo.com

* ناوی کتێب: تیرۆری نێودەوڵەتی
* نووسینی: د. ئەحمەد محەمەد رەفعەت د. ساڵح بەکر ئەلتەیار
* وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە: کوێستان جەمال
* پێداچوونەوەی: ئەحمەد قادر سەعید
* تایپ و نەخشەسازیی کۆمپیوتەری: بەهرە عیزەدین - جیهان محەمەد
* نەخشەسازیی بەرگ: فەرهاد مەلا حەسەن
* زنجیرە: ٢٠
* تیراژ: ١٠٠٠ دانە
* ژمارەی سپاردنی ( ٢١٦ )ی ساڵی (٢٠٠٣)ی وەزارەتی رۆشنبیریی پێدراوە
* چاپ: چاپخانەی رەنج
* چاپی یەکەم: ٢٠٠٣- سلێمانی

# پەیڤێکی پێویست

ئەمڕۆ دیاردەی تیرۆر بۆتە یەکێك لەکێشە هەرە گەورەو ترسناکەکان کە ڕووبەڕووی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەبێتەوەو، دەتوانین بڵێین ئەو بۆشاییەی هەرەسهێنانی بلۆکی ڕۆژهەڵات و کۆتایی هاتنی قۆناغی شەڕی سارد هێنایە ئاراوە، لەلایەن ئەو دیاردە دزێوەوە پڕبۆتەوە.

ئەگەرچی دیاردەی تیرۆر، دوا بەدوای ڕووداوەکانی ١١ی سێبتەمبەری ٢٠٠١ی نیویۆرکەوە، پێی نایە قۆناغی وەرچەرخانی خۆیەوە، بەحوکمی ئەوەش کە جیهان دوای شەڕی سارد، لەزۆربەی بوارەکاندا بەرەو بەجیهانیبوون دەچێت و گەلێ لەو سنوورانە بەرەو هەرەسهێنان دەچن کە ڕێگە لەو سیستەمە نوێیە دەگرن، گومان لەوەدا نابێت تیرۆریش زیاتر ڕێچکەی سنووری دەوڵەتان دەشکێنێت و تیرۆری نێودەوڵەتیش، وەکو ئەمری واقیع خۆی دەسەپێنێت، بەڵام پێشتریش و نەك هەر لەدوای کۆتایی قۆناغی جیهانی دوو جەمسەرییەوە بەڵکو بەشێوازی دیکەو سنووردارترەوە، ڕۆڵی نامرۆڤانەی خۆی بینیوەو گەلێ جار تاوانی تیرۆر تێکەڵ بە تاوانە ئاساییەکان دەکرا. ئێستا وەکو تیرۆری نێودەوڵەتی، سیستەمی نێودەوڵەتی و بەرژەوەندیی گەلان و ئاسایشی مرۆڤایەتی و ماف و ئازادییە بنەڕەتییەکانی تاك ڕووبەڕووی مەترسی دەبنەوە.

گومان لەوەدا نییە، بەهۆی جیاوازیی بەرژەوەندیی سیاسی و بۆچوونی ئایدۆلۆژییەوە، دیاردەی تیرۆرو تێگەیشتنی وەها ئاڵۆزو دژوار دەکرێت، تا بەئاسانی لەتاوانەکانی دیکە جیانەکرێتەوە. بۆیە کارێکی پێویستە کە چەندین پێوەری ورد دابنرێت، بۆ دیاریکردنی سنووری ئەو تاوانە، بۆ ئەوەی بەپێی خواست و بەرژەوەندییە تایبەتیەکان ڕاڤە نەکرێت، بەتایبەتی لەم سەردەمەدا کە

بۆتە گەورەترین کێشەی سەردەمو نیگەرانی لەدڵی دانیشتوانی سەرانسەری گۆی زەویدا دروست کردووە.

وەرگێڕانی ئەم کتێبەم، لەعەرەبییەوە بۆ سەر زمانی کوردی، بەئەرکێکی هەنووکەیی زانی کەخۆمی بۆ تەرخان بکەم، تاوەکو خوێنەری کوردیش زانیاریی تەواوی، لەسەر پێناسەو ئامرازەکانی بەگژداچوونەوەو بنبڕکردنی هۆکارەکانی هەبێت. ئەم کتێبە زیاتر جەخت لەسەر لایەنی یاسایی ئەو دیاردەیە دەکاتو لەسۆنگەی مامەڵەکردن لەگەڵ دیاردەکە، لەسەر ئاستی یاسادانانی نێودەوڵەتیدا، زانیاریی بەپێز بەدەستەوە دەدات.

وەرگێڕ

# بەشی سەرەتا

## توندوتیژی و سیاسەت لەبواری پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا

توندوتیـژی یەکێکـە لـە راسـتییەکانی ئـەم سـەردەمەی کـە تیـایدا دەژیـن و، لەهـەمان کاتیشـدا یەکێکـە لـەو بنەمایانـەی کـە تـاوانی تـیرۆری نێودەوڵـەتی و، گرنگترین دیاردە لـە دیاردەکانی تـاوانی سیاسـی پێـك دەهێنـن. لەسـەر ئاسـتی نێودەوڵـەتی، تـیرۆر بۆتـە بنەمایـەکی کاریگـەر، لـەکردەی وەرگرتنـی بڕیـاری سیاسیدا، هەروەها بووە بەئامرازێك، دەوڵەتان بەکاری دێنن بۆ ئەوەی دوژمنەکان ناچار بکەن ملکەچ بن بۆ ئەو بارودۆخە تازەیەی دەیسەپێنن بەسەریاندا لەبواری سیاسیدا، لەلایـەکی دیکـەوە توندوتیـژی بـووە بەیـەکێك لـەئامرازی ململانێـی سیاسـی لەسـەر ئاسـتی نـاوخۆ. توندوتیـژی بـەلای هەندێکـەوە ئـامرازێکی پاساودراوو پەسەندکراوە بۆ بەرپەرچدانەوەی ستەمو زۆرداری.

# بابەتی یەکەم
# فەلسەفەی تاوانی سیاسی

تیرۆری نێودەوڵەتی دیارترین شێوەی توندوتیژی سیاسییە، لەبواری پەیوەندییە مرۆییەکانداو دواتر یەکێکە لەو تاوانە مەترسیدارانەی دژی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ئاراستە دەکرێت. تێڕوانینی جیاجیای زانستی تاوان، دەربارەی توندوتیژی سیاسی هەیە، هەندێك پێیان وایە، توندوتیژی دژی دەوڵەت، بەمەبەستی تێکدانی ئاسایشی ناوخۆی وڵات، یەکسانە بەو توندوتیژییەی ئاراستەی ئاسایشی دەرەکی یان نەتەوەییەکەی دەکرێت، لەرووی مەترسییەوە وەك تاوانی دەستدرێژیی نێودەوڵەتییە. لایەنگرانی ئەم بۆچوونە پێیان وایە، پێویستە لەسەر دەوڵەت رووبەڕووی توندوتیژیی سیاسی ببێتەوە، بەهەمان ئەو هێزو توندییە کە رووبەرووی دوژمنێکی دەرەکی دەبێتەوە کە دەیەوێت خاکەکەی و سەربەخۆیی سیاسی تێکبدات.

واتەپێویستە لەسەر دەوڵەت رووبەرووی تاوانی سیاسی ببێتەوە بەهەمان ئەو هێزەی کە رووبەرووی دوژمنێکی بیانی دەبێتەوە کە ئامانجی وێرانکردنی دام و دەزگا گشتی و تایبەتییەکانیەتی لەکاتی جەنگدا، تەنانەت ئەگەر بووە هۆی بەزاندنی چوارچێوەی دەستوورو پەنابردنە بەر یاسا نا ئاساییەکان. ئەم تێڕوانینە کە تا سەدەی نۆزدەهەم برەوی‌هەبوو، چەند ئەنجامێکی لێکەوتەوە، کە گرنگترینیان لەسێدارەدانی تاوانباری سیاسی، یان ئەنجامدەری کاری تیرۆریستی بوو، بەوەی کە دوژمنی کۆمەڵگەن، لەو سۆنگەیەوە کە دەستدرێژیی کردنە سەری، لەڕاستیدا دەستدرێژی کردنە بۆ سەر خودی کۆمەڵگە[1].

---

[1] بڕوانە کتێبی (الارهاب السیاسی والقانون الجنائي) د. عبدالرحیم صدقي ١٩٨٥، ل ٨-٩.

بەڵام تیۆری دووەم، کە لەسەدەی نۆزدەهەمدا، وەك کاردانەوەیەك بۆ تیۆری تاکە کەسی دەرکەوت کە داوای رزگاربوونی دەکرد لەچوارچێوەی یاسا یان سیاسەتدا. لایەنگرانی ئەم بۆچوونە پێیان وایە، پێویستە وا سەیری دەوڵەت نەکرێت کە دەسەڵاتێکی رەهایە، بەڵکو بەوە کە دەسەڵاتێکە ئەرکی پاراستنی مافی تاکەکانی لە ئەستۆدایە تیۆرەکە سەرنجی بۆ لایەنە نێگەتیڤەکانی دەست تێوەردانی حکومەت لەکاروباری تاکدا راکێشا، تەنها لەکاتێکدا نەبێت کە دەستێوەردان، بۆ بەرگریکردن و پارێزگاریکردنی مافەکانیان پێویست بێت، بە پابەندبوون بە دەقە یاساییەکان. لە ئەنجامەکانی ئەم تیۆرە ئەوەیە کە دەبێت دەسەڵات لەگەلەوە بێت، نەك لەدەستی فەرمانڕەوادا بێت، چونکە فەرمانڕەوا بوونی خۆی لەویستی گەلەوە وەردەگرێت.

ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە گۆڕانکاریی بنەڕەتی لە بۆچوونی زانستی تاوان، لەمەڕ تاوانی سیاسی پەیدابێت و ئەم جۆرە تاوانە دابنرێت بە دەستدرێژی بۆ سەر کەسی دەسەڵاتدار، نەك بۆ سەر کۆمەڵگەو، دواتر وەکو سەرجەم تاوانەکانی دیکە بە تاوانی ئاسایی دادەنرا[٢].

بەمەبەستی نزیککردنەوەی ئەو دوو تیۆرەی پێشوو، بۆچوونێکی نوێ دەرکەوت، کە دەبێت هەڵوێست و ئەو هاندەرانە بۆ ئەنجامدانی تاوانەکەی لەبەرچاوبگیرێت کە رەنگە هاندەرەکەی تایبەتی بێت کە بانگەشەی بۆ دەکات لە سستمی دەسەڵاتداردا نایبینێت. لەبەر ئەوە، ئەم بۆچوونە دەستی کرد بە هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەو سووککردنی ئەو سزایانەی بەسەر ئەنجامدەرانی تاوانە سیاسییەکاندا دەسەپێنرێت و بەشێوەیەکی تایبەت مامەڵەیان لەتەکدا بکات، بەوەی کەسزادان هەرچۆنێك بێت تاوانباری سیاسی لەکەدار ناکات، لەسۆنگەی پاڵنەرە جوامێرانە نیشتمانییەکانی، کە رەنگە لە تاوانبارێکەوە بیگۆڕێت بۆ

---

[٢] دەربارەی تاوانی سیاسی و قورسی دانانی پێناسەیەکی دیاریکراو بۆی، بڕوانە کتێبی ((نظرية الجريمة السياسية في القوانين الوضعية المقارنة وفي الشريعة الاسلامية))، د. نجاتي سيد احمد. و کتێبی ((الاجرام السياسي))، د. ممدوح توفيق. وکتێبی ((محاضرات في الجرائم السياسية))د. محمد فاضل.

پاڵەوانێکی میللی و سەرنجی جەماوەر رابکێشێت و پشتگیریی رای گشتی بەدەست بهێنێت.

ئەمەش بانگهێشتی زۆربەی یاسادانەران و داڕێژەرانی دەستووری کرد بە لێبوردنێکی زۆرترو توندوتیژییەکی کەمتر لە مامەڵەکردن لەگەڵ تاوانباری ئاساییدا، مامەڵە لەگەڵ تاوانباری سیاسیدا بکرێت کە لەرووی بارودۆخەوە هەردوکیان یەکسان بن، بەڵام بەبێ هاندەری سیاسی، ئەم بۆچوونەش بووە هۆی ئەوەی کە تاوانباری سیاسی چەند دەسکەوتێك بەدەست بهێنێت، لە مامەڵەی یاسادانان و دادگایی و راپەڕاندن لەسەر ئاستی ناوخۆو نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی یەکسان[٣].

لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی‌یەوە، کە زیانێکی گەورەی بەمرۆڤایەتی گەیاند، کۆدەنگی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لەسەر تاوانبارکردنی کارگەلێك کە زیان بەسیستمی گشتی نێودەوڵەتی دەگەیەنن گەڵاڵەبوو. لەوانە: تاوانەکانی جەنگ، تاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی، تاوانەکانی دژی ئاشتی و تاوانەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی.

---

[٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو ((الارهاب السياسي والقانون الجنائي)) ل ١٠-١١.

# بابەتی دووەم
## بڵاوبوونەوەی دیاردەی تیرۆری نێودەوڵەتی

لەکۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکان بەدواوە، زاراوەی تیرۆرو تیرۆری سیاسی و تیرۆری ناوخۆو تیرۆری دەوڵەت و تیرۆری نێودەوڵەتی، لە کەناڵە ناوخۆی و جیهانییەکانی راگەیاندندا زیاتر بەکار دەبرێن. هەروەك چۆن لە رۆژنامەکاندا، هەواڵی ترسناك و دڵتەزێن، سەبارەت بە رفاندنی فڕۆکەو وێرانکردنی باڵیۆزخانەکان و ئاگرتێبەردانیان و بەبارمتەگرتن و تەقاندنەوەی ئۆتۆمبیلە بەمین چێنراوەکان و چەند کارێکی وروژاندن و بێزارکردن و هێرشکردنە سەر نێردراوە حکومی و ناحکومییەکان و ناردنی شتومەکی تەقینەوە بۆ کوشتن و تیرۆرکردنی زیاتری قوربانییەکان. دیاردەی تیرۆر تەنها بە رفاندنی فڕۆکەوە نەوەستا، بەڵکو گەیشتە نوێنەران و دبلۆماتەکانیش، ئەو کارانەی کە لە دژیان دەکرا، بوونە جێی گرنگی پێدان، تا رووداوی رفاندن و بەبارمتەگرتن و گوشتن زیادی دەکرد، ئەگەر حکومەتەکان خواست و داواکانیان دەستەبەر نەکردایە.

لە ١٩٦٩/١٢/٣دا نزیکەی ٤٠ جولەکە دەستیان گرت بەسەر بارەگای نوێنەرایەتی سوریا لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا. لە ١٩٧١/٣/٣دا، بۆمبێکی مۆلۆتۆف فڕی درایە ناو نووسینگەی نوێنەرایەتی عێراق لە نەتەوە یەکگرتووەکان. لە ٢٠/١٠ی هەمان ساڵدا، یەکێك لە ئەندامانی رێکخراوی بەرگریکردن لە جولەکە، لەسەربانێکی بەرامبەرەوە بەتفەنگێکی دوور هاوێژ تەقەی لە بارەگای شاندی سۆڤیەت، لە نەتەوە یەکگرتووەکان کرد لە نیویۆرك[٤].

لەساڵی حەفتادا، کردەی رفاندنی چەند دپلۆماتێکی ئەمریکی لە ئەمریکای لاتین و وڵاتانی دیکە ئەنجامدرا. لە ٣/٦دا بەرپرسی کاروباری کرێکاران لە

---

[٤] بڕوانە:
*Progress Publishers, (Moscow, 1984), P.5.*

باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە گواتیمالا رفێنراو، لە ٢٣ی هەمان مانگیشدا نوێنەری هێڵی ئاسمانی ئەمریکا لە دۆمینیکان رفێنراو، هەروەها لە ٣/٢٤دا، باڵیۆزی ئەمریکا لە پاراگوای رفێنراو، لە ٤/٥دا هەوڵی رفاندنی ئالیۆزی ئەمریکا لە بەرازیل دراو، لە ٦/٧دا باڵیۆزی ئەمریکا لە ئوردن رفێنراو لە ٦/١٠دا نوێنەری سەربازیی ئەمریکی لە ئوردن تیرۆرکراو لە ٧/٢١دا، راوێژکارێکی ئەمریکی لە پاراگوای رفێنراو، لەئابی ساڵی ١٩٧٠دا، باڵیۆزی ئەمریکی لەئۆرگوای رفێنرا[٥].
لە ١٩٧١/١/٨دا، رێکخراوی توبا ماروس، باڵیۆزی بەریتانیای لە ئۆرگوای رفاندو بۆ ماوەی زیاتر لە هەشت مانگ بەدەست بەسەرا گیراوی هێشتییەوەو لە بەرامبەر ئازادکردنی ناوبراودا، داوای ئازادکردنی ١٥٠ ئەندامی رێکخراوەکەیان دەکرد کە لە بەندیخانەی ئۆرگوایدا زیندانی کرابوون، لە رۆژی ١٩٧١/٩/٩دا دوای سی رۆژ لە ئازادکردنی ١٠٦ ئەندامی رێکخراوەکە باڵیۆزی ناوبراو ئازاد کرا[٦].

سەرەڕای ئەوەش، تەنها نوێنەری وڵاتان و حکومەتەکان ئامانجی کارە تیرۆریستییەکان نەبوون، بەڵکو کار گەیشتە ئەوەی لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٢دا، سکوتلاندیارد ناچاربوو، بۆ یەکەم جارو دوای جەنگی دووەمی جیهانی رێوشوێنی ئەمنی تایبەت و توند لەسەر نووسینگەی پۆستەی لەندەن دابنێت، لەئەنجامی زنجیرەیەك تەقینەوە کە لەبیناکەدا روویان دا، لەئاکامی ناردنی شتومەکی (پۆستەداو) کە مادەی تەقینەوەیان تێدابوو. لەئەنجامی چەندین رووداوی هاوشێوەو، باهوجونا (Bahuguna)ی وەزیری گەیاندنی هندستان بەیاننامەیەکی تایبەتی لە پارلەمانی وڵاتەکەیدا راگەیاند، سەبارەت بە دۆزینەوەی ٥٠ ئامێری تەقینەوە کە بەهۆی پۆستەی ئاسمانییەوە نێردرابوون بۆ نووسینگەی پۆستەی (نیودەلهی)و توانرابوو پووچەڵ بکرێتەوە. وەزیرەکەی هندستان لە لێدوانەکەیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە هەندێك لەو شتومەکانە ئامێری ئەلەکترۆنی ئاڵۆزیان لەنێودا بووەو دوای پشکێنینی لەلایەن پسپۆڕانەوە،

---

[٥] بڕوانە کتێبی (مکافحە الارهاب)، د. احمد جلال عزالدین، ل١٤-١٥.
[٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ت١٨.

دەرکەوتووە کە پێکهاتەی ئەو ئامێرانە لە هندستان و هیچ کام لە وڵاتە عەرەبییەکاندا دروست نەکراون.

جگە لە چەندین راپۆرتی جۆراوجۆر، لەمەڕ چالاکی تیرۆریستیی رێکخراوی ئوستاشیز کە رێکخراوێکی نیشتمانیی جوداخوازە لە کرواتیا کە لە ساڵی ۱۹۲۹دا، دامەزراوەو کارەکانیان لەدژی شاندە دپلۆماتییەکانی یوگسلافی ئەنجام دەدەن و لەساڵی ۱۹۷۲دا، هەستاوە بە رفاندنی فڕۆکەیەکی سویدی کە ۹۰ سەرنشینی هەڵگرتبوو.

لە تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۷۲دا، چەند ئەندامێکی دەزگای موخابەراتی ئیسرائیلی (موساد)، کتێبخانەی پیاوێکی فەلەستینی و ماڵی مەحمود ئەلهەمشری نوێنەری رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستینیان لە پاریس تەقاندەوە.

لە ١٤ی ئابی ۱۹۷۳یشدا، وەزارەتی دەرەوەی نەرویج دبلۆماتێکی ئیسرائیلی بەناوی (Yigal Eyal) دەرکرد، بەبیانوی تێوەگلانی لە رووداوی تیرۆرکردنی ئەحمەد بوشیکی بەرەگەز مەغریبی لە شاری لیلیهامر (Lillehammer)، لەکاتی رووداوەکە دوو ئیسرائیلی لە ۱۹۷۳/۷/۲۳دا دەستگیرکران و لە ۱۹۷٤/۹/۱۰دا، ئوتومبیلێکی بەمین چێنراو لە بۆینس ئایرس تەقییەوەو بووە هۆی کوژرانی جەنڕاڵ کارلۆس براتس و هاوسەرەکەی کە لە چیلییەوە کۆچیان کردبوو(۷).

لەساڵی ۱۹۷٤دا، توانرا بۆمبێکی کۆنترۆڵکراو لەناو فڕۆکەیەکی سەر بە کۆمپانیای هێڵی ئاسمانیی فەنزویلا لە قوبرس پوچەڵ بکرێتەوەو (۹٥) سەرنشینی فڕۆکەکە رزگار کران. لە ۱۹۷٥/۱۰/٦دا، چەند چەکدارێك بەچەکی ئۆتۆماتیکی تەقەیان لە برنارد لیتۆن کرد، کە یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی پارتی دیموکراتی چیلی و لە ئاکامی ئەو رووداوەدا هاوسەری ناوبراو تووشی ئیفلیجی بوو.

لە ۱۹۷٦/۹/۲۱دا، بۆمبێکی مۆلۆتۆف، لە گۆڕەپانی شێریدان لە واشنتۆن تەقییەوەو بووە هۆی کوشتنی ئورلاندو لیتلییر (Orlando Letelier)ی وەزیری

---

(۷) بڕوانە
Cit,p5.:

دەرەوەی پێشووتری چیللی لە حکومەتەکەی ئەلیندی (Allende)، ئەو کارە تیرۆریستییەش لەلایەن ژمارەیەك پۆلیسی بەکرێگیراوی نهێنیی چیللییەوە ڕێکخرابوو[8].

لە ئەیلولی ساڵی ١٩٧٧دا، ژمارەیەك لە ئەندامانی ڕێکخراوی بادر ماینهۆف هێرشیان کردە سەر بازرگانێکی ئەڵمانی بەناوی هانز مارتن شلایر (Hans Martin Schleyer)و لە ئەنجامدا شۆفێرەکەی و سێ پاسەوانی تایبەتی ناوبراو کوژران و خۆشیان رفاندو لە بەرامبەر ئازادکردنیدا، داوای بەردانی (١١) زیندانی ئەندامانی ڕێکخراوەکەیان کرد، لەگەڵ پێدانی ٥٠ هەزار دۆلار بەهەر یەکێکیان و هەروەها ڕێگەشیان پێبدرێت کە سەفەر بۆ ئەو وڵاتە بکەن کە خۆیان دیاری دەکەن، بەڵام دەسەڵاتدارانی ئەڵمانیا ملیان بە داواکاری رفێنەرەکان نەدا، بۆیە بەکوشتنی شلایر کۆتایی هات.

لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٧دا، حکومەتی ژاپۆن ناچاربوو داواکاریی ئەو تیرۆریستانە قبوڵ بکات کە سەر بەڕێکخراوی سیکیجین (Sekigun)ی ژاپۆنی بوون، کە فڕۆکەیەکی کۆمپانیای هێڵی ئاسمانی ژاپۆنییان بەسەرجەم سەرنشینەکانەوە رفاندبوو، لەمیانەی گەشتێکیدا لە تۆکیۆوە بۆ پاریس، رفێنەرەکان داوای بڕی شەش ملیۆن دۆلارو ئازادکردنی (٩) ئەندامی ڕێکخراوەکەیان دەکرد کە لە بەندیخانەکانی ژاپۆندا زیندانی کرابوون، هەڕەشەی کوشتنی سەرنشینەکان و ستافی فڕۆکەکەیان دەکرد، ئەگەر داواکەیان جێبەجێ نەکرێت و. پاش جێبەجێکردنی داواکەیان فڕۆکەکە لە جەزائیر نیشتەوەو سەرنشینەکانی خۆیان دا بەدەست دەسەڵاتدارانی جەزائیرەوە. فۆکۆدای سەرۆك

---

[8] لەوتەیەکی ئیزابیل لیتلێیری هاوسەرەکەی ئورلاندۆ لیتلییردا بۆ گۆڤاری نیو تایمزدا هاتووە:

*rected against a great many people in both*

*Chile and*

*Killers, but by the state machinery of chile and some other Latin American*

*New Tims, No. 11, March 1979, p.28.*

وەزیرانی ئەوکاتەی ژاپۆن رایگەیاند کە سەرجەم هەوڵ و کۆششەکانی دەخاتەگەڕ، لەپێناوی پێشخستنی هاوکاریی نێودەوڵەتی، لە بواری قەدەغەکردنی تیرۆرو رفاندنی فڕۆکەدا[9].

لە ١٣ەی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٧دا، ژمارەیەك لەبەرەی میللی رزگاریخوازی فەلەستینی، فڕۆکەی لۆفتهانزایان لە فڕۆکەخانەی مەقادیشۆ بە (٧٩) سەرنشینەوە رفاند، داوای ئازادکردنی چەندین ئەندامی رێکخراوەکەیان کرد کە لەبەندیخانەی ئەڵمانیادا زیندانی کرابوون و هەروەها داوای بڕی ١٨ ملیۆن دۆلاریشیان کرد، لەو کاری رفاندنەی فڕۆکەخانەی مەقادیشۆدا، هێزەکانی قەلاچۆکردنی کاری تیرۆری ئەڵمانی توانیان دەست بەسەر فڕۆکەکەدا بگرن و بارمتە گیراوەکان رزگار بکەن[10].

لە ٤ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٩دا، ژمارەیەك خوێندکاری توندڕەو دەستیان گرت بەسەر بارەگای باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە تاران، دوای ئەوەی لەلایەن ژمارەیەك لە پاسەوانانی شۆڕشی ئەو وڵاتەوە رێگەیان پێدرا بچنە ژوورەوە توانیان دەست بەسەر کۆمەڵێك بەڵگەنامەی باڵیۆزخانەکەدا بگرن و ئەندامانی باڵیۆزخانەکەشیان بە بارمتەگرت، دوای ئەوەی هەموو ئەو هەوڵانە شکستیان هێنا کە درابوون بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، خوێندکارەکان رایانگەیاند بارمتە گیراوەکان رزگار ناکەن، تا ئەوکاتەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا شای ئێران بدات بەدەستی حکومەتی تارانەوە، بەمەبەستی سزادانی بەرامبەر بەو تاوانانەی کە لەسەردەمی دەسەڵاتیدا ئەنجامی دابوون. لە ٢٢ی تشرینی دووەمدا، خوێندکارەکان بەیاننامەیەکیان دەرکردو تیایدا هەڕەشەی کوشتنی بارمتە گیراوەکان و سووتاندنی باڵیۆزخانەکەیان کرد، ئەگەر ئەمریکا هەوڵی بەکارهێنانی هێز، بۆ رزگارکردنی بارمتە گیراوەکان بدات[11].

---

[9] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦-٧

[10] بڕوانە کتێبی(مکافحه الارهاب) د. احمد جلال عزالدین، ل٢٠، پەراوێزی(١).

[11] بڕوانە کتێبی ((سلطات الامن والحصانات والامتیازات الدبلوماسیة في الواقع النظری مقارناً بالشریعة الاسلامیة)) فاوی الملاح، ١٩٨١، ل٦٣٣-٦٣٤.

لە مانگی مایسی ساڵی ١٩٨٠دا، ڕۆژنامەی دەیلی میل (Daily Mail) لە بابەتێکیدا جەختی لەسەر تێوەگلانی موخابەراتی بەریتانی دەکردەوە، لە ئامادەکردنی ژمارەیەك تیرۆریست، بۆ کوشتنی سەرکردەکانی بەرەی ڕزگاریخوازی زیمبابۆی، ڕۆژنامەکە باسی لەوەش کردبوو، ئەو ڕاهێنراوانە جل وبەرگی سەربازیی زیمبابۆیان لە لوساکا لەبەر کردبوو وهەوڵیانکوتابووە سەر بارەگای نوێنەرانی بەرەی ڕزگاریخوازی زیمبابۆی لە لۆساکاو، جواشوا نۆکۆمای (Joshua Nokona) سەرکردەی بەرەی ناوبراو، بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لەمردن ڕزگاری بوو، کاتێك توانی لەدوا ساتەکاندا هەڵبێت. لە شوباتی هەمان ساڵدا، هەوڵی کوشتنی ڕۆبەرت مۆگابی سەرۆك وەزیرانی ئێستا درا، لەکاتی هەڵبژاردن لە ڕۆدیسیادا، کە بۆمبێکی چێنراو لەسەر ڕێگەکەی دانرابوو کە لێوەی دەچوو بۆ کۆشکی ڤیکتۆریا، بەمەبەستی کۆبوونەوەیەکی تایبەت بەهەڵبژاردن. سێیەم پیاویش لە لیستی تیرۆر کراوەکاندا، جۆسیە تۆنۆگارای (josiah Tongogara) سەرۆکی باڵی سەربازیی ڕێکخراوی زانۆ (Zanu) بوو، کە لەئەنجامی ڕووداوی پێکادانی ئوتومبیلدا لە ڕودیسیا، بەر لەبەستنی کۆنگرەی لەندەن لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٩دا.

لە ١٩٨٠/٧/٢٢دا، توانرا تاقمێك لە سوپای ژاپۆنی کۆنترۆڵ بکرێن کە بەنیازبوون فڕۆکەیەکی کۆمپانیای فڕۆکەوانی ژاپۆنی، لەنیو دەلهی پایتەختی هندستان بفڕێنن[١٢].

لە ١٩٨٢/١/١١دا، تاقمێکی سەر بەڕێکخراوێك کەناوی سوپای ڕزگاریخوازی تایلەندییان لەخۆیان نابوو، بەر لەوێرانکدرنی باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە بانکۆك دەستگیرکران.

لە ١٩٨٥/١٠/٦دا، کەشتی نەفەرهەڵگری ئەشیل لۆرۆی ئیتاڵی رفێنرا کە ٧٨٠ سەرنشینی هەڵگرتبو، جگە لەستافی کەشتییەکە خۆی، لەمیانەی گەشتێکدا، لەنێو بەندەرەکانی دەریای سپی ناوەڕاستدا، نزیك کەنارەکانی

[١٢] بڕوانە کتێبی(مکافحە الارهاب)، د. احمد جلال عزالدین کە پێشتر ئاماژەی پێکرا، ل٤٢، پەراوێزی (٢).

پۆرسەعید، ئەوکارەش لە لایەن چوار فەلەستینییەوە ئەنجامدرا کە داوای ئازادکردنی ٥٠ فەلەستینییان دەکرد، لەنێو بەندیخانەکانی ئیسرائیلداو، رفێنەرەکان هەڕەشەی کوشتنی ئەمریکیو بەریتانییەکانی ناو کەشتییەکەیان دەکرد، ئەگەر داواکانیان جێبەجێ نەکەن. لە ئەنجامدا رفێنەرەکان لیون کلینجهوفەری ئەمریکی بەرەچەڵەك جولەکەیان گوشت کە یەکێك بوو لەسەرنشینەکانی ناو کەشتییەکەو تەمەنی ٦٩ ساڵ بوو. لەکۆتاییداو پاش زنجیرەیەك دانوستان، رفێنەرەکان خۆیان تەسلیم بەدەسەڵاتدارانی میسری کرد، لە رۆژی (٨٩ی تشرینی یەکەمداو بەوجۆرە کۆتایی بەکردەی رفاندنەکە هات کە ٤٤ سەعاتی خایاندو، سەرنجی جیهانی بەلای خۆیدا راکێشاو، بووە هۆی ئەوەی کە ئستولی چوار دەوڵەتیش لەئاوی دەریای سپی ناوەڕاستدا لە جوڵەدابن، بۆ چاودێریی هێڵی رۆشتنی کەشتییە رفێنراوەکە[١٣].

لە ٢٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٧دا، فڕۆکەیەکی نەفەر هەڵگری سەر بەکۆمپانیای فڕۆکەوانی کۆریا، بە ١١٥ سەرنشینەوە بێسەروشوێن بوو، سەرجەم هەوڵەکانیش بۆ دۆزینەوەی پارچەی فڕۆکەکە شکستی هێناو پێدەچوو فڕۆکەکە لەئەنجامی تەقینەوەیدا لەئاسمان، لە یەکێك لە ناوچەکانی دەوڵەتی بۆرمادا کەوتبێتە خوارەوە.

لە ١١ی کانونی یەکەمی ١٩٨٧دا، لە فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی بەحرێندا، دوو کەس دەستگیرکران کە پاسپۆرتی ژاپۆنیان هەڵگرتبو، یەکێکیان پیاوێکی تەمەن حەفتا ساڵو ئەوی دیکەشیان ژنێکی تەمەن بیستو هەشت ساڵ بوو، کاتێك کە لێپرسراوانی فڕۆکە خانەکە زانییان پاسپۆرتەکانیان ساختەیەو رووبەڕووی لێپێچینەوە یان کردن، ئەو دوو کەسە هەوڵی خۆکوشتنیان دا، هەر دەسبەجێ پیاوەکە گیانی لەدەستدا، بەڵام توانرا گیانی ژنەکە رزگار بکرێت. لەئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەگەڵیدا کرا، دەرکەوت کە ئەو ژنو پیاوە پێشتر لەنێو ئەو فڕۆکە کۆرییەدا بوون کەبێ سەروشوێن بوو لە گەشتێکدا لە بەغداوە بۆ ئەبوزەبیو

---

[١٣] بڕوانە کتێبی( الارهاب والعنف السیاسی)، د. احمد جلال عزالدین، ژمارە (١٠) قاهرە، ١٩٨١، ل٢٠٤-٢٠٨.

ئـەوێیان بەجێهێشـتبوو تـا سـواری فڕۆکـەی کۆمپانیـای (خـەلیج)بـبن بـەرەو بەحرێن‌و. لەکاتی‌دەستگیرکردنیان، بەنیازی دەرچوون بـوون بـۆ دەرەوەی وڵات. لەئاکامی لێپێچینەوەکاندا دەرکەوت پەیوەنییان هەبووە بەبێ سەرو شوێن کردنی فڕۆکە کۆریایەکەوە، بۆ کۆریای باکوور کاریان کردووەو، بەر لەهەڵسانی فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی ئەبوزەبیدا، بۆمبێکی مۆلۆتۆفیان تیادا دانابوو.

لـە ٥ی نیسـانی سـاڵی ١٩٨٨دا، کەسێکی چەکدار دەمانچەی خستە سـەر سەری فڕۆکەوانی کۆمپانیای هێڵی ئاسمانیی کوێت کە لەبانکۆکەوە بەرەو کوێت دەڕۆیشت، داوای لـە فڕۆکەوانەکـە کـرد، بـەرەو فڕۆکەخانـەی مەشـهەد لـەئێران بڕوات‌و. لەهەمان کاتدا ژمارەیەکی دیکەی هاوکاری ئەو کەسە، لەنێو فڕۆکەکەدا کـە دەمانچەو بۆمبی دەسـتییان پێبـوو، هەسـتان بەکۆکردنـەوەو بەسـتنەوەی سەرنشـینەکان. رفێنـەرەکان داوای بـەردانی ١٧ زیندانییـان دەکـرد کـە لـەکوێت زیندانی کرابوون‌و هەڕەشەی کوشتنی بارمتەگیراوەکانیان کرد، ئەگەر داواکەیان جێبەجێ نەکرێت. پاش ئەوەی فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی مەشهەد سووتەمەنی وەرگرت، لەسەر داوای رفێنـەرەکان فڕۆکەکە لەگەشتەکەیدا بەرەو بەیروت چوو، بەڵام دەسەڵاتدارانی لوبنان رێگـەیان پێنـەدا لـە خاکەکـەیاندا بنیشـێتەوە، بۆیـە ناچاربوو لەگەشـتەکەیدا بـەردەوام بێـت، تـا لەفڕۆکەخانـەی لارناکـای قوبـرس نیشـتەوە، لـە ئـەنجامی شکسـت هێنـانی‌و تووێژەکـان، بـۆ بـەردانی ئـەو زیندانییانـەی لە کوێت گیرابوون، رفێنـەرەکان هەڕەشـەی خۆیـان جێبـەجێکردو یەکێك لە کوێتییە بارمتە گیراوەکانیان کوشت‌و تەرمەکەیان فڕێ دایە سەر زەوی فڕۆکەخانەکـە. جـارێکی دیکـە خـانمێکی کوێتـی بارمتـەگیراویان کوشـت‌و بەشێوەیەکی دڕندانـە تەرمەکـەیان فڕێدایـە خـوارەوە، بەمەبەسـتی ترسـاندن‌و تۆقاندنیان، بەتایبـەتی دوای ئـەوەی کـە دەسـەڵاتدارانی قوبـرس ئامـادە نـەبوون سـووتەمەنی بـدەن بەفڕۆکەکـە. پاشـان فڕۆکەکـە گەشـتەکەی بـۆ جـەزائیر دەستپێکرد، دوای وەزامـەندیی ئەو وڵاتـە بەڕێکـەوتن لەگـەڵ حکومـەتی کوێتـدا، بەمەبەسـتی دانوسـتان لەگـەڵ رفێنـەراندا، مـاوەی ئـەو کـاری رفاندنـە ١٦ رۆژی خایاند، دوای ئـەوە رفێنـەرەکان خۆیـان تەسـلیم بـە دەسـەڵاتدارانی جەزائیر کـرد،

بەمەش درێژترین کاری رفاندن کۆتایی هات کە ویژدانی ملیۆنەها کەسی لەسەرانسەری جیهاندا هەژاند[14].

لە ٢١ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٨دا، فرۆکەیەکی نەفەر هەڵگری سەر بە کۆمپانیای پان ئەمریکان (PAN AM)، لەگەشتی ژمارە ١٠٣یدا، لە سەر گوندی لۆکەربی لە ئۆسکۆتلاندا تەقییەوە، لەئەنجامدا ٢٧٠ کەس کوژران و. لە ١٩ی ئەلولی ١٩٨٩دا فرۆکەیەکی دیکەی جۆری (دی.سی ١٠)ی نەفەرهەڵگری، سەر بەکۆمپانیای یوتی ئەی (UTA) فەرەنسی، لەگەشتی ژمارە ٧٧٢یدا، لەسەر نەیجەر تەقییەوەو لەئەنجامدا ١٧١ کەس کوژران، هەر لەکاتی تەقینەوەی ئەو دوو فرۆکەیەوە، پەنجەی تۆمەتباری بۆ چەند لایەنێك درێژ کرا بەوەی بەرپرسن لەوکارە تیرۆریستییەدا، بەبێ ئەوەی بەڵگەی سەلمێنەریان بەدەستەوە بێت کە جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوەو. رۆژی ٢٠ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٩١، نامەیەك لەلایەن نوێنەرانی هەمیشەیی فەرەنساو بەریتانیاو ئەمریکاوە ئاراستەی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان کراو راگەیاندنێکی سێ قۆڵیان، سەبارەت بەو کارە تیرۆریستییە دەرکرد، لەبارەی ئەنجامی لێکۆڵینەوەی تەقینەوەی هەردوو فرۆکەی (پان ئەمریکانی-١٠٣)و(یو.تی.ئەی-٧٧٢). بەگوێرەی ناوەڕۆکی راگەیاندنەکە، بەرپرسیارێتی رووداوەکانیان خستە ئەستۆی لیبیا و، داوایان لێکرد وەڵامی داواکاریی هەرسێ وڵاتەکە بداتەوە، دەربارەی گرتنەبەری رێوشوێنی دادگایی کردنی تاوان باران هەروەها داوایان لێکرد، بەشێوەیەکی بەرچاوو یەکجارەکی، سەرجەم جۆرەکانی کاری تیرۆریستی رابگرێت و کۆمەك و هاوکاری کردنی ئەو گروپانەی خەریکی لەو جۆرەشن بوەستێنێت، لەگەڵ وەرگرتنی رێوشوێنی بڕوا پێکراوو دیار، کە بیسەلمێنێت دەست بەرداری کاری تیرۆر بووە[15].

---

[14] رۆژنامەی قەبەسی کوێتی، ٥٧٢٨، شەممە ٢٣/نیسانی/١٩٨٨، ل٣٠.

[15] بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لەلایەن کۆمەڵەی گشتی و ئەنجومەنی ئاسایشەوە، لە خولی (٤٦)ە میدا، لە رۆژی ٣١ی کانونی یەکەمی ١٩٩١ دەرچوو (A/46/898;S/23309).

لە ئەنجامی ئەوەی لەپێشەوە باسمان کرد، بۆمان روون بووەوە کە لەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا، کار گەیشتۆتە چی، بەجۆرێك کە کاروبارەکان ئالۆزبوون و گرنگی خۆیان وەرگرتووەو مەترسییەکانیش روو لە زیادبوونەو سەرجەم بەڵگەنامەو رێوڕەسمی نێودەوڵەتی و مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانی لەڕێگەی شەپۆلی ستەم و زۆرداریی و کاری تیرۆریستییەوە پێشێل دەکرێن، کە زیان بەگیانی مرۆڤایەتی دەگەیەنێت و هەڕەشەیە بۆ سەر گیانیان. بەڵام ئەوەی جێی مەترسیی زیاترە، شکستی دەوڵەتانە لە چارەسەرکردنی هۆیە شاراوەکانی پشت تیرۆرەوەو هەڵوێستی سلبی نەتەوە یەککگرتووەکانە، لە رووبەروو بوونەوەی ئەو دیاردە مەترسیدارەو لاوازی و بێ توانای لەوەرگرتنی رێوشوێنی یەکالاکەرەوە، بەرامبەر بە ئەنجامدەرانی ئەو کارەتاوانبارییانەو تەیارکردن و کۆکردنەوەی رای گشتی جیهان لەدژی. کە دەبێتە هۆی ئەوەی پەلو پۆ بۆ سەرانسەری جیهان بهاوێت.

# بابەتی سێیەم
# ڕەهەندە سیاسییەکانی کێشەی تیرۆر

وێڕای قورسیی بەدەستهێنانی ئاماری هەموو حاڵەتەکانی تیرۆر، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا، بەڵام بەتێڕوانینێکی خێراو هەمەلایەنە لە ڕووداوەکاندا، دەردەکەوێت کە نیوەی کارە تیرۆریستییەکان لە ساڵانی حەفتاکاندا، لە ئەوروپاو ٢١٪ی لەئەمریکای لاتین و ١٤٪ی لە ئەمریکای باکوورو ١١٪شی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقادا ئەنجام دراون.

لەساڵی ١٩٧٠دا، ژمارەی کارە تیرۆریستییەکان لە ئەمریکای لاتیندا بووە بەدوو هێندە، هەروەکو ئەوەی لە ئەوروپادا هەبوو. بەڵام لەساڵی ١٩٧٨دا، گۆڕانکاریی دیارو تێبینیکراو لەو بارەیەوە ڕوویدا، بەجۆرێك ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقا پەرەسەندنێکی فراوانی لە کارە تیرۆریستییەکاندا بەخۆوە بینی[١٦]

لە ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٨دا، تێچووی ڕێوشوێنی ئەمنی پێویست و کاری دڵنیاکردنەوە لە دژی ڕووداوە تیرۆریستییەکان بەرز بووەوە، بۆ ژمارەیەکی خەیاڵی کە بەچەندین ملیار مەزەندە دەکرێت، بەڵام ئەو بڕە پارانەی کە ڕفێنەرەکان، لە بەرامبەر ئازادکردنی بارمتە گیراوەکاندا داوایان دەکرد ئەوەی ڕاگەیاندراوە بەنزیکەی ١٤٥ ملیۆن دۆلار مەزەندە دەکرێت[١٧]

---

[١٦] سەبارەت بە تەشەنەکردنی کردەی تیرۆری نێودەوڵەتی لەماوەی ١٩٧٣-١٩٨٢، بڕوانە کتێبی (الارهاب والعنف السیاسی)، د. احمد جلال عزالدین، ل١١٨-١٢٤و، بابەتی (انتشار الارهاب الدولی)، خضر الدهراوی لە گۆڤاری (السیاسة الدولیة) ژمارە (٧٧)، ١٩٨٤، ل١٤٣-١٤٦.

[١٧] هەمان سەرچاوەی پێشووی (الدهراوی)، ل١٤٣-١٤٦.

**هەندێ پێیان وایە کە ئەو بارودۆخە ناهەموارەی جیهان پێی گەیشت لەسایەی تیرۆردا، ئەو دیاردەیە دەکات بە فاکتەرێکی نوێی پەیوەندیی نێودەوڵەتی و هۆکارێکی بنەڕەتی بنەماکانی ئەو پەیوەندییە[١٨]**

**ئەو شەپۆلە تیرۆرەی کە لەم ساڵانەی دواییدا بە جیهاندا بڵاوبوەوە، بووە هۆی جیاوازیی بیرو بۆچوونەکان و کۆششەکان کە پەیوەستن بەو هۆیانەی دەتوانرێت لە ڕێگەیانەوە، ئەو تاوانە قەلاچۆ بکرێت و کۆتایی بەو دیاردە مەترسیدارە بهێنرێت و لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش ئیدانە بکرێت کە دەبێتە هۆی تێکدانی ئاسایشی ناوخۆو لەمپەرخستنە بەردەم گەشەکردنی سروشتی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و کارەکانی توندوتیژی کە دەبێتە هۆی کوشتن و لەناوبردنی گیانی سەدان کەسی بێتاوان و وێرانکردن و ڕووخاندنی دام و دەزگاکان و دەست بەسەراگرتنی، هەموو ئەوانەپێویستییان بە وەئاگا هێنانەوەی ویژدانی مرۆڤایەتی و گرنگی پێدانی جیهانەو پێویستە دەسبەجێ و بەشێوەی جدی کار بکرێت، لەپێناو گەیشتن بەو ئامرازو ڕێگە چارانەی کە دەتوانرێت لەڕێگەیانەوە، کۆتایی بەو تاوانە مەترسیدارە بهێنرێت کە قاڵبێکی نێودەوڵەتی وەرگرتووە.**

---

[١٨] جینکن لەم بارەیەوە دەڵێت:

*e increased markedly in the past few Years. Political and Criminal extremists in Various parts of the World have attacked Passengers in airline terminals and railway stations; planted bombs in govermment buildings, The offices of multinational coporations, Pubs, and theares; hijacked airliners and ships, even ferry boatsin Singaport; held hundreds of Passengers hostages; Seized embassies; and kidnapped government official, diplomats, and business executives. We read of new incidents a lmost daily..Terrorism has become a new element in international relations*

*Terrorism and world security, ed, by David Carlton and Carlo Schaerg, Croom Helm, (London, 1975), P.B.*

ئەوەی جێی ئاماژە بۆکردنە، لەئەنجامی شیکردنەوەی هەندێ کاری تیرۆریستییەوە، چەند ئەنجامێکی گرنگمان دەست دەکەوێت، لەوانە بوونی پەیوەندیی توندو تۆڵ، لەنێوان تیرۆرو هێزە توند رەوەکاندا کە هەوڵ دەدەن بۆ لەباربردنی پشتگیریکردنی سەقامگیری و قەدەغەکردنی پیادەکردنی ئەو سیاسەتانەی ، کە ئامانجی کەمکردنەوەی بشێوی جیهانەو، کەڵەکە بوونی ململانێی چەکداری و زیان گەیاندنە بە بزوتنەوە دیموکراسییەکان، لەچەند وڵاتێکی جیهاندا.

لەنێو مێژووی تیرۆرو مێژووی توندو تیژیدا (بە هەموو جۆرەکانیەوە)، پەیوەندییەکی توندو تۆڵ هەیە، نەشونماکردنی دیاردەی توندو تیژی لەقۆناغە جیاجیاکان، هاوکات بووە لەگەڵ دەرکەوتنی ناکۆکییە کۆمەڵایەتیەکاندا[١٩]، بەشێوەیەکی بنەڕەتی بۆ زاڵبوون بەسەر هەر جۆرێك لە جۆرەکانی توندوتیژیدا، پێویستە بەسەر ئەو ناکۆکییانەدا زاڵ بین و، دەتوانرێت ناکۆکی ئابووری و سیاسی و تەنانەت ئایدیۆلۆژی، بەو هۆیانە دابنرێن کە دەبنە مایەی سەرهەڵدانی توندو تیژی و هەر ئەو هۆیانەش دەکرێن بەبیانوو پاساو بۆ توندو تیژی.

رەنگە توندوتیژی یەکێك لەم دوو شێوەیە وەربگرێت:-

١. کاری راستەوخۆ، بە مەبەستی لەناوبردن و قەڵاچۆکردنی سەرچاوەی توندوتیژی پرۆسە جەنگییەکان، کارەکانی تۆڵەسەندنەوە، ئەو سزایانەی کەسستمی یاسای نێودەوڵەتی بڕیاری لەسەر دەدات و بەکارهێنانی هێز لەسەر ئاستی تاك

٢. زەبری سیاسی و ئابووری کە هیچ شتێك نییە ببێتە پاساو بۆی لەدەقی یاساکانی کارگێڕی و مەدەنی و تاوانکاریدا بەجیا، بەڵام دەکرێت لەنێو ئەو سیستمە سیاسییەی ئەو وڵاتەدا کە پەیڕەو دەکرێت، یان شێوازە ئابوورییەکەی یان کۆمەڵایەتییەکەی، تێهەڵکێش کرابێت وەکو دەسەڵاتە فاشییەکان، یان دەسەڵاتە رەگەز پەرستەکان.

---

[١٩] بڕوانە کتێبی (الارهاب في القانون الجنائی) د.محمد مؤنس.

بەردەوامبوونی دیاردەی توندوتیژی، بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی، بەبوونی ئەو ناکۆکییانە دیاری دەکرێت کە مەحاڵە لە ڕێگەی ڕێککەوتن و قایلبوونی نێوان سەرچاوەی ئەو ناکۆکییانە چارەسەر بکرێت کە ئەوانیش دەوڵەتان، یان چینەکان، یان تاکەکان دەگرێتەوە، جگە لەوەی ڕەنگە پێکهاتەی ئەو ناکۆکییانە، لەرووی بابەت و ئەو بنەمایەوە کە لەسەری دامەزراوە، جیاوازیی بنەڕەتییان هەبێت. ڕەنگە ئەو ناکۆکییانە، لەنێوان دەوڵەت و تاك، یان دەوڵەت و چینێکی دەست نیشانکراو، یان چینی دەسەڵاتدار یان چەوساوەکان، جگە لە توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگا یان تاك و چینی دەست نیشانکراو یان چینەکانی دیکەدابێت، بەمەرجێك هیچ کامیان لەپێگەی دەسەڵات، یان تاکدا نەبن[٢٠].

بەهۆی بوونی وەها ناکۆکی گەلێك، لە هەموو کۆمەڵگە ناوخۆیی و نێودەوڵەتییەکاندا، وای لە هەندێ شارەزایانی زانستە سیاسییەکان کرد، بەمەبەستی هەوڵدان بۆ شیکاری و بنبڕکردنی دیاردەی تیرۆر، چەندین شێوازی تیرۆر، بەم جۆرەی خوارەوە بخەنەڕوو[٢١]:

(تیرۆری شۆڕشگێڕانە- ناوخۆیی-نارەسمی) (تیرۆری شۆڕشگێڕانە- ناوخۆیی- رەسمی) (تیرۆری شۆڕشگێڕانە- نێودەوڵەتی- نارەسمی) (تیرۆری شۆڕشگێڕانەی نێودەوڵەتی- رەسمی) ( (تیرۆری دژ بە شۆڕش-ناوخۆیی- رەسمی) (تیرۆری دژ بە شۆڕش- نێودەوڵەتی- نارەسمی) (تیرۆری دژ بە شۆڕش-نێودەوڵەتی- رەسمی).

ڕەنگە ئەم لیستە، ئەوە روون بکاتەوە کە ئاسان نییە پێناسەیەك بۆ ئەم زاراوەیە دابنرێت کە چەندین لایەن لەسەر هەموو ئاستە حکومی و سیاسی و میدیاکانەوە بەکاری دەبەن، تەنانەت لەسەر ئاستی تاکە کەسی ئاسایشدا، تیرۆر

---

[٢٠] بۆ شارەزایی لەمەڕ هۆکارو پاڵنەرانی لەپشت تەشەنەکردن و هەڵکشاندنی کردەکانی تیرۆری نێودەوڵەتییدا، بڕوانە کتێبی(المقاومة الشعبية المسلحةفي قانون الدولي)د. صلاح الدين عامر، ١٩٧٧، ل٤٨٩-٤٩١.

[٢١] بڕوانە کتێبی (الارهاب الدولى ومشكلات التحرير والثورة في العالم الثالث)د. اسامة الغزالي، ١٩٨٦-ل١٧.

لە روانگەی توێژەری زانستی کۆمەڵایەتیدا، جیاوازیی هەیە لەگەڵ بۆچوونی شارەزا لەبواری سیاسەت، فەلسەفە، ئابووری یان زانستەکانی تاوان، کە بێگومان لەگەڵ بۆچوونی شارەزایانی یاسای نێودەوڵەتیشدا، جیاوازە[٢٢].

## رێبازی توێژینەوەکە:

لەسۆنگەی دەرککردنی ئاسان نەبوونی پێناسەکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی، هەوڵ دەدەین بەتوخمە پێکهێنەرەکانی تاوانی تیرۆر بگەین، وەکو رێبازێك بۆ بەکۆێلەکردن، نەك بۆ رووتکردنەوە، بەمەبەستی گەیشتن بە پێناسەیەکی دیاریکراوی بیرۆکەی تیرۆر، لەسۆنگەی یاسای نێودەوڵەتییەوەو لەم چوارچێوەیەدا، باس لەو تاوانانە دەکەین کە لەیاسای نێودەوڵەتیدا ناوزەدکراون، بەراقەکردن و تاوتوێکردن و رەگو ریشەکانی، دواتر ئەو کردەوانەی لێ دوور

---

[٢٢] هەندی لە مێژووناسان زاراوەی تیرۆر لە رووی مێژووییەوە دەگێڕنەوە بۆ شۆرشی فەرەنسی کە لەساڵی ١٧٨٩دا، بەسەرنگومکردنی لویسی شانزەیەم و لەناوبردنی سستمی دەرەبەگایەتی دەستی پێکردو. هەندێك پێیان وایە کە تیرۆر ماکێکی سیاسی بەخۆوە گرتووەو. تیرۆر Terror وشەیەکی ئینگلیزییەو بە رەچەڵەك دەگەرێتەوە بۆ زمانی لاتینی و، رەگوریشەی قوڵی هەیە لە رۆمانییەکاندا. دواتر گۆرانی بەسەردا هاتووەو تێکەڵ بەزمانەکانی تری ئەوروپا بووە، تیرۆریزم State Terrorism, Act of Terrorism, Terrorism کە ئێستا بەکار دەبرێن لە زمانی یاسایی نێودەوڵەتی و سیاسەتی نێودەوڵەتیداو، وەزارەتی(کارە تیرۆریستییەکان) و(تیرۆری نێودەوڵەتی) ئێستا لەکەناڵە ناوخۆیی و جیهانییەکاندا بەکار دەبرێن.

بۆ شارەزایی لە مێژووی تیرۆرو تیرۆری نێودەوڵەتیدا، بروانە کتێبی: (الارهاب الدولی وفقا لقواعد القانون الدولی العام)ی د. نبیل احمد حلمی، ١٩٨٨، ل٧و لاپەرەکانی دواترو، کتێبی (الارهاب السیاسی والقانون الجنائی)ی د. عبدالرحیم صدقی، ل٨١و دواتر، وکتێبی (الارهاب الدولی)ی د. عبدالعزیز مخیمرو بروانە ئەم سەرچاوە ئنگلیزییە:

*The Encyclopaedia Americana Vol-26, New York chicago, 1944, P.449; Encyclopaedia International, Focus, Vol.lv. Paris, 1958, P.3576; Wilken son paul position, Vol 8, No.3, Summer 1973, London, P.299.*

دەخەینەوە کەپێکی دەهێنن، لە چوارچێوەی پێناسە خوازراوەکەدا، تا بگەین بەبنەماکانی تاوانی تیرۆر کە یاسادانەری نێودەوڵەتی، لە لیستی تاوانە نێودەوڵەتییە بە یاسابووەکاندا، ئاماژەی پێ ناکاتو. پێمان وایە ئەم ڕێبازە، دەرفەت بۆ خوێنەرو توێژەر دەرەخسێنێت، تا شارەزایی لەسەر هەموو ئەو تاوانانە کە دژی سستمی گشتیی نێودەوڵەتی ئاراستە دەکرێنو لێکچوونو دواتر جیاوازییانو دەستەبەرکردنی دەرئەنجامەکان هەبێت، بە مەبەستی گەیشتن بەو جیاوازییە بنەڕەتییانە، لەنێوان ئەو تاوانانەو ئەم تاوانەی کە ئێستا پێی دەڵێین تاوانی تیرۆری نێودەوڵەتی.

## دابەشکردن

پشت بەست بە باسەکانی پێشوومان، توێژینەوەکەمان بەم شێوەیەی خوارەوە دەکەین بە (٧) بەشەوە:

**بەشی یەکەم:** ئەو تاوانانەی دژ بەسستمی گشتیی نێودەوڵەتی ئاراستە دەکرێن.

**بەشی دووەم:** بەڵگەنامە نێودەوڵەتییە پەیوەندیدارەکان، بەبنبڕکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی.

**بەشی سێیەم:** خەباتی چەکدارانەی پەیوەندیدار، بەمافی دیاریکردنی چارەنووسو تیرۆری نێودەوڵەتی.

**بەشی چوارەم:** هەوڵەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆ بنبڕکردنی دیاردەی تیرۆری نێودەوڵەتی.

**بەشی پێنجەم:** لایەنە یاساییەکانی تاوانی تیرۆری نێودەوڵەتی.

**بەشی شەشەم:** بەرپرسیی لەکارە تیرۆرییە نێودەوڵەتییەکان.

**بەشی حەوتەم:** هاوکاری نێودەوڵەتی بۆ بنەبڕکردنی تیرۆر.

## بەشی یەکەم:

تاوانە ئاراستەکراوەکانی دژ بە سستمی گشتیی نێودەوڵەتی. سەرەڕای ئەو بەرەوپێشچوونەی کە کۆمەڵەی گەلان، لەمیانەی پەیمانە بڕیار لەسەردراوەکانەوە بەدەستی هێنا، دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، بۆ پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانی، ئەم هەوڵانە بەهۆی کەش و هەوای تیرۆریستییەوە، لەئەنجامی دەرکەوتنی فاشیزمەوەو، دەسەڵاتە تۆتالیتارییەکانی ترەوە، لەبەر یەك هەڵوەشانەوە، سەرەڕای ئەو وێرانکاریی و کاولکارییانەی کە بەهۆی جەنگی دووەمی جیهانییەوە سنووری مرۆڤایەتی بەزاندو بەها مرۆییەکانی پێشێل کردو. لەئەنجامی کارەساتەکانی جەنگ و شوێنەوارە وێرانکارییەکانی، پارێزگاریکردن لەمافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانی بووە گرنگترین ئامانجەکانی ئاشتی وڵاتە زلهێزو سەرکەوتووەکانی ئەو جەنگەو، بوو بەیەکێك لەو تەوەرە بنەڕەتییانەی کە وڵاتان، بە مەبەستی دامەزراندنی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕەچاویان کرد.

لەکۆتایی ئەو جەنگەدا، وڵاتانی زلهێزی وەکو بەریتانیاو ئەمریکاو فەڕەنساو یەکێتی سۆڤیەتی سۆسیالیستی، هەستان بە پێکهێنانی دادگای نێودەوڵەتیی سەربازی، بۆ دادگایکردنی گەورە تاوانبارانی جەنگ، لەسەرکردەکانی ئەڵمانیاو ژاپۆن و، سستمی دادگا ئەرکی دادگایکردنی تاوانەکانی دژ بە ئاشتی و تاوانەکانی جەنگی لەئەستۆگرت، هەروەها تایبەت بوو بەدادگایکردنی تاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی کە لەبەرامبەر خەڵکی مەدەنیدا ئەنجامدرابوون، چ ئەنجامدانی پێچەوانەی یاساکانی ئەو دەوڵەتە بووبێت کە کارەکەی تێدا ئەنجامدرا بێت یان نا[٢٣].

---

[٢٣] بۆ یەکەم جار ئاماژە بۆ ئەو دادگایانە کرا لە ڕاگەیاندنێکی مۆسکۆدا بوو لە (١)ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٣دا دەڵێت:

*been responsibl for, or have taken a consenting part in the above atrocities,*

سستمی دادگا کە بڕیاریدا کە بەرپرسییەکە لەسەر شانی ئەنجامدەرانی کردەکەیە، جا ئەگەر بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی حکومەتەکانیان ئەنجامیان دابێت، یان گوێڕایەڵی کردن بووبێت، بۆ فەرمانی سەرکردە باڵاکانیان. سەرچاوەی بەرپرسیارێتی تاوانکارییەکە بریتییە، لە ئەنجامدانی ئەو تاوانە وەحشیگەرییەو، بەتاوانی دژ بەمرۆڤایەتی دادەنرێت[٢٤]. هەرچەندە دادگاکە لەساڵی ١٩٤٥-١٩٤٦ لەنۆرمبێرگدا کۆبووەوە، چەند پێوەرێکی بۆ تاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی جێبەجێ کرد کە ئەڵمانییەکان لەدژی هاووڵاتییان ئەنجامیان دابوو، بەتاوانباری جەنگیش دانران، بەڵام مامەڵە کردنی دەوڵەت لەگەڵ هاووڵاتییەکانیدا، بووە بابەتێك بۆ لێپرسینەوەی تاوانکاری، دادگاکە کۆبووەوە، بەوەی کە لیژنەیەکی نوێنەرایەتی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەکات، لەئەرکی بەرگریکردن لە مرۆڤایەتی، کە تووشی کارەسات و نەهامەتییەکانی جەنگ و شوێنەوارە وێرانکراوەکانی بووەوە[٢٥].

پێناسەی تیرۆری نێودەوڵەتی و کورتەی بنچینە یاساییە پێکهێنەرەکانی وادەخوازێت کە بەکورتی هەریەك لەتاوانە ئاراستەکراوەکانی دژی سستمی

---

*Massacres and executions , will be sent back to the countries hn which their a bominable deeds were donh in order that they may be gudged and punished a ccording to the law of these liberated cauntries and of these free government which will be created therein.. The abovedec laration is with out prejudice to the Case of the major criminals, whose offences have no particular geographical location and who will be punished by the goit decision of the fovernments of the*

*38 A.J.I.L.(1944),supple.,p.3.*

[٢٤] بۆ شارەزایی لەسەر بەرپرسیی نێودەوڵەتی تاوانکاریی ئەنجامدەرانی تاوانی دەستدرێژی بڕوانە:

*H.S Developme* *1979),*
*PP.137 Seq.*

[٢٥] سەبارەت بەدادگایکردنەکانی نۆرمبێرگ و تۆکیۆ بڕوانە:

*Rafaat, ibid, PP. 143 Seq.*

گشتیی نێودەوڵەتی بخەینەروو، تا بتوانین پێناسەیەك بۆ تیرۆر دابڕێژین کە دووربێت، لە تێکەل بوونی لەگەڵ تاوانە نێودەوڵەتییە جیاجیاکانی دیکە.

تاوانەکانی دژی سستمی گشتیی نێودەوڵەتی دەکرێت بەسێ بەشەوە:-

یەکەم: تاوانەکانی جەنگ.

دووەم: تاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی.

سێیەم: تاوانەکانی دژی ئاشتیو ئاسایشی مرۆڤایەتی.

# بەشی یەکەم
# تاوانەکانی جەنگ

تاوانەکانی جەنگ ئەو تاوانانەن کە لەدژی یاساکان و نەریتەکانی جەنگ ئەنجام دەدرێن، کە رەچەڵەکەکەی لە نەریتی نێودەوڵەتی و رێککەوتنامەکانی لاهای ساڵی ١٨٩٩، ١٩٠٧و لەچوار رێکەوتننامەکەی جنێڤدایە کە لەرۆژی ١٢ی ئابی ساڵی ١٩٤٩دا ئیمزا کراوە[٢٦]، ئەمەش چوار رێکەوتننامەکەیە[٢٧]:-

١. رێکەوتننامەی جنێف، سەبارەت بەچاککردنی باری بریندارو نەخۆش و خنکاوانی هێزە چەکدارەکان لە گۆڕەپانی جەنگدا.

٢. رێکەوتننامەی جنێف، سەبارەت بەباری برینداران و نەخۆش و خنکاوەکانی هێزە چەکدارەکان لە دەریاکاندا.

٣. رێکەوتننامەی جنێف، سەبارەت بە مامەڵەکردنی دیلەکانی جەنگ.

٤. رێکەوتننامەی جنێف، سەبارەت بەپاراستنی کەسانی مەدەنی، لەکاتی جەنگدا.

بۆ یەکەم جار ئەو چوار رێکەوتننامەیە، تاوانە مەترسیدارەکان (پێشێلکارییە گەورەکان)ی لەخۆگرت و ئەو دەوڵەتانەی رێکەوتننامەکانیشیان ئیمزا کردووە پابەند دەبن بە تاوانبارکردنی و بەڵێنیان داوە کە سزای گونجاو لەبواری یاسادانانیاندا بۆ ئەو مەسەلەیە دابنێن. ئەو تاوانە مەترسیدارانەی لەهەردوو مادەی ٥٠و٥٣ لە رێکەوتننامەی یەکەمداو هەردوو مادەی ٤٤و ٥١ لە رێکەوتننامەی دووەمداو مادەی ١٣٠ لەرێکەوتننامەی سێیەم و مادەی ١٤٧

---

[٢٦] بروانە د. حامد سلطان (الحرب في نطاق القانون الدولي)، المجلة المصرية للقانون الدولي، ١٩٦٩، ل١٨و بەدواوە.

[٢٧] لەمەڕ دەقەکانی رێکەوتننامەکانی جنێف، بڕوانە:

*The Geneva Conventions of August 12, 1946. International Committee of the Red Gross.(Geneva, 1983).*

لەرێکەوتننامــەی چــوارەم بڕیاریــان لەســەر دراوە[٢٨]. رێکەوتننامــەی جنێــف دەربارەی پاراستنی خەڵکی مەدەنی لەکاتی جەنگدا، رێگەی بە بەدەستەوەدانی

---

[٢٨] ئەو تاوانانە کە لە هەردوو مادەی ٥٠و٥٣ لەرێکەوتننامەی یەکەمو هەردوو مادەی ٤٤و٥١ لەرێکەوتننامەی دووەمو مادەی ٣٠ لە رێکەوتننامەی سێیەمو مادەی ١٤٧ لەرێکەوتننامەی چوارەمدا هاتووە، بەم جۆرە پۆلێن کراون:

١. کوشتنی بەئەنقەست.

٢. ئەشکەنجەدان.

٣. تاقیکردنەوە بایلۆژییەکان

٤. ئازارگەیاندنی گەورەو مەبەستدار

٥. ئەشکەنجەدانی پڕ مەترسی جەستەییو تەندروستی

٦. مامەڵەکردنی نامرۆڤانە

٧. وێرانکردنی سامانو بوون بەخاوەنی، بەشێوەیەك کە پێداویستییە سەربازییەکان پاساویان بۆی نەبێت کە بەپێوەرێکی نارەواو بێ بەزەییانە جێبەجێ دەکرێن.

٨. راپێچکردنی کەسێك بۆ خزمەتی سەربازی، لەهێزە چەکدارەکانی دەوڵەتی.

٩. بێبەشکردنی کەسێکی پارێزراو لەمافی خۆی، لەدادگایکردنی یاساییو بێلایەندا، بەو شێوەی کە رێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان دەیسەپێنن.

١٠. راگواستنو گواستنەوەی کەسان، بەشێوەیەکی نارەوا لە شوێنی خۆیاندا.

١١. گرتنی نارەوا.

١٢. بە بارمتەگرتن.

١٣. خراپ بەکارهێنانی ئاڵای خاچی سوور یان ئارمەکەیان یان ئاڵا هاوشێوەکانی دیکە.

لەپرۆتۆکۆڵی یەکەمدا لە هەردوو مادەی ١١و٨دا، ئەو کردانە پۆلێن کراون کە بەتاوانی مەترسیدار دەژمێردرێن، یان پێشێلکاریی گەورەیە کە دەخرێنە سەر (١٣) پێشێلکارییەکانی دیکە کە لەرێکەوتننامەکانی جنێفی ساڵی ١٩٤٩دا هاتوون، ئەگەر بەئەنقەستو بووە هۆی مردن یان ئازاردانی جەستەیی یان تەندروستی، کە ئەوانیش:-

١. ئەگەر کەسی مەدەنی کردە ئامانجی هێرشەکەی.

٢. هێرشی هەڕەمەکی کە تیایدا خەڵکی مەدەنیو دەزگا مەدەنییەکان رووبەڕووی مەترسی ببنەوە.

٣. هێرشکردنە سەر دامەزراوەو کۆمپانیا ئەندازیارییەکان کە وزەی مەترسیداری تێدا بێت.

٤. هێرشکردنە سەر ئەو شوێنو پێگەیانەی کە ئامرازی بەرگریکردنیان تیادا نییە، یان لەچەك داماڵراون.

ئەو کەسانەیدا کە ئەو کارانە ئەنجام دەدەن کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد، بۆ وڵاتێك یان بۆ ئەو وڵاتانەی ئیمزای ڕێکەوتننامەکەیان کردووە، بۆ دادگایکردن بەمەرجێ بەڵگەی تەواویان لەدژی ئەو کەسانە بەدەستەوە بێت. ئەگەر ئەو دەوڵەتانە ئەوەیان بەگونجاو زانی، بەپێی برگەکانی یاساو ڕێساکانی خۆیان.

لە (١٠)ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٧٧دا، بەئامادەبوونی نوێنەرانی ١٠٩ دەوڵەت، دوو پرۆتۆکۆڵی دیکە، بۆ ڕێکەوتننامەی جنێڤی ساڵی ١٩٤٩ زیاد کرا، کە تایبەت بوون بە پاراستنی هاووڵاتییان لەکاتی جەنگدا. بەمەبەستی گەشەکردن و پێشخستنی بنەماکانی یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی کە لەکاتی ململانێ چەکدارییەکاندا جێبەجێ دەکرێت[٢٩] پرۆتۆکۆڵی یەکەم(پاشکۆ) کە بۆ ڕێکەوتننامەی جنێڤ زیادکراوە (پاراستنی قوربانیانی ململانێ چەکدارییە

---

٥. هێرشکردن بەئامانجی کوشتنی کەسێك، دوای دڵنیابوون لەوەی ئەو کەسە توانای شەڕکردنی نییە.

٦. دەوڵەتی داگیرکەر هەستێت بەگواستنەوەی ژمارەیەك لەدانیشتوانەکەی، بۆ ئەو خاکەی داگیریکردوە، یان ڕاگواستن و گوێزانەوەی هەموویان بەشێك لەدانیشتوانی خاکە داگیرکراوەکە، لەنێو چوارچێوەی ئەو خاکەدا.

٧. هەموو جۆرە دواخستنی گێڕانەوەی دیلەکانی جەنگ یان هاووڵاتیان بۆ وڵاتەکانیان، بەبێ هیچ پاساوێك.

٨. پەیڕەویکردنی سیاسەتی جیاوازیی ڕەگەزی (ئەپارتاید)و هەموو ئەو سیاسەتانەی کە لەسەر بنەمای جیاوازیی ڕەگەزی و دژی مرۆڤایەتی و سووکایەتی بەشکۆمەندیی مرۆڤ دارێژراون.

٩. هێرشکردنە سەر شوێنەوارە دێرین و پیرۆزەکان و کارە هونەرییەکان، کە بەئاشکرا دەکرێ بناسرێنەوە کە خۆی لە کەلتورو کەلەپوری فەرهەنگی و ڕۆحی ئەو گەلەدا دەبینێتەوە، کە وێرانکاریی زۆربەی لێدەکەوێتەوە، لەکاتێکدا ئەو جێگایانە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ نزیك نەبن لەئامانجە سەربازییەکانەوە. بەمانەوە، تاوانە مەترسیدارەکانی لەتاوانی جەنگ، بوون بە (٢٢) تاوان (١٣) یان لەچوار ڕێکەوتننامەکەی جنێڤداو، نوێیان لەپرۆتۆکۆڵی یەکەمی پاشکۆی ئەو ڕێکەوتنامانەدا هاتوون.

بڕوانە: کتێبی (تاريخ القانون الدولي الانساني وطبيعته)، د. محمد عزيز شكري، ١٩٨٢، ل٢٦-٢٧.

[٢٩] بڕوانە: د. حامد سلطان، د. عائشة راتب، د. صلاح الدين عامر (القانون الدولي العام)، دار النهضة العربية، چاپی یەکەم، ١٩٧٨، ل٧٦٨و بەدواوە.

نێودەوڵەتییەکان)، کە لە ١٠٢ ماددەو دوو پاشکۆ پێك هاتووەو بەتواوکەری چوار ڕێکەوتننامەکەی جنێف دادەنرێت. پرۆتۆکۆڵی دووەمیش(پاشکۆ) "پاراستنی قوربانیانی ململانێ چەکدارییە نادەوڵەتییەکان دەگرێتەوە" لە ٢٨ مادە پێك هاتووەو بە تواوکەری دەقی ماددەی(٣) هاوبەشیی نێوان چوار ڕێکەوتننامەکەی جنێف دادەنرێت کە پەیوەندییان بە بڕگەکانی پاراستنی، تایبەت بە ململانێ نادەوڵەتیەکانەوە هەیە[٣٠].

پرۆتۆکۆڵی یەکەم لەدوو مادەی ١١و٨٥دا، پۆلێنێکی بۆ ئەو کارانە لەخۆگرتووە کە بە تاوانە مەترسیدارو پێشێلکارییە گەورەکان دەژمێردرێن و خراونەتە سەر ئەو (١٣) پێشێلکارییەی لەڕێکەوتننامەی جنێفی ساڵی ١٩٤٩دا هاتوون، کە بەئەنقەست ئەنجام بدرێت، ببێتە هۆی مردنی کەسەکە یان ئازاردانی زۆری جەستەو زیان بەتەندروستی بگەیەنێت[٣١] کە ئەمانەن:

١. کەسانی مەدەنی بکرێن ئامانج و هێرش بکرێتە سەریان[٣٢].

٢. هێرش بردنی هەڕەمەکی کە دانیشتوانی مەدەنی و شوێنە مەدەنییەکانی پێوەبێت.

٣. هێرشکردنە سەر شوێن و پێگەکانی ئەندازیاری، یان ئەو دامەزراوانەی هێزی ترسناك پێکدەهێنن.

٤. هێرشکردنە سەر ئەو شوێنانەی کە ئامرازی بەرگریکردن لەخۆیانیان نەبێت، یان ئەو ناوچانەی لەچەك دامالراون.

٥. هێرشکردنە سەر کەسێك کە بزانرێت توانای شەڕی نییە.

---

(٣٠) لەدەقی پرۆتۆکۆڵی جنێف، بڕوانە:-

*Protocols addetional to the Geneva Coventions of 12 August 1949, International Committee of the red Cross (Ceneva, 1977).*

(٣١) بڕوانە کتێبی ((تاريخ القانون الدولي الانساني وطبيعته)) سەرچاوەی ئاماژەپێکراوی پێشوو، ل٢٧-٢٨.

(٣٢) لە نموونە زەقەکانی ئەو تاوانە ڕووداوەکانی (سەبراو شاتێلا) کە لە ئەیلولی ساڵی ١٩٨٣دا ئەنجامدرا.

هەروەها هەندێ دەستدرێژیی گەورەی تریش خرایە سەریان، کە ئەگەر بەئەنقەست سەرپێچی لەرێکەوتننامەکان یان پرۆتۆکۆڵی یەکەم کرا، کە ئەمانەن:

٦. دەوڵەتی داگیرکەر هەندێ لەدانیشتوانی مەدەنی بۆ ئەو خاکە بگوێزرێتەوە کە داگیری کردووە، یان هەندێ یا هەموو دانیشتوانی خاکە داگیرکراوەکە رابگوێزێت، لەناو چوارچێوەی ئەو ئەڵەمرەوەدا[٣٣].

٧. هەر دواخستنێکی بێ هۆ، بۆ گێرانەوەی دیلەکانی جەنگ، یان مەدەنییەکان بۆ نیشتمانی خۆیان.

٨. بەکارهێنانی جیاوازیی رەگەزی (ئاپارتاید)و شێوازەکانی تر کە لەسەر بنەماکانی جیاوازیی رەگەزی دانرابن کە دژ بەمرۆڤایەتین و شکۆمەدەنی کەسایەتی پێشێل دەکەن.

٩. هێرشکردنە سەر شوێنەوارە مێژوویەکان و شوێنە ئایینی و کارە هونەرییەکان کە بەروونی دەکرێت بناسرێنەوەو کلتوورو فەرهەنگی گەلان پێکدەهێنن کە دەبێتە هۆی رووخاندن و وێرانکردنی ئەو شوێنانە، لەکاتێکدا ئەو شوێنەوارو شوێنە ئاینییانە، دووربن لەشوێنە سەربازییەکانەوە.

بەمەوە ژمارەی سەرپێچییەکان دەبێتە (٢٢) تاوانی ترسناکی تاوانەکانی جەنگ، (١٣) یان لەچوار رێکەوتننامەکانی جنێفداو، (٩) یان لەپرۆتۆکۆڵی یەکەمی ئەم رێکەوتنامانەدا هاتوون.

بەڵام پرۆتۆکۆڵی دووەم، گرنگی بەململانێ چەکدارییە نادەوڵەتییەکان دەدات و بەتایبەتی شەڕی ناوخۆو ململانێی نادەوڵەتی، بەگوێرەی ماددەی یەکەم لەم پرۆتۆکۆڵە، هەموو ململانێیەك دەگرێتەوە کە مەرجی ململانێی نێودەوڵەتی بەسەردا جێبەجێ ناکرێت کە لەمادەی یەکەمی پرۆتۆکۆڵی یەکەمدا هاتووە، کە قەڵەمرەوی یەکێك لەو لایەنانە بگرێتەوە کە پەیمانەکەی مۆرکردووەو، لەژێر سەرکردایەتییەکی بەرپرس، لەبەشێك لە قەڵەمرەوەکەی، بەجۆرێ دەسەڵات

---

[٣٣] ئەم تاوانە بەتایبەت خرایە سەر تاوانەکانیتر، بۆ بەرنگاربوونەوەی هەڵسوکەوتی دەسەڵاتی داگیرکاری ئیسرائیلی لەسەر زەمینی داگیرکراو، بەهۆی دەستدرێژیی حوزەیرانی ١٩٦٧.

پراکتیزە بکات کە بتوانێت کردەی سەربازی بەردەوامو بەچی ئەنجام بداتو، بتوانێت پرۆتۆکۆڵی دووەم جێبەجێ بکات، بۆیە کارە تاکە کەسییەکان بەتەواوی دوور دەخاتەوە، لە کەوتنە ژێر رکێفی ئەم پرۆتۆکۆڵەوە. بەپێی ئەم مادەیە پرۆتۆکۆڵی دووەم لەحاڵەتی بشێویی و ئاژاوەی ناوخۆی، وەکو گێرەشێوێنی و کاری توندڕەوی لاوەکی و هەرکارێکی تری لێکچوویاندا جێبەجێ ناکرێت.

# بەشی دووەم
# تاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی

تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی، ئەو کردانە لەخۆ دەگرێت کە لەسەر ئاکاری دوژمنانەی زەق، دژی کەسێك یان ئاراستەی کۆمەڵێك مرۆڤی دەست نیشان کراو دەکرێت[٣٤]، کە ئەوانیش لەپرەنسیبی شەشەم لەپرەنسیپەکانی نۆرمبێرگدا[٣٥] دیاری کراون کە بریتیین لە:

کوشتن، لەناوبردن و بەکۆیلەکردن و دوورخستنەوەو هەروەها هەموو کردەیەکی دیکەی نامرۆڤانە کە لەدژی دانیشتوانی مەدەنی کە لەپێش یان لەکاتی جەنگدا ئەنجام دەدرێت، دیسانەوە کردەی ستەمکاری کە لەسەر بنەمای سیاسی، رەگەزی یان ئایینی بێت، هەر کاتێك ئەو کردانە کە ئەنجام دەدرێن، لەچوارچێوەی تاوانەکانی دژی ئاشتی یان پەیوەندییەکی پێوە هەبێت، تەنانەت ئەگەر ئەو کارانەی ئەنجام دراون لەگەڵ یاسای ئەو وڵاتەدا، یەکنەگرێتەوە کە تیایدا ئەنجام دراوە کە تاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی و جینۆسایدو جیاوازیی رەگەزی، بەهەموو شێوەکانیەوەو جیاکاری رەگەزیش دەگرێتەوە.

لەچوارچێوەی بنبڕکردنی تاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی، کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان سێ رێکەوتننامەی داناوە، یەکەمیان بۆ قەڵاچۆکردنی تاوانی جینۆسایدو سزادان لەسەری ساڵی ١٩٤٨و دووەمیان ساڵی ١٩٦٥ بۆ کۆتایی هێنان بەجیاوازیی رەگەزی بەهەموو شێوەکانیەوەو، سێیەمیان ساڵی ١٩٧٣ بۆ

---

[٣٤] بروانە کتێبی ((الجريمة الدولية: دراسة تحليلية تطبيقية))، د. حسنين ابراهيم عبيد، دار النهضة العربية، ١٩٧٩، ل٢٠٣و بەدەواوە، د. محمد عبدالمنعم عبدالخالق (الجرائم الدولية: دراسة تأصيلية للجرائم ضد الانسانية والسلام وجرائم الحرب)، القاهرة، ١٩٨٩، ل٣٤١-٣٤٢.

[٣٥] لەدەقی پرەنسیپەکانی نۆرمبێرگ، بروانە *U.N.T.S., 22:279*

بنبڕکردنی تاوانی جیاکاریی ڕەگەزیو سزادان لەسەری بەکورتی باسی گرنگترین ناوەڕۆكو بڕگەکانی ئەو ڕێکەوتننامانە دەکەین:

**یەکەم: ڕێکەوتننامەی قەڵاچۆکردنی تاوانی جینۆسایدو سزادان لەسەری ساڵی ١٩٤٨.[٣٦]**

بیرۆکەی جینۆساید پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە، بەو پرەنسیپانەی کە لەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە جێبەجێکراون، ئەویش بەهۆی دادگای سەربازیی نێودەوڵەتییەوە کە لەنۆرمبێرگ بەسترا، بۆ دادگایکردنی گەورەی تاوانبارانی جەنگی ئەڵمان، دەربارەی ئەو تاوانانەی لەدژی ئاشتیو تاوانەکانی جەنگو تاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی ئەنجام دراون.

لەکۆنگرەی قەڵاچۆکردنی تاوانی جینۆسایدی ساڵی ١٩٤٨، لایەنە بەشداربووەکان ڕێکەوتنو جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە هەرکارێك جینۆسایدی لێبکەوێتەوە، جا لەکاتی ئاشتی یان جەنگدا بێت، ئەوا لەسۆنگەی یاسای نێودەوڵەتییەوە، بەتاوان دەژمێردرێن، سەرجەم ئەو لایەنانەی ئەو ڕێکەوتننامەیان مۆرکرد، بەڵێنیان دا ڕێوشوێنی گونجاو بگرنە بەر، بۆ قەدەغەکردنی ئەنجامدانی ئەو تاوانانەو سزادان لەسەری[٣٧].

تاوانی جینۆساید بەوە پێناسە دەکرێت کە هەرکردەیەك لەوکردانەی کە بەمەبەستی کۆتایی هێنان بە بەشێك یان تەواوی کۆمەڵە مرۆڤێك ئەنجام دەدرێت، بە لەبەرچاوگرتنی ئاکارە نیشتمانیو ڕەگەزیو ئاینییەکان.

کردەکانیش ئەمانەن[٣٨]:

١. کوشتنی ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە.

---

[٣٦] کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٩٤٨/١٢/٩دا بڕیاری لەسەر ئەو ڕێکەوتننامەیە داو لە ١٩٥١/١/١٢دا چووە بواری جێبەجێکردنەوە بڕوانە (الكتاب السنوي للأمم المتحدة عام (١٩٤٨) (محمد وفيق ابواتلة).

[٣٧] مادەی یەکەمی ڕێکەوتننامەکە.

[٣٨] مادەی دووەمی ڕێکەوتننامەکە

٢. دەستدرێژیی کردنە سەر ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە، لەڕووی جەستەیی و دەروونییەوە.

٣. ناچارکردن و ملکەچکردنی کۆمەڵێك بەئەنقەست، بۆ بارودۆخێکی گوزەرانی ئەوتۆ، بەمەبەستی کۆتایی هێنان پێیان، لە رووی مادییەوە(بەتەواوی یان بەشێك).

٤. گرتنەبەری ئەو رێوشوێنانەی کەدەبنە هۆی ناتەبایی، لەناو ئەو کۆمەڵەیەدا.

٥. گواستنەوەی منداڵان، بەشێوەیەکی زۆرەملێ، لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی دیکە.

هەروەها رێکەوتننامەکە بڕیاری سزادانی تاوانی جینۆسایدی داو سزادانەکە پەلیکێشا بۆ رێکەوتن یان دەست پێکردن یان بەشداریکردن لەتاوانی جینۆسایدو، رێکەوتننامەکە ئەم کردانەی دیکەشی تاوانبار کرد[٣٩].

١. جینۆساید.

٢. پیلان گێڕان بۆ ئەنجامدانی تاوانی جینۆساید.

٣. هاندانی راستەوخۆو ئاشکرا، بۆ ئەنجامدانی جینۆساید.

٤. دەستپێکردن بەئەنجامدانی تاوانی جینۆساید.

٥. بەشداریکردن لە تاوانی جینۆسایددا.

لە گرنگترین ئەوانەی کە رێکەوتننامەکە بڕیاری لەسەر داوە، سزادانی هەموو ئەوانەی ئەو تاوانە ئەنجام دەدەن، یان هەر کردەیەك لەو کردانەی بڕیاری لەسەر دراوە، جا ئەگەر تاوانبار لەدەسەڵاتداران بێت یان کارمەندێکی لێپرسراوبێت لە دەوڵەتدا، یان هەرکەسێك بێت[٤٠]. بەمەش مەسەلەی تاوان تەنها نەبووە مایەی

---

[٣٩] مادەی سێیەمی رێکەوتننامەکە

[٤٠] ماددەی چوارەمی رێکەوتننامەکە.

[٤١] میسر لە رۆژی (٣١)ی کانونی یەکەمی ١٩٥٠دا ئەو رێکەوتننامەیەی مۆرکرد.

[٤٢] ماددەی شەشەمی رێکەوتننامەکە.

[٤٣] ماددەی هەشتەمی رێکەوتننامەکە.

گرنگی پێدان‌و خستنە نێو پسپۆریی یاسادانانی نیشتمانییەوە، بەڵکو شێوازێکی نێودەوڵەتی وەرگرت.

ئەگەر هەر حکومەتێك لە حکومەتەکان، لەقەڵەمڕەوەکەی خۆیدا، دژی هاوڵاتییەکانی خۆی ئەنجامی‌دا، ئەوا ئەو کارە تەنها کێشەیەکی ناوخۆی نییەو لەژێر دەستی دەسەڵاتدارانی دەوڵەت‌و یاسادانانی نیشتمانیدا نابێت، بەڵکو کارێکی نێودەوڵەتییەو، دەچێتە بواری یاسای نێودەوڵەتییەوەو پاراستنی نێودەوڵەتی دەیگرێتەوە[٤١].

ڕێکەوتننامەکە پێشنیازی ئەوە دەکات، ئەو کەسانەی تاوانی جینۆسایدو هەر تاوانێك کە پەیوەندیی بەوەوە هەبێت ئەنجام دەدەن، ڕەوانەی دادگای تایبەتمەندی ئەو دەوڵەتە بکرێت، کە لە قەڵەمڕەوەکەیدا ئەنجامدەدرێت، یان ڕەوانەی دادگای نێودەوڵەتی تاوانکاریی تایبەت بەو بوارە بکرێت، دەربارەی ئەو لایەنە بەشدارانەی کە ئەم جۆرە پسپۆرییە پەسەند دەکەن‌و[٤٢]پارێزگاریی نێودەوڵەتی بۆ دابینکردنی جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی ڕێکەوتننامەکە لەوەدایە کە لەلایەنەکان پەنا بۆ دام‌و دەزگاکانی نەتەوەیەکگرتووەکان ببەن، تا ڕێوشوێنی گونجاو ڕەچاو بکرێت، بەپێی بڕگەکانی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆ پارێزگاریی لەو کردەوانەی کە ڕێکەوتننامەکە قەدەغەیان دەکات، یان سزادان لەسەریان[٤٣].

دووەم: ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی ساڵی ١٩٦٥، بۆ کۆتایی هێنان بە هەموو جۆرەکانی جیاوازیی ڕەگەزی[٤٤].

---

[٤٤] کۆمەڵەی گشتی بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیەو بەگوێرەی بڕیاری ژمارە ٢١٠٦ی کانونی یەکەمی١٩٦٥دا، خستییە خانەی جێبەجێکردنەوە، لە (٤)ی کانونی دووەمی ١٩٦٩دا، لەدەقی ڕێکەوتننامەکە، بڕوانە:

ڕێکەوتننامەکە بەم جۆرە، جیاوازیی ڕەگەزی پێناسە دەکات: جیاوازی ڕەگەزی بریتییە لە هەموو جیاوازیکردن، کاری نائاسایی، گۆڕین یان بە باشتر زانین، لەسەر بنەمای ڕەگەز، ڕەنگ، ڕەچەڵەکی نەتەوەیی یان ڕەگەزی، بەئامانجی دواخستن و لەمپەر دانان، بۆ داننان بەمافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان، یان چێژ وەرگرتن لێیان و پیادەکردنی لەسەر ئاستی یەکسانیخوازی، لەبواری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری، یان هەر بوارێکی دیکە، لەبوارەکانی گشتیی ژیاندا[٤٥].

ئەم ڕێکەوتننامەیە جیاوازە لە هەردوو ڕێکەوتننامەکانی تری پێش خۆی کە لەسالانی ١٩٥٨و ١٩٦٠دا مۆرکران، کە مەودایەکی زیاتری بەخشییە چوارچێوەی جیاوازیکردن، لەرووی ڕەگەزو ئاین و بیروبۆچوونی سیاسییەوەو لایەنی گرنگی ئەم ڕێکەوتننامەیە، ئەوەیە کە گشتگیرترە لەهەردوو ڕێکەوتننامەکەی پێش خۆی و، خۆی بەهیچ بوارێکی دیاریکراوەوە نەبەستۆتەوە، وەکو بەکارهێنان و فێرکردن، بەڵام ئەو جیاوازییانە قەدەغە دەکات کە پەیوەندیی بەمافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانەوە هەیە، لەسەرجەم بوارە گشتییەکانی ژیان، لەرووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەوە[٤٦].

---

الكتاب السنوى للامم المتحده عام ١٩٦٥، گۆڤارێکی مانگانەی نەتەوەیەکگرتووەکانە ژمارەی کانوونی یەکەمی ١٩٦٥ محمد وفيق ابواتلە، موسوعه حقوق الانسان) لەسەرچاوەی پێشوو ئاماژەی پێکرا، ، ل٣٥٤و بەدواوە.

هەروەها بڕوانە:

*Resolution 210 ‹A(XX) of the General Assembly, 21 December, 1965. GAOR, (XX) supple. No. 14(A/6014), pp.47-51.*

[٤٥] مادەی یەکەم لە ڕێکەوتننامەکە.

[٤٦] ئەو دوو ڕێکەوتننامەیەش: یەکەمیان ڕێکەوتننامەی تایبەت بەقەدەغەکردنی جیاوازیکردن لە گۆڕەپانی بەکارهێنان و پیشەدا، کە لەکۆنگرەی گشتیی ڕێکخراوی کاری نێودەوڵەتی، لە ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٥٨دا بڕیاری لەسەر دراوە. دووەمیان ڕێکەوتننامەی تایبەت بەقەدەغەکردنی جیاوازیکردن لەخوێندندا، کە لەکۆنگرەی گشتیی یونسکۆی ساڵی ١٩٦٠دا بڕیاری لەسەر دراوە. بڕوانە د. احمد محمد رفعت، "مقدمة لدراسة القانون الدولي لحقوق الانسان"، دار النهضة العربية، ١٩٨٥،ل٦٥-٦٧.

دەقـەکانی ئـەم رێکەوتتنامەیـە درێژخایـەنن، بـە گوێـرەی ئـەوە دەوڵـەتانی هاوبەش نیگـەرانی خۆیـان، بەرامبـەر بە جیاوازیی رەگـەزی راگـەیاند، بـەڵێنیاندا بەهـەموو شێوازێکی گونجاو، بەبێ دواخسـتن و دەسـبەجێ، رێوشـوێنی کۆتـایی هێنان بە جیاوازیی رەگـەزی بهێنن، بەهـەموو شێوەکانیەوەو هـەوڵی چـاککردن و پتـەوکردنی لـە یەککەیشـتن بـدەن، لـەنێوان هـەموو رەگـەزەکاندا. لـە پێنـاو چەسپاندنی ئـەو کارەشدا، دەوڵـەتانی لایـەنگر بڕیاریاندا، پەنا بۆ هیچ کـارێکی ئـەوتۆ نەبـەن، یـان ئـەنجامی هـەر جـۆرە جیاوازییـەکی رەگـەزی، دژی کەسـان و گروپ و دامەزراوە گشتییەکان نەدەن، و پابەندبوونی سەرجەم دەسەڵاتە گشتی و دامـەزراوە گشـتییەکان و نەتـەوەیی و ناوخۆییـەکان دابین بکـەن. هـەروەك چـۆن بەڵێنیان دا کە چاودێریی گرتنەبەری رێوشوێنی کاریگەرو گونجاو بکەن، بۆ چاو خشـاندنەوە بە سیاسـەتی حکومەتـە نەتـەوەیی و ناوخۆییـەکاندا، راسـتکردنەوەو رەتکردنـەوەو پووچەڵکردنـەوەی هـەر یاسـایەك یـان سسـتمێك کـە هـەوڵی دروستکردن و سەرهەڵدانی جیاوازیی رەگـەزی، یان بـەردەوامبوونی دەدات لەهـەر شوێنێکدا کە هەبێت[٤٧]. هەروەها دەوڵەتانی لایەنگر یان ئـەندام نیگـەرانن، لەمـەڕ جیاکاری و جیاوازیی رەگـەزی و بـەڵێن دەدەن بەقەدەغـەکردن و نەهێشتنی هـەموو کارێکی لەوجۆرە لە قەڵەمڕەوەکانیاندا[٤٨].

رێککەوتنامەکـە بڵاوکردنـەوەی هـەموو بـیروبۆچوونێك کـە لەسـەر برەودانـی رەگەزپەرستی، یـان سـەپاندنی رەگەزپەرسـتی و هـەموو هـاندانێك بـۆ جیـاوازیی رەگەزیی و، هەموو کارێك لە کارەکانی توندوتیژی، یان هاندان بۆ ئـەو کارانە کە لـەدژی کۆمـەڵێکی رەگـەزی، یان کۆمـەڵێك لەهـەر رەنـگ و رەچەڵـەکێك و، هـەروەها یارمەتیدانی چالاکییە رەگەزپەستیەکان، تەنانەت لەڕووی کۆمەکیشەوە بە تاوانی دادەنێـت و یاسـا سـزای لەسـەر دەدات. هـەروەها ئـەو دەوڵەتانـە نایاسـایی ئـەو رێکخراوانەو چالاکییە پروپاگەندەییەکانی ئەو رێکخراوو هەموو پروپاگەندەیەکی دیکەشیان راگەیاند، کە هەڵدەسن بە پتـەوکردنی جیاوازیی رەگـەزی، یان هـاندان

---

[٤٧] مادەی دووەم لەرێکەوتننامەکە.

[٤٨] ماددەی سێیەم لە رێکەوتننامەکە.

بۆی، ئەو ڕێکخراوو چالاکییانەی قەدەغەکردەوەو هەر بەشداریکردنێکیش لەگەڵ هەریەك لەوانە بەتاوان دادەنرێت و یاسا سزای لەسەر داناوە، لەگەڵ ڕێگەنەدان بەدەسەڵات و دامەزراوە گشتی و نەتەوەیی و ناوخۆییەکان بە پەرەپێدانی جیاوازیی ڕەگەزی و هاندان بۆی[٤٩].

جێی ئاماژە بۆ کردنە، هەندێ جار ئەو دەقانە، کێشەو ئاڵۆزیی دەستووری بۆ هەندێ دەوڵەت دروست دەکەن، بەهۆی سنووردارکردنی هەندێ لە مافەکانی وەکو ئازادیی ڕادەبڕین و ئازادیی کۆبوونەوەکە دەستووری ئەم وڵاتانە دایانناوە.

بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیە، لیژنەیەك دروستکرا کە بە(لیژنەی کۆتایی هێنان بە جیاوازیی ڕەگەزی) ناسسراوە، لە ١٨ شارەزا پێکهاتووە، دەوڵەتانی لایەن، لەنێو هاووڵاتیانی خۆیاندا، هەڵیان دەبژێرن و ئەندامێتییان وەکو کەس، نەك وەکو نوێنەری دەوڵەتەکانیان. پسپۆریی ئەو لیژنەیە، هاوشێوەی تایبەتمەندیی لیژنەی مافی مرۆڤە کە بەپێی ڕێکەوتننامەی نێو دەوڵەتی مافە مەدەنی و سیاسییەکان پێکهاتووە[٥٠]،تەنها بە چوونە نێو ئەو ڕێکەوتننامەیەوە، هەریەك لە دەوڵەتانی ئەندام یان لایەنی ڕێکەوتننامەکە، بۆی هەیە سەرنجی لیژنەکە ڕابکێشێت، بۆ هە پێشێلکارییەك کە لەهەر دەوڵەتێك لەو دەوڵەتانەدا ببینرێت کە ڕێکەوتننامەکەیان ئیمزا کردوە[٥١].

هەروەها ڕێکەوتننامەکە(لیژنەی ڕێکخستن)ی تایبەتی دەست نیشان کرد دەسەڵاتی لێکچووی دەسەڵاتی ئەو لیژنەیە دەبێت کە بەپێی ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکەی مافە مەدەنی و سیاسییەکان، ڕێگەبە پێکهێنانی دراوە[٥٢]. هە ململانێیەك لەنێوان دوو دەوڵەت یان زیاتر، یان لە نێوان دوو لایەن، یان ئەندام ڕێکەوتننامەکەدا سەری هەڵدا سەبارەت بەراقەکردن، یان جێبەجێکردن ڕێکەوتننامەکە، چارەسەرکردنی ئەو ململانێیە، لە ڕێگەی ئەو وتووێژو ئە

---

[٤٩] ماددەی چوارەم لە ڕێکەوتننامەکە.

[٥٠] ماددەکانی ٨-١٠ی ڕێکەوتننامەکە.

[٥١] ماددەی ١١ی ڕێکەوتننامەکە.

[٥٢] ماددەی ١٢ی ڕێکەوتنامەکە.

ڕێوشوێنانەوە دەبێت کە ڕێکەوتننامەکە دیاریکردوە، ڕێکەوتننامەکە بڕیاری داوە بە ڕەوانەکردنی ئەو ململانێیە، لەسەر خواستی لایەنێك لە لایەنەکان، بۆ دادگای دادوەریی نێودەوڵەتی، ئەگەر لایەنە ململانێکارەکان، لەسەر هیچ ڕێگە چارەیەك ڕێك نەکەوتن[٥٣].

هەروەها هەریەکێك لە دەوڵەتانی ئەندامی ڕێکەوتننامەکە دەتوانێت کە لە هەر کاتێکدا بێت، ڕەزامەندیی خۆی ڕابگەیەنێت، لەسەر تایبەتمەندیو پسپۆڕیی لیژنەکە، لە چاوخشاندنەوە بەو نامەو ئەو ڕاگەیاندنانەی کە لەلایەن تاكو کۆمەڵە ناوخۆییەکانی ئەو قەڵەمڕەوانەدا پێشکەشکراون وتیایدا ئەوە ڕادەگەیەنن کە هەر پێشێلکارییەك لەلایەنیەوە، بۆ هەر مافێکی دیاریکراو لەو ڕێکەوتنامەیەدا، بەو مەرجانەی ڕێکەوتننامەکە دیاریکردووە[٥٤].

لەدەقێکی تایبەتو کۆتاییدا، کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بەپێی ئەم ڕێکەوتننامەیە، داوای لە لیژنەیەکی تایبەتی کرد کە ئەرکی جێبەجێکردنی جاڕنامەی بەخشینی سەربەخۆیی بە وڵاتانو گەلانی داگیرکراو لەئەستۆ بگرێت[٥٥]. هەموو دامودەزگاکانی سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکان کە ڕێگەیان پێدراوە داواکارییەکانی گەلانی وڵاتانی داگیرکراو وەربگرنو تاوتوێیان بکەن، بۆیان هەیە کۆپیەك لەو داواکارییانە ڕەوانەی لیژنەی نەهێشتنی جیاوازیی ڕەگەزی بکەن، لە کاتی دیاریکراویان لەسەر داوای خۆی، تاوەکو لیژنەی ناوبراو تێبینیو ئامۆژگارییەکانی خۆی لەسەر دەرببڕێت، بەمەرجێ ئەو لیژنانە لە

---

[٥٣] ماددەی ٢٢ی ڕێکەوتننامەکە.

[٥٤] ماددەی (١٤) لەڕێکەوتننامەکە.

[٥٥] بڕوانە: د. احمد محمد رفعت "الامم المتحدة- دراسة قانونية تحليلية للجانب العضوي والوظيفي و التطبيقي للمنظمة العللمية" دار العربية، ١٩٨٥، ص٣٦١- ٣٦٢.

راپۆرتی ساڵانەیاندا بۆ کۆمەڵەی گشتی، کورتەیەك لەو رێوشوێنانە هاوپێچی بکەن کە گرتویەتیە بەر بۆ جێبەجێکردنی ئەم بڕیارە[٥٦].

سێیەم: رێکەوتننامەی نێودەوڵەتی ساڵی ١٩٧٣، بۆ بنبڕکردنی تاوانی جیاکاریی رەگەزیو سزادان لەسەری[٥٧]:

کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان پشتگیریی ئەو رێکەوتننامەیەی کرد لە بڕیاری ٣٠٦٩ ٣٣(د-٢٨) لە تشرینی دووەمی ١٩٧٣[٥٨]. دەوڵەتانی ئەندامی رێکەوتننامەکە راگەیاند: کە جیاکاریی رەگەزی بەتاوانی دژی مرۆڤایەتی دادەنرێت، ئەو کاروکردانەی کە لە -سیاسەتو ئەنجامدانی رەگەزپەرستییەوە سەرهەڵبدات، یان هەر کارێکی هاوشێوەی ئەوان لەڕەگەزپەرستی، بەو تاوانانە دادەنرێت، پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی پێشێل دەکات، واتە پرەنسیپەکانی بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان، هەروەها بەهەڕەشەیەکی خەتەرناك لەدژی ئاشتیو ئاسایشی نێودەوڵەتی دادەنرێت[٥٩].

لەرێکەوتننامەکەدا تاوانی جیاکاریی رەگەزی، هەموو سیاسەتێكو کردەیەکی گۆشەگیرکردنو جیاوازیکردنی رەگەزی دەگرێتەوە، وەکو ئەوەی کە لە ئەفریقای باشوور ئەنجام دەدرێت، لەسەر ئەو کردە نامرۆڤانانەیەی کە بە مەبەستی جێگیرکردنو بەردەوامبوونی زاڵ بوونی کۆمەڵێکی رەگەزیی مرۆڤ، بەسەر کۆمەڵێکی رەگەزیی دیکەو ستەملێکردنی بەشێوەیەکی دیارو ئاشکرا ئەنجام دەدرێت ئەو کارانەش وەکو[٦٠]:

---

[٥٦] گرنگترین رێکەوتننامەی نێودەوڵەتی کە لەمەڕ قەلاچۆکردنی تاوانەکانی جیاوازیی رەگەزیی بەستراون، بڕوانە: د. نبیل احمد حلمی "الارهاب الدولی وفقاً للقواعد القانون الدولی" دار النهظة العربیة، ١٩٨٨، ص٨٦-٩٠

[٥٧] سەبارەت بەدەقی رێکەوتننامەکە، بڕوانە:

*A/ RES/ 30 68 (XXVLLL).*

[٥٨] رێکەوتننامەکە لە ١٨ی/٧/١٩٧٦وە، بەپێی بڕگەکانی ماددەی(١٥) کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە.

[٥٩] ماددەی(١)ی رێکەوتننامەکە.

[٦٠] ماددەی (٢)ی رێکەوتننامەکە.

١-بێبەشکردنی ئەندامێك لە ئەندامانی کۆمەڵەیەك یان کۆمەڵە رەگەزییەکان، لەمافەکانی ژیان و ئازادیی تاکەکەسی.
أ-گرتنی ئەندامانی کۆمەڵەیەك یان کۆمەڵە رەگەزییەکان.
ب- زیان گەیاندنی ترسناك بەجەستەو عەقڵی ئەندامانی کۆمەڵەیەکی رەگەزی، یان بە دەستدرێژکردنە سەر ئازادیو کەرامەتیان، یان ئەشکەنجەدان و مامەڵەکردنی خراپ لەگەڵیانداو سزادانی توندو نامرۆڤانە یان هەر کارێکی ئابڕوو بەرانە.
ج-بەزۆرداری گرتن و بەندکردنی ئەندامانی کۆمەڵەیەك و زیندانی کردنیان بەشێوەیەکی نایاسایی.
٢-دروستکردنی بەئەنقەستی بارودۆخێکی بژێوی، بە مەبەستی نابوتکردنیان لەرووی جەستەوە.
٣-گرتنەبەری رێوشوێنی یاسایی و نایاسایی، بەمەبەستی قەدەغەکردنی تاقمێك یان چەند تاقمێکی رەگەزپەرست، بۆ بەشداریکردنیان لەژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگی وڵاتەکە. لەپێناو گەشەنەکردنی تەواوی ئەو کۆمەڵەیە، بەتایبەتی بێبەشکردنی ئەندامانی کۆمەڵەیەك یان کۆمەڵە رەگەزییەکان لە ئازادییەکان و مافی بنەڕەتیەکان، هەروەها بە مافی کارکردنیشەوە، مافی پێکهێنانی سەندیکای بڕواپێکراو، مافی خوێندن و، بەجێهێشتنی وڵات و گەڕانەوە بۆی و، مافی پێدانی رەگەزنامەو مافی ئازادیی هاتووچۆکردن و [illegible]بوون و، مافی ئازادیی رادەربڕین و گوزارشت کردن و، مافی ئازا[illegible] کۆبوونەوەو پێکهێنانی کۆمەڵە بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە.
٤-گرتنەبەری هەر رێوشوێنێك، بەرێوشوێنی یاساییشەوە، بەمەبەستی دابەشکردنی دانیشتوان، بەپێی پێوەری رەگەزی بەدروستکردنی جیاکردنەوەو دابڕانی ئەندامانی تاقمێك یان چەند تاقمێکی رەگەزپەرستەوەو قەدەغەکردنی ژنهێنان لە نێوان ئەو کەسانەی کەسەر بەو تاقمە رەگەزپەرستانەن و لێسەندنەوەی مافی موڵکایەتی و خانوبەرە بۆ توێژێك چەندێك توێژی رەگەزپەرست، یان چەند کەسێکیان.

٥-قۆستنەوەی کاری ئەندامانی توێژێك یان چەند توێژێکی رەگەزپەرست، بەتایبەتی سەپاندنی کاری زۆرەملێ بەسەریاندا.

٦-چەوساندنەوەی رێکخراوو کەسەکان، بەبێ بەرپێکردنیان لەمافەکانیان و ئازادییە بنەڕەتییەکان، بەهۆی بەرهەڵستییان لەبەرامبەر جیاکاریی رەگەزیدا.

جێی ئاماژە بۆکردنە، دەوڵەتانی ئەندام لەو رێکەوتننامەیەدا، تاوانبارکردنی ئەو رێکخراوو دامەزراوەو کەسانەیان راگەیاندووە، کە تاوانی جیاکاری رەگەزی[٦١] ئەنجام دەدەن و بەرپرسیاریێتی تاوانی نێودەوڵەتییان دەخەنە ئەستۆ، بەهەر پاساوو پاڵنەرێکەوە ئەنجام درابێت، جا ئەگەر لە قەڵەمڕەوی ئەو وڵاتە دابن کە تاوانەی تیا ئەنجام دراوە، یان لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتێکی تردابن:

أ-ئەگەر هەستان بەئەنجامدانی هەر کردەیەك کەلەسەر بنەمای ماددەی دووەمی ئەم رێکەوتننامەیە داڕێژراوە، یان بە بەشداریکردن تیایدا، یان لە هاندانی راستەوخۆ، یان بەشێوەی نهێنی پیلانیان بۆ دانابێت.

ب-ئەگەر بەشێوەی راستەوخۆ هەستان بە هاندان، بۆ ئەنجامدانی تاوانی جیاکاریی رەگەزی، یان یارمەتی و پشتگیریکردن بۆ ئەنجامدانی وڵاتانی ئەندامی رێکەوتننامەکە، بەڵێنییان داوە کە رێوشوێنی یاسایی و نایاسایی پێویست بگرنەبەر، بۆ دەمکوتکردن و کپ کردنی هەر هاندانێك، بۆ ئەنجامدانی تاوانی جیاکاریی رەگەزی و سیاسەتی گۆشەگیرکردن و هاوشێوەکانی، سزادانی ئەو کەسانەی هەڵدەستن بە ئەنجامدانی تاوانەکە[٦٢]، هەروەك چۆن بەڵێنییان داوە بە گرتنەبەری رێوشوێنی یاسایی و دادگایی و ئیداری، تا بەپێی دەسەڵاتی قەزایی خۆیان، هەستن بەراونان و شوێن کەوتن و دادگایکردن و سزادانی ئەو کەسانەی کە بەرپرسن بەرامبەر بە ئەنجامدانی ئەو کارانە کە بەگوێرەی رێکەوتننامەکە، تاوانی جیاکاریی رەگەزیی لێپێکهاتووە. یان تاوانبارن بە ئەنجامدانیان، ئەگەر ئەوانە هاووڵاتیی ئەو دەوڵەتەبن، یان هاووڵاتیی دەوڵەتێکی دیکەبن، یان

---

[٦١] ماددەی ١/٢ی رێکەوتننامەکە.

[٦٢] ماددەی ٤/أی رێکەوتننامەکە.

ڕەگەزنامەیەکی دیاریکراویان نەبێت[٦٣]، دەتوانرێت تاوانباران دادگاییکرێن بە ئەنجامدانی ئەو کردانەی، لە مادەی دووەمی ڕێکەوتنامەکەدا هاتووەو، لەبەردەم دادگایەکی پسپۆڕ یان تایبەتی، هەر دەوڵەتێکی ئەندامی ڕێکەوتنامەکە، کە ڕەنگە دەسەڵاتیان بەسەر ئەو تاوانبارانەدا هەبێت، یان لەلایەن دادگایەکی نێودەوڵەتیی تاوانە کە دەسەلاتی دادگایی هەبێت، بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو دەوڵەتە ئەندامانەدا کە دەسەڵاتی ئەو دادگایە یان پەسەند کردووە[٦٤].

لە ماددەی هەشتەمی ڕێکەوتنامەکەدا، ڕێگە بەهەر یەکێك لەو دەوڵەتانە دەدرێت کە داوا لە هەر لیژنەیەکی تایبەت و پسپۆڕ لەو لیژنانەی نەتەوەیەکگرتووەکانبکات، بەپێی بڕگەکانی ئەو بەڵگەنامەیە، ڕێوشوێنی گونجاو بگرنەبەر، بۆقەدەغەکردنی تاوانی جیاکاریی ڕەگەزی و بنبڕکردنی، دەسەڵاتی هەندێ کاریشی پێ سپاردون، لەوانەش ئامادەکردنی لیستێك بەناوی ئەو کەس و ڕێکخراوو دامەزراوەو نوێنەرانی دەوڵەتانەوە کە بەرپرسیارن، بەرامبەر ئەنجامدانی ئەو کارانە کە تاوانی جیاوازیی ڕەگەزی لێدەکەوێتەوە، بەپێی ماددەی دووەمی ئەو ڕێکەوتنامەیە[٦٥].

بەمەبەستی تەسلیمکردنی تاوانباران، ڕێکەوتنامەکە وای داناوە کە ئەو کارانەی لە ماددەی دووەمدا باسکران و تاوانی جیاکاریی ڕەگەزی لێپێکدێت، بە تاوانی سیاسی دادەنرێت[٦٦] و ئەو دەوڵەتانەی ڕێکەوتنامەکەیان مۆرکردووە، بەڵێنیان داوە بە بەدەستەوەدانی ئەو تاوانبارانە، لەو حاڵەتانەی کە باسکران، بەپێی یاساکانیان و پەیماننامە کارپێکراوەکان[٦٧].

---

[٦٣] ماددەی ٤-ب ی ڕێکەوتننامەکە

[٦٤] ماددەی (٥)ی ڕێکەوتننامەکە.

[٦٥] ماددەی ١٠ی ڕێکەوتننامەکە.

[٦٦] ماددەی ١/١١ ی ڕێکەوتننامەکە.

[٦٧] ماددەی ٢/١١ی ڕێکەوتننامەکە.

# بابەتی سێیەم
# تاوانەکانی دژی ئاشتیو ئاسایشی مرۆڤایەتی

کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان داوای لە لیژنەی یاسای نێودەوڵەتی کرد کە پرۆژەیەك ئامادە بکات، بۆ ئەو تاوانانەی زیان بە ئاشتیو ئاسایشی مرۆڤایەتی دەگەیەنێت. و لیژنەکە یەکەم پرۆژەی لەساڵی ١٩٥١دا و، دووەمیشیان لە ساڵی ١٩٥٤دا پێشکەشکرد[٦٨].

هیچ کام لەو دوو پرۆژەیە بڕیاریان لەسەرنەدرا بەوەی تەواوی کێشەکە پەیوەندیی بە کێشەی پێناسەی دەستدرێژییەوە هەیە کە هێشتا کۆمەڵەی گشتی نەگەیشتۆتەتە رێکەوتنێکی کۆتایی بۆ ئەو مەسەلەیە. و هەر بۆیە چاو خشاندنەوە بەو پرۆژەیەدا دواخرا، تا کاتی گەیشتن بە پێناسەیەك بۆ دەستدرێژیی و پەلاماردان.

ئەو کارانەی کە پرۆژە تۆمارکراوەکە لەخۆی گرتووە بریتین لە: پەلاماردانو بەکارهێنانی هێز بەشێوەی ناڕەواو، هەڕەشەکردن بەهۆی بەکارهێنانی هێزەوە، دەست تێوەردان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتان، یان بەکارهێنانی ئامرازی نایاسایی و، تاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی ئەنجام دەدرێت.

ئەوەی جێی سەرنجە، لە پرۆژە تۆمارکراوەکەدا، داننانە بە پرەنسیپی بەرپرسێتی تاوانکارییانەی تاك. ئەو تاکانەی بە جۆری هەڵسوکەوت دەکەن کە داردەستی دەوڵەتن، دەبێ بە ملکەچی ئەرکی دەوڵەتییان دابنێین، بەپێی بڕگەکانی یاسای نێودەوڵەتی، هەروەها پرۆژەکە باسی مەسەلەی بەشداریکردنو سازشکردن لە ئەنجامدانی ئەو تاوانانەو بایەخیشی پێدراوە. ئەگەر یەکێك لەو

---

"[٦٨] لیژنەی یاسای نێودەوڵەتی لە ٢٨ی تەمووزی ١٩٥٤ ئەم پرۆژەیەی دارشت، بەناونیشانی،
Draft
*IX Supple, 9(A/ 2693) pp. 11- 12.*

ولآتانە چەند کەسێکی بەکارهێنا بۆ ئەنجامدانی تاوانی نێودەوڵەتی، وەکو ئەوەی بەکرێ گیراو بەکاربیات بۆ داگیرکردنی خاکی ولآتێکی تر، لەو حاڵەتەدا بەرپرسێتی دەوڵەت بەشێوەیەکی گشتی لەمەڕ تاوانی دەستدرێژی بڕیاری لەسەر دەدرێت، بەوەی کە ئەو بەکرێ گیراوانە بە بەرپرس دابنرێن، لەبەرامبەر تاوانێکی سەربەخۆدا کە هەمان بنەمای یاسایی تاوانەکەی نەبێت کە دەسەلآتدارانی ئەو ولآتە ئەنجامی بدەن کە بە کرێیان گرتوون

پرۆژە تۆمارکراوەکە ئەو کردانەی کە تاوانی دژی ئاشتی و ئاسایشی مرۆڤایەتی لێپێك دێت دەردەخات، لەنێو ئەو تاوانانەشدا[٦٩]:

١. ڕێکخستنی گرووپی چەکدار لەلایەن دەسەلآتدارانی دەوڵەتەوە، بۆ هێرشکردنەسەر هەرێمێکی تر، یان ڕێگەدان بە ڕکخستن و هاندان بۆی، هەروەها بۆ ڕێگەدانی دەسەلآتدارانی دەوڵەت بە گروپە چەکدارەکان، بە بەکارهێنانی خاکەکەیان وەکو بنکەیەك بۆ ئەو پرۆسەیە، یان وەکو خاڵی مۆڵگەیەك بۆ هێرشکردنە سەر ولآتێکی ترو، هەروەها بۆ هاوبەشی راستەخۆیان یارمەتیدانی مادی بۆ هێرشکردن.

٢. ئەنجامدانی چالاکیی ڕێکخراوی تیرۆریستانە لە ولآتێکی تردا، لەلایەن دەسەلآتدارانی دەوڵەتەوە یان هاندان بۆی، یان ڕێگەدان بەدەسەلآتدارانی دەوڵەت بە چالاکی ڕێکخستن بە مەبەستی جێبەجێکردنی کردە تیرۆرییەکان لە دەوڵەتێکی تردا.

---

[٦٩] ماددەی دووەم لە پرۆژەی بەیاسایکردنی تاوانەکانی دژی ئاشتی و ئاسایشی مرۆڤایەتی.

ئەوەی جێی ئاماژە بۆ کردنە، پرەنسیپی شەشەم لە پرەنسیپەکانی تۆرمبێرگ، هەندێ لە تاوانەکانی دژی ئاشتی و ئاسایش لەخۆ دەگرێت، لەنێو چوارچێوەی لیستی ئەو تاوانە دژ بە مرۆڤایەتییە، ئەو تاوانەش بریتین لە:١-گرتنەبەری هەر ڕێوشوێن و ئامادەکاری و دەستدانە جەنگی دەستدرێژکاییانە یان بۆ جەنگێك کە دژی بڕگەکانی پەیماننامەوبەڵگەنامەکان و ڕێکەوتننامەنێودەوڵەتییەکان ئەنجام دەدرێت.
٢- هەموو هاوبەشیکردنێك لەپلانی گشتی یان پیلان گێڕان بۆ ئەنجامدانی یەکێك لەو کردانەی پێشتر.

٣. ئەنجامدانی کاری پێچەوانەی پەیماننامەکان، لەلایەن دەسەڵاتدارانی دەوڵەتەوە کە ئەو پەیماننامانە لەسەر بنەمای زامن کردنی ئاشتیو ئاسایشی نێودەوڵەتی دامەزراوە

تاوانەکانی دژی ئاشتیو ئاسایش، تاوانی جەنگی دوژمنکارانەو چەتەگەریو بەسیج کردنی بەکرێ گیراوان دەگرێتەوە، کە هەر یەکەیان بەکورتی باس دەکەین:

## یەکەم- تاوانی جەنگی دوژمنکارانە

جەنگی دوژمنکارانە یەکێکە لە ترسناکترین تاوانە ئاراستەکراوەکانی دژی ئاشتی، بەپێی چەمکی کۆن، یاسای گشتیی نێودەوڵەتی باس لە تاوانی جەنگی دوژمنکارانە دەکات بە دیاریکردنو گێڕانەوەی بۆ رەچەڵەکەکەیو کۆمەڵێك بنەمای ئەو کردانەی تاوانبار کردووە، بەڵکو ئەو بنەمایانە لە رێکخستن بۆ جەنگەوە گۆڕا بۆ ئامرازێك بۆ بەدیهێنانی سیاسەتە نیشتیمانییەکان، پاشان دوورتریش گوێزرایەوە، بۆ قەدەغکردنی بەکارهێنانی هێز، یان هەڕەشەکردنی بەکارهێنانی لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا. و هەوڵو کۆششی زۆر دراوە لە ماوەی شەست ساڵی پێشوودا، بۆ پێناسەکردنی دەستدرێژی بە بنەما پێکهێنەرەکانیەوەو، ئامرازەکانیو رێگەکانی قەدەغەکردنو بنبڕکردنیو، لە چوارچێوەی ئەو کۆششانەوە، جیاوازی بیرو بۆچوونو لە نێوان دەوڵەتاندا، سەبارەت بەو مەسەلەیە سەری هەڵدا، بەڵام گەلێ لەو لایەنە گرنگانەی روون کردەوە کە بیرۆکەی پێناسەی دەستدرێژیکردن لەخۆدەگرێت[٧٠].

---

[٧٠] لە کۆششەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ پێناسەی دەستدرێژی. بڕوانە: (العدوان المسلح في القانون الدولي)، د. ويصا صالح، قاهرة، ١٩٧٥، ل٧٣٣و دواتر هەروەها بڕوانە: (توصل الامم المتحدة الى تعريف العدوان) ، د. حسين عبدالخاق حسونه، ١٩٧٦، ل٥١ دواترو، بڕوانە: (تعريف العدوان)، د. سمعات بطرس فرج الله، ١٩٦٨، ل٢٠٥دواترو، بڕوانە(المظمات الدولية)، د. محمد حافظ غانم، ل١٠٣/ ١١٣. و(بعض الجوانب القانونية للنزاع العربي الاسرائيلي)، د. عائيشە راتب، ١٩٦٩، ل٥٧/ ٥٨. و کتێبی(الجرائم الدولية) د. محمد عبدالمنعم عبدالخاق، و کتێبی (الامن الجماعي الدولي)، د. نشأت عثمان

وێـڕای شکسـتی کۆمەڵـەی گـەلان لـە دانـانی پێناسـەیەکی دیـاریکراو بـۆ دوژمنکـاری، بـەڵام کۆمەڵـەی گشـتیی نەتەوەیـەکگرتووەکان لـە سـاڵی ١٩٥٠وە دەستی دایە لێکۆڵینەوەی پێکهاتـەکانی دوژمنکاریو چەند بڕیارێکی لەوبارەوە دەرکردو چەند لایەنێکی بابەتـەکی روون کردەوەو چەند هـەنگاوێکی بۆ گەیشتن بەپێناسەی دوژمنکاری گرتەبەر کە زۆرینەی دەوڵەتان پەسەندی بکەن. کۆمەڵە بابەتەکـەی رەوانـەی لیژنـەی یاسـایی نێودەوڵـەتی کـردو داوای لـە سـکرتێری گشتیی و رێکخراوەکە کرد، راپۆرتێکی تێرۆ تەسەل لەو بارەیەوە ئامادە بکات، پاشـان چەندین لیژنـەی پێکهێنا، بـۆ تـاوتوێکردنی بابەتەکـە لـە سـاڵانی ١٩٥٣و ١٩٥٦و ١٩٥٩و ١٩٦٨ تا ساڵی ١٩٧٤ بڕیژەی کێشا. لەساڵی ١٩٧٤دا، کۆمەڵەی گشتی گەیشتە پێناسـەیەك بـۆ دوژمنکـاری[٧١] بـەوەی: کـە بـەکارهێنانی هـێزی چەکداری لەلایـەن دەوڵەتێکەوە، دژی سـەروەری و یەکپارچەیی خـاکی ئیقلیمـی، یان سـەربەخۆیی سیاسـی دەوڵـەتێکی تر، یـان بەهـەر رێگەیـەك بێـت کـە لەگـەڵ بەڵگەنامـەی نەتەوەیـەگرتووەکاندا یـەك نەگرێتـەوە[٧٢]. هـەروەکو ئاشـکرایە ئـەو پێناسەیەی کۆمەڵەی گشتی دایڕشتووە، تاڕادەیەکی زۆر لە دەقی ماددەی ٢/٤ی بەڵگەنامـەی نەتەوەیـەکگرتووەکان دەچێت، هەرچـەندە کـە ئـەوەش مانـای وایـە، بنـەماکانی تـاوانی دوژمنکارانـە تەنها لـە حاڵـەتی بەکارهێنانی هـێزی چـەکداری، لەلایەن دەوڵەتێکەوە دژی دەوڵەتێکی تر تەواو دەبێت، لەبەر ئەوە هەڕەشەکاریی و پێڕاگرتنی راگەیاندنی جەنگ ناکاتە پلەی پەلاماردان لەلایەکی ترەوە رەنگە سوود لەو پێناسەیە وەربگیرێت کە سەرجەم فشارو دەستتێوەردانی سیاسی و

---

الهلالي، ١٩٨٥، ل٦٦/ ٧٣. و کتێبی (الامن القومي و الامن الجماعي)، د. ممحدوح شوقی کامل، ١٩٨٥ ل١٩٦و دواتر.

[٧١] / بڕواە بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان ژمارە ٣٣١٤، خولی ٢٩ی ١٤ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٤. *UN GAOR, 20 the Session, supple.*
*(A/ 9619 and Cart.l)*

[٧٢] ماددەی یەکەم لە پێناسەی دەستدرێژیو پەلاماردان.

ئابوری و فەرهەنگی و مەزهەبی کە هێزی چەکدارییان تیادا بەکارنایەت، ناگاتە پلەی پەلاماردان و دەستدرێژی[٧٣].

ماددەی یەکەم پاشکۆیەکی بۆ دانراوەو، دەڵێت: مانای(دەوڵەت) کە لەم مادەیەداو لە پێناسەکەدا هاتووە، بەشێوەیەکی گشتی ئەم خاڵانە دەگرێتەوە.

١-دەوڵەت دانی پێدانرابێت یا دانی پێدانەنرابێت، مادامێك بنەماکانی پێکهێنانی بە پێی یاسای نێودەوڵەتی کامڵ و پوختە بوون. هەروەها ئەم زاراوەیە هەموو ئەو دەوڵەتانەی ئەندام لە نەتەوەیەکگرتووەکان و دەوڵەتانی نا ئەندامیش دەگرێتەوە. واتە لە هەمان کاتدا، ئەم پێناسەیە بە شێوەیەکی گشتی رێکخراوو کۆمەڵە سیاسییەکان ناگرێتەوە کە بەمانای یاسایی دەوڵەت پێکناهێنن.

٢-زاراوەی دەوڵەت، دەوڵەتێك یان کۆمەڵی دەوڵەت دەگرێتەوە لەو حاڵەتانەدا کە پەلاماردان و دەستدرێژی بە هاوکاریی بێت، یان زیاتر لە دەوڵەتێك بەشداری تێدا بکات. دواتر پێناسەکە نموونە دێنێتەوە، لەسەر هەندێ لەو کارانەی بە پەلاماردان و دەستدرێژی دادەنرێت لەوانە[٧٤]:

١-داگیرکردنی یان پەلاماردانی خاکی دەوڵەتێکی تر، لەلایەن هێزی چەکداری دەوڵەتێکەوە، یان هەر داگیرکردنێکی سەربازی- ئەگەر کاتیش بێت- بەهۆی ئەم داگیرکردن یان هێرشکردنەوە، یان هەر پێوەلکاندنێکی خاکی وڵاتێکی تر، یان بە شێك لە خاکەکەی، لە رێگەی بەکارهێنانی هێزەوە.

٢-تۆپبارانکردنێکی خاکی وڵاتێکی تر، لەلایەن هێزی چەکداری وڵاتێکەوە، یان بەکارهێنانی هەر جۆرە چەکێك دژی خاکی وڵاتێکی تر.

---

[٧٣] بۆ روونبوونەوەی بیرۆکەی پەلاماردانی نێودەوڵەتی گەشەکردن و پێناسەکەی، بڕوانە:

*Conept: Its Development and Ddfinition in Intern*
*1979), pp. 267 seq: Blix, H*
*Day Hammars Kjold Found ation. (Uppsala- Sweden, 1970), pp. 26- 28.*

[٧٤] ماددەی سێهەم لە پێناسەی دەستدرێژی.

٣-گەمارۆدانی بەندەر یان کەنارەکانی دەوڵەتێك لەرێگەی بەکارهێنانی هێزەوە.
٤-هێرشکردنە سەرهێزی زەمینی، دەریایی یان کەشتی جەنگیو ئاسمانی وڵاتێکی تر. لەلایەن هێزی چەکداری وڵاتێکەوە.
٥-بەکارهێنانی هێزی چەکداریی وڵاتێك کە بەپێی رێکەوتن لەگەڵ وڵاتی خانە خۆیدا لە خاکەکەیدایە، بەشێوەیەك مەرجەکانی رێکەوتننامەی نێوان دوو دەوڵەتەکە پێشێل بکات یان هەر درێژکردنەوەیەکی مانەوەی ئەو هێزانە لەسەر خاکی خانە خۆیدا، دوای کۆتایی ئەو رێکەوتننامەیە.
٦-رێگەدانی دەوڵەتێك بە بەکارهێنانی ئەو خاکەی دەوڵەتێکی تر خستویەتیە ژێر دەستییەوە، بۆ ئەنجامدانی کاری پەلاماردانو دەستدرێژی، لە دژی دەوڵەتی سێیەم
٧-ناردنی گروپی چەکدار یان هێزو سەرباز یان بەکرێ گیراوان بۆ ئەنجامدانی کاری چەکدارانە دژی دەوڵەتێکی دیکە، کە مەترسی لەوە کەمتر نەبێ کە ئاماژەمان پێکرد، یان بەشداریکردنی فیعلی ئەو دەوڵەتانە لەو کارانەدا.

لەو پێناسەیەی کە پێشتر باسی لێوەکرا، ئەو کارانەی لەخۆی گرتوون وەکو کاری دوژمنکارانە دەژمێردرێن، دەتوانین بڕیاری ئەوە بدەین کە ئەوەی ئێستا پێی دەوترێت تیرۆری دەوڵەت، لە برگەی حەوتەمی ماددەی سێیەمی پێناسەکەدا هەیە کە ناتوانرێت دەوڵەت بە تیرۆریست دابنرێت، بەلام دەتوانرێت بە دەوڵەتێکی دەستدرێژیکەر دابنرێت. تاوانی پەلاماردانو دەستدرێژی ترسناکترە لە تاوانی تیرۆر، چونکە بەشی حەوتەمی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان تەرخان کراوە، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بارەکانی پەلاماردانو دەستدرێژیدا، تەنها لەکاتی بەرپابوونیدا، ئەنجومەنی ئاسایش دەتوانێت رێوشوێنی سەربازیو ناسەربازی، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بۆ بنبرکردنی پەلاماردانو دەستدرێژیو گێڕانەوەی ئاشتی بۆ بنەڕەتەکەی دەگرێتەبەر[٧٥].

---

[٧٥] بڕوانە کتێبی(المنظمات الدولیة)، د. مفید شهاب، دار النهضة العربیة، ١٩٨٥، ل٣٨٥- ٣٨٨.

## دووەم: چەتەگەریی دەریاییو ئاسمانی

پرەنسیپی گشتی تایبەت بە ئازادیی کەشتیوانی لە دەریاکاندا، بۆ هەموو وڵاتان ئەوەیە کە هێمنیو ئاسایش هەبێت لە دەریا گەورەکاندا. و پاراستنی ئاسایش پێویستی بەدەسەڵاتێك هەیە، ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگرێتو جڵەوی پێشێلکاران بگرێتو دادگاییان بکاتو سزا بەسەر ئەوانەدا بسەپێنێت کە تاوانیان بەسەردا ساغ دەبێتەوە. و لەبەرئەوەی دەریا گەورەکان ناکەونە ژێر دەسەڵاتی هیچ دەوڵەتێکەوە، بۆیە رێوو رەسمی نێودەوڵەتی وایە کە هەر وڵاتێك لەلایەن خۆیەوە پارێزگاریی لە ئاسایشیان بکات، لەرێگەی پێدانی دەسەڵاتەوە، بۆ کۆنترۆڵکردنی تاوانبارانو دادگایکردنیانو سزادانیان[٧٦]

زاراوەی چەتەگەری، هەموو کارێکی تاوانباری دەگرێتەوە کە کاریگەری، لەسەر ئەوانی تر هەبێت بەجۆرێ کە پرەنسیپی ئازادیی کەشتیوانی بخاتە مەترسییەوە، سەرەڕای ئەوەی کە جیاوازیی لە پێناسەکردنی چەتەگەریی دەریاییدا هەیە، بەڵام کۆ دەنگییەك هەیە لە یاسای نێودەوڵەتیدا، لەسەر ئەوەی کە هەر کارێك ئەم توخمانەی خوارەوەی تێدا بێت بە"چەتەگەری" دادەنرێت[٧٧]:

١. تاوانکاری بێت

٢. بەکارهێنانی توندوتیژی تێدا بێت، دژی کەسەکان یان دژی سامانەکانیان.

٣. بەمەبەستی بەدەست هێنانی داهاتێکی کەسی، یان بەمەبەستی تایبەتی ئەنجام بدرێت.

٤. ئەگەر لەدەریا گەورەکاندا ئەنجام بدرێت.

رێکەوتننامەی جێف بۆ دەریا گەورەکان، پێناسەیەکی دیاریکراوی بۆ چەتەگەریی تێدانییە، بەڵکو ئاماژە بە چەند کردەیەك دەکات کە بەپێی

---

[٧٦] بروانە د. حامد سلطان، د. عائیشة راتب، د. صلاح الدین عامر(القانون الدولي العالم)، ١٩٧٨، ل٥٩١.

[٧٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩٢.

ناوەڕۆکەکانیان، بەتاوانی چەتەگەریی دەریایی دادەنرێن. مادەی(١٥) لەرێکەوتننامەکە ئەم کارانەی خوارەوە بەکاری چەتەگەریی دادەنێت:

١-هەر کارێکی نایاسایی لە رێگەی توندو تیژی، بە بارمتەگرتن، یان زەوتکردن کە بۆ ئامانجی تایبەت ئەنجام بدرێن[٧٨] و ستافی کەشتییەکی تایبەت یان سەرنشینەکانی ئەنجامی بدەن، یان ستافی فرۆکەیەکی تایبەتی یان سەرنشینانی پێی هەستن بەرامبەر بە:(أ) دژی کەشتییەك یان فڕۆکەیەکی تر لە دەریا گەورەکاندا، یان دژی کەسەکان و سامانەکانیان لە هەمان کەشتیی، یان هەمان فڕۆکەدا، (ب) دژی کەشتی، یان فرۆکە، یان کەسەکان، یان سامانەکانیان بێت کە لە دەرەوەی دەسەلاتی ولاتاندا بێت.

٢-هەر کارێك کە بە هاوبەشییەکی ئارەزوومەندانە دابنرێت، لە بەڕێوەبەردنی کەشتی یان فڕۆکەکەدا، لە کاتێکدا کەشتییەکە، یان فڕۆکەکە خۆی کاری چەتەگەری ئەنجام بدات.

٣-هەر کارێکی هاندان، یان ئاسانکاریی بە ئەنقەست، بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانەی لە خاڵی یەکەم و دووەمدا هاتوون.

هەروەها ماددەی ١٦و١٧ لە رێکەوتننامەی جنێف، بۆ دەریا گەورەکان(قووڵەکان) دوو خاڵەتی تریان خستەسەر:

١- کاری چەتەگەری- ئەو کارانەی لە ماددەی ١٥دا هاتوون- کە لەرێگەی کەشتی جەنگییەوە، یان کەشتی حکومی، یان فڕۆکەی حکومییەوە ئەنجام دەدرێن کە ستافەکانیان یاخی دەبن و دەسەلات دەگرن بەسەریدا، لەم حاڵەتەدا ئەم کارانە وا حیسابیان بۆ دەکرێت کە لە کەشتییەکی تایبەتەوە دەرچووبن.

---

[٧٨] مەبەست لە ئامانجی تایبەت، ئەوەیە چەند کارێك نەگرێتەوە کە بە مەبەستی هێنانەدی سوودێکی تایبەت ئەنجام نادرێن، سەرەڕای ئەوەی تاوانکارین وەکو ئەو کارانەی بە مەبەستی سیاسی دەکرێن. هەموو رووداوی دەست بەسەراگرتنی کەشتی(کونجی) لە ساڵی ١٩٢٣و کەشتی(سانتاماریا) لە ساڵی ١٩٦١، بە کاری چەتەگەریی دەریایی دانەنرێت، چونکە بۆ مەبەستی هێنانەدی ئامانجی سیاسی کران.

بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩٤، جیرهاردمان جلان(القانون بین الامم)، ١٩٧٠، ل٦٧.

٢- کەشتی یان فرۆکە، بە کەشتیو فرۆکەی چەتەگەریی دادەنرێن، ئەگەر ئەو کەسانەی دەستیان بەسەریدا گرتووە بیانەوێت، بە کاری بهێنن بۆ ئەنجامدانی یەکێك لەو کارانەی لە ماددەی(١٥)دا هاتوون. و هەمان شت پەیڕەوی دەکرێت، ئەگەر کەشتی یان فرۆکەکە بەکاربرا بۆ ئەنجامدانی هەر یەکێك لەو کارانە مادامێك لەژێر کۆنترۆڵی ئەو کەسە تاوانبارانەدا بمێنێتەوە.

سەبارەت بە بنبڕکردنی چەتەگەری، ماددەی ١٤ی ڕێکەوتننامەکە، داوای پابەند بوونی"هەموو ولاتان دەکات، بۆ ئەوەی هاوکاری تەواو بکەن، بۆ نەهێشتنی چەتەگەری لە دەریا قووڵەکان، یان هەر شوێنێکی تر کە لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی دەسەلاتی هەر ولاتێکدا بێت"، هەروەها لە ماددەی ١٩دا هاتووە"لە دەریا قووڵەکاندا، یان لە هەر شوێنێکی تردا کە بەدەر لە دەسەلاتی دادگایی هەر ولاتێکدا بێت هەر دەوڵەتێك بۆی هەیە دەست بگرێت بەسەر کەشتی، یان فڕۆکەی چەتەگەری، یان هەر کەشتیو فڕۆکەیەك کە لەرێگەی چەتەگەرییەوە دەست بەسەریدا گیراوەو کەسەکان دەستگیر بکاتو هەرچی شتومەکی ناو کەشتی، یان فڕۆکەکەیە دەستی بەسەردا بگرنو، دادگاکانی ئەو دەوڵەتەی کە کارەکە ئەنجام دەدات، بۆی هەیە سزاکان دیاری بکاتو بۆی هەیە هەر بڕیارێك بدات، یەبارەت بە کەشتیەکە یان فڕۆکەکە یان کەلوپەلەکان، لەگەڵ ڕەچاوکردنی مافی لایەنی سێهەم کە بەنییەتی پاکەوە ڕەفتاریان کردبێت[٧٩].

---

[٧٩] تێبینی دەکرێت کە دەستگیرکردن، یان زەوتکردن بەهۆی چەتەگەرییەوە، نابێ دەوڵەت پێی هەستێت، تەنیا لەرێگەی کەشتییە جەنگییەکانیەوە یان فڕۆکە سەربازییەکانیەوە نەبێت، یان لەرێگەی کەشتیو فڕۆکەی حکومی تر کە دەوڵەت ئەو ئەرکەی بۆ دیاری دەکات. (ماددەی ١٩و ٢٠لە ڕێکەوتننامەکە). هەروەها لە ماددەی(٢٠)ی ڕێکەوتننامەکەدا هاتووە کە ئەگەر هۆکاری تەواو لەبەر دەستدا نەبێت بۆ کاری گرتنو زەوتکردن، بەهۆی ئەو کارانەی کە بە کاری چەتەگەری دادەنرێن، ئەوا ئەو دەوڵەتەی کە کەشتییە گشتییەکانی هەستان بەو کارانە، لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو دەوڵەتەی کە کەشتی یان فڕۆکە تاوانبارەکە هی ئەو بێت، دەبێ قەرەبووی ئەو زیانو قوربانیانە بکاتەوە کە کردەی دەستگیرکردنو زەوتکردن بوونە هۆی ڕوودانیان.

لەبەر رۆشنایی بابەتی سەرەوە، دەکرێ بەو ئاکامە بگەین کە بەڵێنی دەوڵەتان، بۆ هاوکاریی تەواو بۆ نەهێشتنی چەتەگەری، پابەندبوونێکە لە هەندێ حاڵەتدا یەکسانە بەئەرکی دەستگیرکردنی چەتەکان، و لەگەڵ ئەوەشدا، رەنگە دادگا نێودەوڵەتییەکان- لەرووی زانستییەوە- دوو دڵ بن لەبەرپرسکردنی دەوڵەتێك لە ئەنجامدانی ئەو تاوانەدا، چونکە ئەو بڕیارە تەمومژاوییەی لە ماددەی ١٤دا هاتووە، وا لەو دەوڵەتە دەکات کە بتوانێت پاساوی پەسەند بهێنێتەوە کە چەتەکانی دەستگیرنەکردبێت ئەگەرچی ئەو مادانەی تایبەتن بە چەتە گەرییەوە لە رێکەوتننامەی جنێف بۆ دەریا قووڵەکان بە راشکاوی ئەوە ناگەیەنێت کە چەتەگەری،

تاوانێکی نێودوڵەتی بێت، بەلاّم ئاشکرایە کە هەردوو ماددەی ١٤و ١٩ لەرێکەوتننامەکە، چەتەگەرییان بەکارێکی قەدەغەکراو، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی دانا. و بڕگەکانی یاسای نێودەوڵەتی کە چەتەگەری قەدەغە دەکەن، رەفتاری کەسانی رەشۆكو ئاسایی رێکدەخەنو، پابەندیان دەکەن، بۆ ئەوەی دەست نەدەنە کاری چەتەگەری. لەگەڵ ئەوەشدا یاسای نێودەوڵەتی بڕیاری لەسەر بەرپرسێتی تاوانی نێودەوڵەتی بۆ تاکەکان نەداوە، سەبارەت بە ئەنجامدانی کاری چەتەگەری، بۆیە ناکرێت دادگایی بکرێن لەبەردەم دادگا نێودەوڵەتییەکاندا، بەڵکو لەبەردەم دادگا ناوخۆییەکانی تاوان، لەو دەوڵەتەی کە هەڵدەستێت بەدەستگیرکردنی چەتەکان، دەوڵەتان لە حاڵەتی چەتەگەریدا، دەسەلاّتی دادگای نا ئاسایی دەبێت، لەناو دەریادا، سەبارەت بەو کەسانەی هاوولاّتیی خۆی نین.

## سێیەم: بەسیج کردنی بەکرێ گیراوان

بەکرێ گیراوانو بەکارهێنانیانو کۆمەك کردنیانو راهێنانیان لەو کارە مەترسیدارانەن کە زیان بەیەك پارچەیی خاكو سەربەخۆیی سیاسی گەلێ لەو دەوڵەتانە دەگەیەنێت کە تازە سەربەخۆییان بەدەست هێناوە، جگە لەوەی هەڕەشەیە بۆ سەر ئاشتیو ئاسایشی نێودەوڵەتی ئەو ولاّتانە، بەلەبەر چاوگرتنی

بڵاوبوونەوەی ئەو دیاردەیە لە کیشوەری ئەفریقا، دژی بزووتنەوە ئازادیخوازە نیشتیمانییەکان، بە ئامانجی لەباربردنی خەباتی ڕەوایان، دژی دەسەڵاتی داگیرکەرو داگیرکردنی بیانی، لە پێناوی بەدەست هێنانی سەربەخۆیی و دیاریکردنی چارەنووسدا- نەیجیریا پێشنیازی دانانی بەندی خشتەی کاری کۆمەڵەی گشتی، سەبارەت بە داڕشتنی ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی بۆ قەدەغەکردنی بەکرێ گیراوو بەکارهێنانیان و کۆمەك کردنیان و ڕاهێنانیانی کرد.

لیژنەی شەشەم دەستی کرد بە تاوتوێکردنی ئەو بابەتەو گەیشتە هێڵە گشتییەکانی ئەو ڕێکەوتننامەیەو بڕگەسیاسییە پەیوەندیدارەکانی بە بەرەنگاربوونەوەی بەسیج کردنی بەکرێ گرتەو بەکارهێنانیان. لە ساڵی ١٩٨٩دا لیژنەی شەشەم لەسەر داواکاری لیژنەی پسپۆڕو تایبەتمەند بۆ داڕشتنی ڕێکەوتننامەکە، بڕیاری پێکهێنانی تیمێکی کارکردنی دا کە ئەرکی ڕێکخستنی مەسەلەکان و بابەتە هەڵپەسێردراوەکانی پەیوەست بەو مەسەلەیەوە لە ئەستۆ بگرێ.

بەرهەمی کۆبوونەوەکانی ئەو تیمە کارگێڕە بۆ، گەیشتن بوو بە ڕێکەوتنێکی گشتی، لەسەر داڕشتنی دەقی ڕێکەوتننامەکە، کە یەکخستنی بیروبۆچوونی لەنێوان سەرجەم کۆمەڵەکاندا دەستەبەرکرد، پاشان پرۆژەی ڕێکەوتننامەکە ڕەوانەی لیژنەی شەشەم کرا، بەمەبەستی بڕیاردان لەسەری وەك سەرەتایەك بۆ ڕەوانەکردنی بۆ کۆمەڵەی گشتی بەشێوەیەکی کۆتایی[٨٠].

لە دانیشتنی ڕۆژی ٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٨٩دا، لیژنەکە پشتگیری پرۆژەی ڕێکەوتننامەکەی کرد بەبێ دەنگدان[٨١]. لە دانیتنی حەفتاو دووەمی

---

[٨٠] لە ڕاپۆرتێکی لیژنەکەدا تەرخان کرابوو، بۆ مەسەلەی داڕشتنی ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی، بە بەرەنگاربوونەوەی بەکرێ گرتەو بەکارهێنانیان و کۆمەك کردنیان و ڕاهێنانیان(ڕاپۆرتی تیمی کارگێڕ) بەپێی بەندی ١٤٤ لە خشتەی کاری کۆمەڵەی گشتی لە خولی ٤٤دا بڕوانە:

*A/ C. 6/44/ L. g , B November 1989.*

[٨١] لە دەقی ڕێکەوتننامەکە بڕوانە :

*A/ C. 6 /44/ L. 10. 15 November 1989*

کۆمەڵەی گشتیدا، لە رۆژی ٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٩دا، بە تەواوی پشت بە پرۆژەی رێکەوتننامە نێودەوڵەتیەکە بەسترا، بۆ بەرەنگابوونەوەی بەکرێ گیراو بەکارهێنانیان و کۆمەك کردنیان و راهێنانیان بە گوێرەی بڕیاری ٤٤/٣٣.

## ١- چوارچێوەی جێبەجێکردنی رێکەوتننامەکە:

لە مادەی یەکەمی رێکەوتننامەکەدا، بەکرێ گیراو کەسێکە کە[٨٢]:

أ- بەتایبەتی بە سیج بکرێت، چ بۆ ناوخۆ بێت یان بۆ دەرەوە، بۆ مەبەستی بەشداریکردن لە ململانێی چەکدارییەکاندا.

ب- رەنگە پاڵنەری سەرەکی لەبەشداریکردنەکەیدا لەو کارە دەستدرێژییانەدا، بۆ دەستەربەکردنی دەستکەوتی تایبەتی خۆی بێت، ئەویش بە وەرگرتنی بڕێك پارە، یان بەخشیش لە یەکێك لە لایەنە ململانێکارەکانەوە بەوەی بڕێکی زیاتر لەو بەڵێنانەی بەو جەنگاوەرانە درابێت کە خاوەنی هەمان پۆست و پلە بن لە هێزە چەکدارەکاندا بۆ ئەولایەنە.

ج- رەنگە هاوولاتیی لایەنێك لە ململانێکارییەکەدا نەبێت و نیشتەجێی ئەو هەرێمەش نەبێت کە دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی لایەنێکی ئەو ململانێکارییەوە

د- سەر بەهێزە چەکدارەکانی لایەنێکی کێشەکە نەبێت.

هـ- دەوڵەتێك کە لایەن نەبێت لە کێشەکەدا، بە ئەرکێکی رەسمی نەیناردبێت، بەوەی کەسێکە سەر بەهێزە چەکدارەکانی خۆی.

هەروەها لە برگەی دووەمی مادەی یەکەمدا هاتووە کە لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا کەسێك بە بەکرێ گرتە دادەنرێت:

أ-بە تایبەتی بەسیج بکرێت بۆ ناوخۆ یان بۆ دەرەوە، بۆ بەشداریی لە کارێکی نەخشە کێشراودا، بۆ کاری توندو تیژی بەمەبەستی:

١-رووخاندنی حکومەتێك، یان لەبەر یەك هەڵوەشاندنەوەی سیستمی دەستووری دەوڵەتێك بەهەر رێگەیەك بێت، یان

٢-شێواندنی ئاشتی ئیقلیمی دەوڵەتێك.

---

[٨٢] ماددەی ١/١ لە رێکەوتننامەکە.

ب-رەنگە پاڵنەرە سەرەکییەکەی بریتیی بێت، لە چەسپاندنی خواستی تایبەتی خۆی و کەسانی دیکەش هانی بدەن، بە بەڵێن پێدانی بەخشیشی مادی و خەڵاتکردن.

ج-سەربەو دەوڵەتە نەبێت کە ئەم کارەی ئاراستە دەکرێت و نیشتەجێشی نەبێت.

د-دەوڵەت بە ئەرکێکی رەسمی نەینارد بێت.

هـ-سەر بە هێزە چەکدارەکان نەبێت کە ئەم کردەیە لە قەڵەمڕەوەکەیدا ئەنجام دەدرێت.

هەر کەسێك هەستێت بە بەسیج کردنی بەکرێ گیراوان، بەکارهێنان یان کۆمەك کردن و راهێنانیان، بە پێی ئەو پێناسەیەو بە گوێرەی حوکمی رێکەوتننامەکە[٨٣] بە تاوانبار دادەنرێت و، هەروەها ئەگەر هاوبەشی کەسێکی کرد کە کاری لەو جۆرە ئەنجام دەدات یان دەست پێدەکات[٨٤].

هەروەها نابێت دەوڵەتانی ئەندامی رێکەوتننامەکە هەڵسن بە، بە سیج کردنی بەکرێ گرتەو بەکارهێنانیان و تەمویلکردنیان و راهێنانیان و پێویستە ئەو چالاکیانە قەدەغە بکەن[٨٥]. هەروەك چۆن نابێت دەوڵەتانی لایەنی رێکەوتننامەکە هەڵسن بە بەسیج کردنی بەکرێ گرتە، بۆ مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی جموجۆڵی رەوای مافی گەلان، بۆ دیاریکردنی چارەنووس بە پێی یاسای نێودەوڵەتی و، پێویستە لەسەر ئەو وڵاتانە کە رێوشوێنی گونجاو بگرنەبەر، بۆ رێگەنەدان بە بەسیج کردن، بەکارهێنان، تەمویلکردن یان راهێنانی بەکرێ گرتە[٨٦]. و سزادانی ئەو تاوانەی لە رێکەوتننامەکاندا هاتوون، بەسزا گەلێ کە گونجاوبن لەگەڵ ماکی ترسناکی ئەم تاوانانە[٨٧].

---

[٨٣] ماددەی ٢ی رێکەوتننامەکە.

[٨٤] ماددەی ٤ی رێکەوتننامەکە.

[٨٥] ماددەی ٥/١ی رێکەوتننامەکە.

[٨٦] ماددەی ٥/٢ی رێکەوتننامەکە.

[٨٧] ماددەی ٥/٣ی رێکەوتننامەکە.

دەوڵەتانی ئەندامی رێکەوتننامەکە هاوکاری یەکتری دەکەن، بۆ قەدەغەکردنی ئـەو تاوانانــەو گرتنەبــەری رێوشــوێنی گونجــاو لــە قەڵــەمرەوەکانیاندا، بــۆ قەدەغەکردنی ئامادەکاری بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانانە لە نێو قەڵەمڕەوەکانیاندا یــان دەرەوە، بەهــەموو ئــەو چالاکییــە نــا یاســاییانەی کــە کەســان و کۆمەڵــەو رێکخراوەکـان، بـۆ هـاندانی ئـەو تاوانانـەو رێکخسـتنی، یـان بەشـداریکردن بـۆ ئەنجامدانی، دەیگرنەبەر[88].

## -دەسەڵاتی دادوەری:

مادەی نۆیەمی رێکەوتننامەکە دەسەڵاتی دادگایی بۆ دەوڵەتان لە خۆدەگرێت، کـە هــەموو دەوڵــەتانی ئــەندامی رێکەوتننامەکــە پابــەند دەکـات، بــەوەرگرتنی رێوشــوێنی گونجـاو بـۆ بــەرپاکردنی دەســەڵاتی دادوەری خــۆی، لەســەر ئــەو تاوانانــەی کــە لــە رێکەوتننامەکــەدا بڕیــاری لەســەردراوە کــە تاوانەکــە لــە قەڵەمڕەوەکەیدا، یان لەسەر کەشتییەکی یان فڕۆکەیەکی وڵاتەکەی ئەنجام دراوە. ئەگەر تاوانەکە یەکێك لە هاووڵاتیانی ئەنجامی دابێت[89]، یان کەسێك هـەڵگری رەگەزنامـە نـەبێت و ئەو قەڵەمڕەوەیان کردبێت بە شوێنی دانیشتنی خۆیـان[90]، پێویستە بە پێی یاساکانی دەستگیری بکات، یان رێوشوێنی پێویست بگرێتەبەر بۆ زامنکردنـی مانـەوەی لـە ماوەیـەکی پێویسـتدا، بۆ جێبەجێکردنی تاوانکـاری یــان بەدەســتەوەدانی و، لێکۆڵینەوەیــەکی ســـەرەتایی ســـەبارەت بەرووداوەکــە پەیوەندییان بە تاوانەکەوە هەیە[91]. پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتـەی کە تاوانەکە لە قەڵەمڕەوەکـەیدا ئـەنجام دراوە، مامەڵەیــەکی عادیلانـە لـە هـەموو ئـەو قۆنـاغ و رێوشــوێنانە بکـات و چـاودێریی ســەرجەم مافـەکان و گەرەنتییــەکانی بکـات کــە

---

[88] ماددەی(٦) لە رێکەوتننامەکە.

[89] ماددەی(٩) لەسەر (١)- ا- ی رێکەوتننامەکە

[90] ماددەی ٩/١ب ی رێکەوتننامەکە.

[91] ماددەی ١٠ی رێکەوتننامەکە.

بڕیاری لەسەر دراوە لە یاسای نیشتیمانی دەوڵەتەکەدا. و هەروەها چاودێریی بنەما یاساییە نێودەوڵەتییەکان لەو بوارەدا بکات[٩٢].

مادەی چواردەهەمی ڕێکەوتننامەکە، ئەو دەوڵەتە ناچار دەکات کە کەسی تاوانباری تیادا دادگایی دەکرێت، سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، لە ئەنجامی کۆتایی ڕێوشوێنی دادگاییەکە بەپێی یاسا جێبەجێکراوەکانی ئەو قەڵەمڕەوە، لێی ئاگادار بکرێتەوە، پێویستە ئەویش ئەو زانیارییانە ڕەوانەی وڵاتانی تری پەیوەندیدار بکات

## ٣- بەدەستەوەدان:

مادەی پانزەیەم هەموو ئەو تاوانانەی لە ڕێکەوتننامەکەدا هاتوون، بەو تاوانانە دادەنێت کە پێویستە تاوانبارەکانیان بەدەستەوە بدرێن. وڵاتانی پەیوەندیدار دەبێ ئەو تاوانانە تۆمار بکەن، بەوەی تاوان گەلێکن دەبێ تاوانباران بەدەستەوە بدرێن، لەهەر ڕێکەوتننامەیەك بۆ بەدەستەوەدانی تاوانباران کە لە نێوانیاندا مۆر دەکرێت[٩٣]. بەڵام ئەگەر ڕێکەوتننامەیەك لەم بوارەدا، لە نێوان وڵاتە پەیوەندیدارەکان، نەبوو، ئەوا بۆیان هەیە ئەگەر بیانەوێت، ئەم ڕێکەوتننامەیە بە بنەمایەکی یاسایی دابنێن، بۆ بەدەستەوەدان سەبارەت بەو تاوانانە[٩٤].

پێویستە لەسەر ئەو وڵاتانەی لایەنن لە ڕێکەوتننامەکەدا کە بەدەستەوەدانی تاوانباران نەبەستنەوە بە بوونی ڕێکەوتننامەیەك کە ئەو تاوانانە بەو تاوانانە دابنێت کە دەخوازێت، لە نێوان خۆیاندا تاوانبار بدەنبەدەستەوە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەو مەرجانەی کە یاسای ئەو دەوڵەتە دیاری دەکات کە داخوازییەکەی پێشکەش دەکرێت[٩٥]. و بەشێوەیەك مامەڵە لەگەڵ تاوانەکاندا

---

[٩٢] ماددەی ١١ی ڕێکەوتننامەکە.

[٩٣] ماددەی ١/١٥ی لە ڕێکەوتننامەکە.

[٩٤] ماددەی ٢/١٥ی لە ڕێکەوتننامەکە.

[٩٥] ماددەی ٣/١٥ی لە ڕێکەوتننامەکە.

دەكرێت، بەمەبەستی بەدەستەوەدانی تاوانباران، لە نێوان وڵاتانی ڕێكەوتننامەكە، وەكو ئەوەی ئەنجام درابن، نەك لەو شوێنەی تیایدا رووی دابێت و بەس، بەڵكو لە قەڵەمڕەوی ئەو وڵاتانەشدا كە داوایان لێدەكرێت بە پێی مادەی(٩) لەم ڕێكەوتننامەیە. دەسەڵاتی دادوەریی خۆیان پیادە بكەن[٩٦].

لە ١٩٩٠/١٢/٣١دا، دەرگای ئیمزاكردنی ڕێكەوتننامەكە، لە بارەگای نەتەوە یەككگرتووەكان لەنیۆیۆركدا ئاوەڵاكراو، بەڵگەنامە ئیمزاكراوەكان سپێردرا بە سكرتێری گشتیی نەتەوەیەككگرتووەكان[٩٧]. و ڕێكەوتننامەكە لە ٣٠ رۆژ دوای سپاردنی دەست بەجێ بەجێ كردنی دەكرێت، چوونە ریزی بیست و دووەمینەوە، لەلایەن سكرتێری گشتی نەتەوە یەككگرتووەكانەوە[٩٨].

## بەشی دووەم:

بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەكانی تایبەت بە قەڵاچۆكردنی تیرۆری نێودەوڵەتی.

تیرۆری نێودەوڵەتی یەكێكە لە تاوانە مەترسیدارە ئاراستەكراوەكان دژی سیستمی گشتیی نێودەوڵەتی، یەكێكە لە جەنگە وێرانكەرو وەحشیگەرە رانەگەیەنراوەكانی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ و، نێوان تاك و دەوڵەتدا، هەڕەشە لە ئاشتی دەكات و بنەماكانی لەبەر یەك هەڵدەوەشێنێتەوە. بە لەبەرچاوگرتنی مەترسی كارە تیرۆرییەكان و،زۆربەی لایەنەكانی و جۆراوجۆریی قوربانییەكانی و، پەیوەندیی بە چەندین تاوانی دیكەوە، هەوڵە نێودەوڵەتییەكان چڕبوونەوە، بۆ بنبڕكردنی تیرۆری نێودەوڵەتی و چارەسەركردنی هۆیەكانی سەرهەڵدانی و، تاوانباركردنی ئەو كارانەی پێكهێنەری ئەو تاوانە مەترسیدارەن، و سزادانی ئەنجامدەرانی، لە پێناو كەمكردنەوەی كاریگەری و شوێنەواری گەورەی لەسەر مرۆڤایەتی، پتەوكردنی هەلەكانی ئاشتی و پشتگیریكردنی لە نێوان گەلاندا.

---

[٩٦] ماددەی ١٥/٤ی لە ڕێكەوتننامەكە.

[٩٧] ماددەی ٢،١/١٨ لە ڕێكەوتننامەكە.

[٩٨] ماددەی ١/١٩ لە ڕێكەوتننامەكە.

لە کۆنگرەی یەکەمدا، بۆ یەکخستنی یاسای سزاکان کە لە وارشۆ لە ساڵی ۱۹۲۷دا بەسترا، تیرۆری سیاسی خرایە نێو تاوانەکانی یاسای گەلانەوە لە کۆنگرەی سێیەم کە لە ساڵی ۱۹۳۰ لە برۆکسلدا بەسترا، جەخت لەسەر ئەوە کرایەوە کە تیرۆری سیاسی خۆی لەو تاوانانەدا دەبینێتەوە کە لەگەڵ رێکخستنی کۆمەڵایەتی هەموو وڵاتانی جیهان یەکناگرێتەوەو، لە کۆنگرەی چوارەمی ساڵی ۱۹۳۱دا کە لە پاریس بەسترا، تاوانی تەقینەوەی بۆمب و ئامێرەکانی دیکەی هاوشێوەی کە رەنگە زیانی گەورەی لێبکەوێتەوە، خرایە ریزی کارە تیرۆرییەکانەوە کە بە پێچەوانەی بەکارهێنانی توندو تیژییەوە، بە مەبەستی وێرانکردنی دامەزراوە سیاسیەکان لە کۆمەڵگەدا ئەنجام دەدرێن. لە کۆنگرەی پێنجەمدا کە لە ساڵی ۱۹۳۳ لە مەدریدا بەسترا، کارەکانی تاڵان کردن و وێرانکردن و بەکارهێنانی توندو تیژی لە ریزی تاوانی تیرۆری سیاسیدا پۆلین کرا، لە راستیدا نووسینگەی نێودەوڵەتی، بۆ یەکخستنی یاسای سزادانی تیرۆری سیاسی بەو شێوەیە وەسف کرد کە تیرۆری سیاسی، تەنها مەترسییەکی گشتی نییە، بەڵکو ئامانجەکەی بریتییە لە نیگەران کردنی گەل، لەسەر ماڵ و سامان و گیانیان[٩٩].

لەوەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە تاوانی تیرۆر پشت بە ترس و تۆقاندن و دڵەڕاوکێ دەبەستێت، بەوەی کەنەك هەریەك لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی کردەی تیرۆر، بەڵکو دیارترین کۆڵەکەی یاساییەتی. هەندێکیش چەمکی هێزو زۆرداریشیان خستە سەر چەمکەکانی تر، بەوەی ئامرازێکی تیرۆرە بۆ تۆقاندن و ترساندن. لە کۆنگرەی کۆبنهاگنی ساڵی ۱۹۳۵دا کە بۆ یەکخستنی یاسای تاوان بەسترا، خاڵێکی تر خرایە سەر پێکهاتەکانی تیرۆری سیاسی کە ئەویش بەکارهێنانی ئامرازی دیاریکراوە کە رەنگە بێتە هۆی هێنانەدی چەند مەترسییەکی نادیارە[١٠٠] لێرەوە رێکەوتننامە نێودەوڵەتییە پەیوەندیدارەکان بە

---

[٩٩] بڕوانە کتێبی: "الارهاب السياسي و القانون الجنائي" سەرچاوەی پێشوو ئامارەی بۆکرا ل٨٩–٩١.

[١٠٠] سەرچاوەی پێشوو ل٩٢.

قەدەغەکردن و سزادانی تیرۆری نێودەوڵەتی بە هەموو شێوەکانیەوە دەخەینەڕوو.
ئەوەی کە سەرجەم ئەو ڕێکەوتننامەنە کۆدەکاتەوە بریتییە لە کۆمەڵێك کاری پێکهێنەری تیرۆر"Corpus Delict" کە ئەو تاوانانە پێکدەهێنن کە بەپێی دەقەکانیان سزایان بۆ دانراوە. هەروەها ئەو ڕێکەوتننامانە سروشت و شێوەی تاوانی تیرۆر، لە سۆنگەی یاسای نێودەوڵەتیەوە روون دەکەنەوە، لەگەڵ دەست نیشانکردنی شوێنی ئەو تاوانانەو ڕێوشوێنە دادگاییەکان و ڕێوشوێنی تاوانکاری کە وڵاتانی ئەندام لەو ڕێکەوتننامەیەدا لەسەریانە کە روو بەڕووی دادگایان بکەنەوە، بەهۆی ئەو دیاردە تاوانکارییە مەترسیدارانەو سزادانی ئەنجامدەرانیان.

# بابەتی یەکەم
# ڕێکەوتننامەکانی قەدەغەکردن و بنبڕکردنی کارە تیرۆرییە ئاراستەکراوەکانی دژی دەوڵەت

کارە تیرۆرییەکان شێوەی جۆراوجۆر وەردەگرن، لە نێوانیاندا وێرانکردنی دامەزراوە گشتییەکان کە لەڕووی ئابوورییەوە گرنگەو، تیرۆرکردنی کەسایەتی سیاسی ناسراو کە کاریگەرییان لەسەر رای گشتی دەبێت، بۆ تێکدانی قەوارەی ئەو دەوڵەتەو لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی سەقامگیری و وروژاندنی ترس و تۆقین لە نێو هاووڵاتییانیدا، بە ئامانجی گۆڕینی سستمی سیاسی، یان روخاندن و لەناوبردنی ئەو دەسەڵاتەی تیایدایە.

دەوڵەتان بایەخیان بەو جۆرە تیرۆرەداو، چەندین ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتییان، بۆ قەدەغەکردن و سزادانی کردە تیرۆرییەکانی ئاراستەکراو دژی دەوڵەت مۆرکرد. لەو ڕێکەوتننامانەش:

١-ڕێکەتننامەی جنێف بۆ قەدەغەکردن و سزادانی تیرۆر، کە لە ١٦ی تشرینی دووەمی ١٩٣٧ لە جنێفدا ئیمزاکراوە.

٢-ڕێکەوتننامەی ئەورویا بۆ بنبڕکردنی تیرۆر، کە لە ٢٧ی کانوونی دووەمی ١٩٧٧ لە ستراسبۆرگ ئیمزاکراوە.

هەریەك لەم ڕێکەوتننامانە بە جیاو بە تێرو تەسەلی روون دەکەینەوە:

**یەکەم:ڕێکەوتننامەی جنێف بۆ قەدەغەکردن و سزادانی تیرۆری ساڵی ١٩٣٧[101]:**

---

[101] ڕێکەوتننامەکە لە ١٦ی تشرینی دووەمی ١٩٣٧دا ئیمزاکرد، ئەو دەوڵەتانەش کە ئیمزایان کرد: ئەلبانیا، ئەرجەنتین، بەلجیکا، بولگاریا، کوبا چیك و سلۆفاکیا، کۆماری دۆمینیکان، ئیکوادۆر، میسر، ئستونیا، فەرەنسا، یۆنان، هایتی، هندستان، شانشینی مۆناکۆ، هۆڵەندا، نەرویج، پیرۆ، ئیسپانیا، تورکیا، یەکێتی سۆڤیەت، فەنزویلا، یوگسلافیا.

لە ٩ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٤دا، ئەلکسەندەری یەکەمی پاشای یوگوسلافیاو لویس بارتۆ(Louis Barthau)ی سەرۆك وەزیرانی فەڕەنسی لە مرسیلیا تیرۆرکران، لە کاتی سەردانێکی ڕەسمی ئەلکسەندەردا بۆ فەڕەنسا. کە ئەو ڕووداوە کاردانەوەی توندی لە ئەورووپادا لێکەوتەوەو حکومەتی یوگوسلافیاش نارازیبوونی خۆی ئاراستەی ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان کردو تیایدا حکومەتی ئەڵمانیای نازیی بە تێوەگلان لەو ڕووداوەدا تاوانبارکردو داوای لێکۆڵینەوەی دەسبەجێی لە مەسەلەکە کرد، بەپێی بڕگەی دووەم لە مادەی دووەم لە پەیمانی کۆمەڵەی نەتەوەکان. لە(٩)ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٤دا، حکومەتی فەڕەنسی یاداشتێکی پێشکەش بە ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان کرد، کە پرەنسیپە سەرەکییەکانی لەخۆگرتبوو، دەکرێت لەبەر ڕۆشناییدا ڕێکەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی بۆ بنبڕکردنی تاوانەکان دابڕێژێت و، بۆ بنبڕکردنی ئەو تاوانانەی بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجە سیاسییەکان، یان تیرۆرییەکان ئەنجام دەدرێن[١٠٢].

لە ١٠ی کانوونی ساڵی ١٩٣٤دا، ئەنجومەنی ڕێکخراوی کۆمەڵەی نەتەوەکان، بە تێکڕایی ڕازیبوون لەسەر بڕیاری پێکهێنانی لیژنەیەك لە پسپۆڕان، بۆ داڕشتنی پرۆژەی ڕێکەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی، لە پێناو لەباربردنی هەر پلانێکی تیرۆری و قەلاچۆکردنی تاوانکاری و گرتنی ئەنجامدەرانی، لە پێناو کۆتایی هێنان بە دیاردەی تیرۆری سیاسی. لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٦داو، دوای چاوخشاندنەوە بە پرۆژە پێشکەشکراوەکان، بۆ داڕشتنی ڕێکەوتننامەی قەدەغەکردن و سزادانی تیرۆر کۆمەڵەی گشتی نەتەوەکان، بڕیارێکی دەرکرد کە تیایدا ئەو پرەنسیپانەی دیاریکرد کە ڕێکەوتننامە پێشنیاکراوەکەی لەسەر دادەڕێژرێت و لە ژیانی سیاسی دەوڵەتێکی تردا کرد.

---

لەمەڕ دەقی ڕێکەوتننامەکە، بڕوانە:

*L. N. O. J., January 1938: 23*

[١٠٢] بڕوانە:

*League of Nations official Journal, 1934,. P. 1839*

لە جنێڤی پایتەختی سویسرا، کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی لە ماوەی ١-١٦ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٧دا بەسترا، بە مەبەستی گەیشتن بە ڕێکەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی، بۆ بنبڕکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی. لەراستیدا، کۆنگرەکە سەرجەم ئەو پرۆژە پێشکەشکراوانەی تاوتوێکرد، لە کۆتاییدا گەشتنە دوو ڕێکەوتننامە: یەکەم بۆ قەدەغەکردن و سزادانی تیرۆری نێودەوڵەتی، دووەم بۆ پێکهێنانی دادگایەکی تاوانی نێودەوڵەتی.

ڕێکەوتننامەی جنێف بۆ بنبڕکردنی و سزادانی تیرۆر لە پێشەکییەك و(٢٩) ماددە پێکهاتووە، لە پێشەکییەکەدا هانی ئەولایەنانە دەدات کە ڕێکەوتننامەکەیان مۆرکردووە، ڕێوشوێنی کاریگەر بگرنەبەر بۆ بنبڕکردن و سزادانی تاوانی تیرۆر کە مۆرکی نێودەوڵەتی پێوە دیارە. لە مادەی یەکەمی ئەو ڕێکەوتننامەیەدا، لایەنەکان بەڵێنیان داوەکە ڕێگە لە هەموو کارێك بگرن کە هانی چالاکیی تیرۆری دەدات و کاری تیرۆری ئاراستەکراو بۆ هەر دەوڵەتێکی دیکە قەدەغە دەکەن و سزای ئەنجامدەرانی دەدەن، بۆ چەسپاندنی ئەوەش، دەبێت هاوکاری لە نێوانیاندا هەبێت. لەربڕگەی دووەمی هەمان مادەدا، هاتووە کە مەبەست لە کاری تیرۆر، ئەو تاوانە ئاراستەکراوانەیە دژی هەر دەوڵەتێك، بە مەبەستی دروستکردنی حاڵەتی ترس و تۆقینە، لەلای کۆمەڵە کەسێکی دەست نیشانکراو، یان هەر کۆمەڵە کەسێك یان هەموو خەڵکی(١٠٣).

لەوەی کە باسکرا، روون دەبێتەوە کە پێویستە، بەپێی بڕگەکانی ڕێکەوتننامەکە، چەند مەرجێك هەبێت لە کاری تیرۆریدا، تا ئەو بڕگانەی کە لە ڕێکەوتننامەکەی جنێفدایە بیگرێتەوە، بەسەریدا لەو مەرجانەش کە کارە تیرۆرییەکە لەو جۆرەبێت کە دەچێتە ڕیزی ئەو کردە تاوانکارییانەی کە لە ڕێکەوتننامەکەو یاسادانانی سزای نیشتیمانیدا هاتووە، کە کارەکە بە ڕێگەی

---

(١٠٣) پێناسەی تیرۆر لە مادەی ٢/١ی ڕێکەوتننامەکە بەم شێوەیە هاتووە:

*"Criminal acts directed against a state and intended or Create a state of terror in the minds of Particular Person or a group of persons or the general Pudlic"*

راستەوخۆ، یان ناراستەوخۆ ئاراستەی دەوڵەت بکرێت، چونکە کارە ئاراستەکراوەکانی دژی تاك، ناچنە چوارچێوەی جێبەجێکردنی رێکەوتننامەکەوە، کە ئامانج لە ئەنجامدانی بۆ بەرپاکردنی باری ترس و تۆقاندن و دڵەڕاوکێ بێت، لە نێو کەسایەتیە دەست نیشان کراوەکاندا، یان کۆمەڵێکی دیاریکراو لە خەڵك، یان خەڵك بە گشتی و، کاری تیرۆری بچێتە ریزی ئەو کارانەی کە لە ماددەی دووەمی رێکەوتننامەکەدا هاتوون و کارەکە مۆرکێکی نێودەوڵەتی بەخۆوە بگرێت[١٠٤].

## ١- چوارچێوەی جێبەجێکردنی رێکەوتننامە:

رێکەوتننامەکە لە ماددەی دووەمیدا ئاماژە بە چەند نموونەیەك لەو کردانە دەکات کە بە کردەی تیرۆریی دەژمێردرێن کە مۆرکێکی نێودەوڵەتییان پێوە بێت، بە پێی ئەو ماددەیەش، برگەکانی رێکەوتننامەی جنێف بەسەر ئەمانەی خوارەوەدا جێبەجێدەکرێت:

١-هەر کردەیەکی بە ئەنقەست کە دەبێتە هۆی مردن یان زیانی گەورەی جەستەیی یان پێشێلکردنی ئازادیی هەریەك لە:

أ-سەرۆکی دەوڵەتان و جێگیرەکانیان و ئەوانەی هەڵدەستن بە کارەکانیان، یان ئەوانەی جێیان دەگرنەوە.

ب-ژنان یان پیاوانی ئەو کەسانەی لەسەرەوە ئاماژەیان پێکرا.

ج-ئەوکەسانەی کە لێپرسراویەتی گشتییان لە ئەستۆدایە، یان ئەوانەی پۆستی گشتییان بەدەستەوەیە، ئەگەر ئەو تاوانەیان بەرامبەرکرا بەهۆی پلەو پایەکانیانەوە.

٢-وێرانکردن و تێکدانی بە ئەنقەست، یان زیانگەیاندن بە سامان و شتومەکی گشتی یان ئەو کەل و پەلانەی کە بۆ مەبەستی گشتی دیاریکراون و یان دەگەڕێنەوە بۆ دەسەڵاتی وڵاتێکی تر لە وڵاتانی پەیماننامەکە.

---

[١٠٤] بڕوانە:الارهاب الدولي- مع دراسة للاتفاقيات الدولية و القرارات الصادرة عن المنظمات الدولية)، د. عبدالعزيز مخيمر عبدالهادي، ١٩٨٦، ل١٦٩- ١٧٠.

٣-هەر کردەیەکی بە ئەنقەست کە ژیانی گشتی رووبەڕووی مەترسی بکاتەوە.

٤-هەر هەوڵدانێك بۆ سەرپێچیکاری لە چوارچێوەی ئەو کردانەی پێشتردا.

٥-دروست کردن، بەدەست هێنان، لەدەست دابوون، پێدانی چەكو ئامرازی تەقینەوە، یان هەر ماددەیەکی دیکەی زیان بەخش، بەمەبەستی ئەنجامدانی هەر کردەیەکی لەو جۆرە لەهەر دەوڵەتێکدا بێت، کە دەچێتە چوارچێوەی ئەو کارە قەدەغەکراوانەی لە پێشەوە ئاماژەیان پێکرا.

لەماوەی سێیەمدا بڕیاردراوە کە هەموو ئەو دەوڵەتانەی کە ڕێکەوتننامەکەیان مۆرکردوە، بەڵێن دەدەن بە مامەڵەکردن لەگەڵ هەر کردەیەك کە لە قەڵەمڕەوی هەر دەوڵەتێکدا ئەنجام دەدرێتو پەیوەندیی بەو تاوانانەوە هەیە کە لە مادەی دووەمی ڕێکەوتننامەکەدا هاتووەو، دژی یەکێك لەو دەوڵەتانە ئاراستە بکرێت، هەر دەوڵەتێك کە کارە تیرۆرییەکە لە قەڵمڕەوەکەیدا ئەنجامدرابێت، بە یەکێك لەو تاوانە دادەنرێت کە سزای بۆ دیاریکراوەو، لە کارانە:

١-پیلان گێڕان بۆ ئەنجامدانی هەر یەکێك لەو کردانە.

٢-هاندان بۆ ئەنجامدانی هەر کردەیەکی تیرۆریستی، لە کاتی سەرکەوتنی ئەنجامدەرەکە لەتەواوکردنی تاوانەکەیدا.

٣-هاندانی ئاشکراو راستەوخۆ، بۆ ئەنجامدانی هەر کردەیەك کە لە بڕگەکانی ١و٢و٣ی ماددەی دووەمدا هاتووە، جا ئەگەر ئەو هاندانە ببێتە هۆی تەواوکردنی تاوانەکە یان نەبێت.

٤-هاوبەشی کردن بەمەبەست لە یەکێك لەو کارانەدا

٥-پێشکەشکردنی یارمەتیو کۆمەك، بە ئاگادارییەوە بۆ کار ئاسانی لە ئەنجامدانی ئەو کردانە.

لەراستیدا، ڕێکەوتننامەکە چارەسەریهەندێ کردەی کرد کە لە خۆیاندا بە تاوانی تیرۆری دانانرێن، بەڵکو پەیوەندییەکی توندو تۆڵیان بەو تاوانانەوە هەیە، لەوانەش پاسپۆرتی گەشتو پێناسی کەسیەتیو.. هتد بەمەبەستی شاردنەوەی پێناسی جێبەجێکاری کردە تیرۆرییەکان، یان دابینکردنی گەیاندنی ئەو کەسە بۆ

شوێنی ئەنجامدانی تاوانەکە، یان ئاسانکاریی بۆ دەربازکردنیان لە گۆڕەپانی رووداوەکان، لە دوای ئەنجامدانی تاوانەکە. هەر چەندە ئەم تاوانانە بەکاری تیرۆر دانانرێت، ئەگەر بە شێوەی تاکەکەسی ئەنجام دران، بەڵام ئەو تایبەتمەندییە بەخۆوە دەگرێت ئەگەر پەیوەندیی هەبوو بە یەکێك لەو تاوانانەی کە لە ماددەی دووەمی رێکەوتننامەکەدا، هاتووە[١٠٥].

## ٢-دەسەڵاتی دادوەری:

هەموو ئەو دەوڵەتانە پابەند دەبن، بەوەی پەیوەندیی بە چالاکییە تیرۆرییەکانەوە هەیە، بە پرەنسیپی بە جیهانی بوونی بنبڕکردنی کردە تیرۆرییەکانی، بەپێ رەچاوکردنی رەگەزنامەی ئەنجامدەری کارەکە، یان شوێنی ئەنجامدانی تاوانەکە. رێکەوتننامەکە هەموو ئەو دەوڵەتانە پابەند دەکات بەدادگایکردنی ئەنجامدەری کارەکەو سزادانی، کە دەچێتە سنورەکەیەوەو لە سنووری دەوڵەتێکی دیکەدا کارەکەی ئەنجام داوە[١٠٦]. وەکو ئەوەی کە لەو وڵاتەدا کارە تیرۆرییەکەی کردبێت، ئەوە کاتێ جێبەجێدەکرێت ئەگەر ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

أ-ئەو وڵاتەی تاوانەکە لە قەڵەمڕەوەکەیدا ئەنجامدرا، داوای بەدەستەوەدانی تاوانبارەکەی کردبێت. و داواکردنەکەی رەتکرابێتەوە، لەبەر چەند هۆیەك کە پەیوەندییان بەو تاوانانەوە نەبێت.

ب-کە یاسای ئەو وڵاتەی ئەنجامدەری کاری تیرۆریستی پەنای بۆ بردبێت، دان بە دەسەڵاتی دادگاکانیدا بنێت، لەرووی ئەو تاوانانەی کە لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتەدا ئەنجام دەدرێن، لەلایەن کەسانێکەوە کە رەگەزنامەی ئەو وڵاتەیان نییە.

ج-یاسای ئەو دەوڵەتەی کە تاوانبارەکە هەڵگری رەگەزنامەیەتی، دان بە دەسەڵاتی دادگاکانیدا بنێت، لەرووی ئەو تاوانانەی کە هاووڵاتییانی ئەو

---

[١٠٥] ماددەی ١٤ی رێکەوتننامەکە.

[١٠٦] ماددەی ١٥ی رێکەوتننامەکە.

دەوڵەتـە، لـە دەرەوەدا ئـەنجامی دەدەن هـەروەها ڕێكەوتننامەكـە بڕیـاریداوە كـە سزادان لـەم حاڵەتانـەدا، پێویسـتە كـە ئـەو دوا ئاسـتە تێنەپـەڕێنێت كـە یاسـای دەوڵەتە كە بڕیاری لەسەر دەدات كە تاوانەكـەی لـە قەڵەمڕەوەكـەیدا ئـەنجامدراوە، تەنانەت ئەگەر یاسای ئەو دەوڵەتەی كە تاوانبارەكەی لەبەردەم دادگا پـێ سـزا دەدرێت، بڕیاری توند بۆ ئەنجامدانی ئەو كارانە دیاریكردبێت[١٠٧].

سەرجەم دەوڵەتانی لایەنی ڕێكەوتننامەكە، پابەند دەكرێن بە پرەنسیپەكانی یارمـەتیدانی ئاڵوگۆڕكراوە، لـە بواری بنـبڕكردنی كـارە تیرۆریـیـەكان، ئـەویش بـە هۆی هاوكاریكردنی نێوان دەزگاكانی پۆلیس و دەسـەڵاتی دادوەری و یاسادانانی سـەربەو دەوڵەتانـەو، هــە روەك چـۆن پابـەند دەبـن بـە قەدەغـەكردنی كـردەی تیرۆرییانە كە مۆركی نێودەوڵـەتییان هـەبێت، پێویسـتە ڕێوشـوێنی گونجـاو بـۆ چاودێریكردنی ئـەو كەسـانە بگرنەبـەر كـە گومـانی ئـەنجامدانی ئـەو كارانـەیان لێدەكرێت.

## ٣-بەدەستەوەدان:

ماددەی هەشتەمی ڕێكەوتننامە كە ئەو كردانەی لە ماددەی دووەم و سێیەمدا هـاتووە، بـە تـاوانی ئاسـایی دادەنێـت و ئـەنجامدەرەكانی ناچـار دەكرێـن بـە خۆبەدەستەوەدان تەنانەت ئەگەر مەبەستێك یان پاڵنەری سیاسیشیان لـە پشـتەوە بێت. ئەو كردانەش دەچنە ریزی حاڵەتـەكانی بەدەستەوەدان كە لـە نێو وڵاتـانی لایەنگردا كاریان پێدەكرێت، یان كە لە داهاتوودا بڕیاری لەسەر دەدرێت.

ڕێكەوتننامەی جنێف بەوە جیادەكرێتەوە كە كۆمـەڵێك كـردەی دیـاری كـراوی پێكهاتەی بۆ تیرۆر لە خۆگرتووە كە ئەو تاوانە سزای لەسەر دەدرێت، بە گوێـرەی دەقـەكانیان، هـەروەها ڕێكەوتننامەكـە سروشـت و شـێوەی تاوانـە تیرۆریـیـەكان، لـە سۆنگەی یاسای نێودەوڵەتییەوە ڕوون دەكاتەوە، لەگەڵ دیاریكردنی شـوێنی ئـەو تاوانـەو، ئـەو ڕێوشـوێنانەی پارێزگـاریكردن و هەڵسـوڕاوە تاوانكارییانـەی كـە

---

[١٠٧] ماددەی(١١)ی لە ڕێكەوتننامەكە.

دەوڵەتان پابەند دەکات، بۆ ئەنجامدانیان بۆ قەدەغەکردنی تیرۆر سزادانی ئەنجامدەرانی.

ڕێکەوتننامەی جنێف نەچۆوتە لایەنی جێبەجێکردنەوە، بەهۆی بڕیارنەدان لەسەری لەلایەن ئەو دەوڵەتانەی ئیمزایان کردووە، تەنها یەك دەوڵەت نەبێت کە بڕیاری لەسەر داوە ئەویش هندستانە[١٠٨]، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێکەوتننامەکە بەیەکەمین هەوڵ دادەنرێت، بۆ چارەسەرکردنی دیاردەی تیرۆر، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا. تەنها ڕەخنەیەك ئاراستەی ڕێکەوتننامەکە کراوە کە تەنها یەك شێوەی لە تیرۆر ڕەچاوکردووە کە ئەویش تیرۆری شۆڕشگێڕانەیە، دەستدرێژیکردنە سەر دەسەلاتداران لە دەوڵەتدا- وێڕای کەمتەرخەمی لەو لایەنەی-، بەلام گوزارشت لە بڕوای دەوڵەتان دەکات، بۆ هاوکاریکردنی نێودەوڵەتی، بۆ بنبڕکردنی تیرۆر، قەلاچۆکردن و نەهێشتنی توندو تیژیی سیاسی، بەجۆرێ کە سەروەریی دەوڵەتان و ڕێزگرتن لە سیستمە دەستوورییەکانی دابین بکات. گەلێ لەو ڕێکەوتننامانەی پەیوەندییان بەکاری قەلاچۆکردنی تیرۆری نێودەوڵەتییەوە هەیە، کە دواتر بڕیاریان لەسەردراوە، سوودیان لەو ڕێگە چارانە وەرگرتووە کە لە ڕێکەوتننامەی جنێفدا هاتوون.

دووەم: ڕێکەوتننامەی ساڵی ١٩٧٧ی ئەوروپا بۆ بنبڕکردنی تیرۆر[١٠٩]:

لە ٢٧ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٧دا، ڕێکەوتننامەی بنبڕکردنی تیرۆر لە ستراسبۆرگ ئیمزاکرا، لە چوارچێوەی دەوڵەتانی ئەنجومەنی ئەوروپادا، بۆ کۆتایی هێنان بە دیاردەی تیرۆری نێودەوڵەتی کە وڵاتانی ئەوروپای لە سەرەتای حەفتاکاندا گرتەوە. ئامانجی ڕێکەوتننامەکە بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ هاوبەشی کردنە، لە بنبڕکردنی کارە تیرۆرییەکان کە دەبێتە دەستدرێژیی بۆ سەر ماف و ئازادییە بنەڕەتییەکانی کەسەکان و، ڕێکەوتننامەکە هەمان ئەو پرەنسیپانەی لە

---

[١٠٨] لە ١ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤١دا هندستان ڕێکەوتننامەکەی مۆرکردووە.

[١٠٩] لەدەقی ڕێکەوتننامەکەدا، بڕوانە:

*Gouncil of Europe- European Treaty Series, No. 90, P. 2; 15 I.L M., November, 1977.*

خۆگرتووه كه بڕیاری ئەنجومەنی ئەوروپا بانگەشەیان بۆ كردووه، لەمەڕ تیرۆریزمی نێودەوڵەتی لەساڵی ١٩٧٤دا، سەرەڕای ئەوەی یەكەمیان جیاوازە بەوەی پەیماننامەیەكی نێودەوڵەتی تەوزیمیە بۆ ئەندامانی[١١٠].

ڕێكەوتننامەكە لە پێشەكییەك و شانزە مادە پێكهاتووە. لە پێشەكیەكەدا هاتووە كە ئامانجی ئەو ڕێكەوتننامەیە، بریتییە لە گرتنەبەری ڕێوشوێنی كاریگەر، بۆ دڵنیابوون لە دەربازنەبوونی ئەنجامدەرانی كردە تیرۆرییەكان لە مسۆگەركردنی ئامادەبوونیان بۆ دادگایكردن و سەپاندنی سزای توندوتیژ دژیان.

## ١-چوارچێوەی جێبەجێكردنی ڕێكەوتننامەكە:

مادەی یەكەمی ڕێكەوتننامەكە كردە پێكهێنەرەكانی تاوانی تیرۆری نێودەوڵەتی دیاری دەكات، كە پێویستە لەسەر دەوڵەتانی لایەنی نێو ڕێكەوتننامەكە وەكو تاوانی سیاسی یان ئەو كردانەی پەیوەندییان بەو تاوانانەوە هەیە كە پاڵنەری سیاسیان هەیە، مامەڵەیان لەگەڵدا نەكەن، تا ئەو دەوڵەتانە بتوانن ئەنجامدەرەكان بدەن بەدەستی ئەو دەوڵەتەوە كە كارە تیرۆرییەكە لە قەڵەمڕەوەكەیدا ئەنجامدراوە، بۆ دادگایكردنیان و سەپاندنی سزای پێویست بە سەریاندا. و ئەو تاوانانەی كە مادەی یەكەم دەست نیشانی كردوون لە ڕێكەوتننامەكەدا، بریتین لە:

١-ئەو تاوانانەی كە لە دەقی ڕێكەوتننامەی بنبڕكردنی زەوتكردنی نارەوای فڕۆكەكان كە لە لاهای ساڵی ١٩٧٠ مۆركرا.

٢-ئەو تاوانانەی كە لە ڕێكەوتننامەی بنبڕكردنی تاوانی دەستدرێژی كردنە سەر ئاسایشی فڕۆكەوانیی مەدەنی كە لە مۆنتریال لە ساڵی ١٩٧١دا ئیمزاكراوە.

---

[١١٠] ئەو ڕێكەوتننامەیە هەریەك لە وڵاتانی: نەمسا،بەلجیكا، قوبرس،دانیمارك، یۆنان، فەڕەنسا، ئایسلەندا، ئیتاڵیا، لۆكسمبۆرگ، هۆڵەندا، نەرویج، پۆرتوگال، سوید، سویسرا، توركیا و ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، ڕێكەوتنامەكەیان ئیمزاكردووە، لە ٤ی ئابی ١٩٧٤دا، چۆتە خانەی جێبەجێكردنەوە.

٣-ئەو تاوانە مەترسیدارانەی کە بەدەستدرێژی کردنە سەر ژیان و گیان و ئازادیی ئەو کەسانەی کە لەژێر پارێزگاریی نێودەوڵەتیدان وەکو نوێنەرە دبلۆماتەکان.

٤-تاوانەکانی وەکو رفاندن و بە بارمتەگرتن، یان دەستەبەرکردنی تاکەکەس[111].

٥-ئەو تاوانانەی کە بەکارهێنانی بۆمبی دەستی و چەکە گڕدارەکان یان نامەی بەمین چێنراو، ئەگەر هاتوو ئەو بەکارهێنانە هەڕەشە بن بۆ سەر ژیانی کەسەکان.

٦-دەستپێکردن بە ئەنجامدانی هەریەك لەو تاوانانەی باسمان کرد، یان بەشداریکردن لەگەڵ کەسێکدا کە تاوانەکە ئەنجام دەدات، یان هەوڵی ئەنجامدانی دەدات.

ماددەی دووەمی رێکەوتننامەکە، رێگە بەو دەوڵەتانە دەدات کەرێکەوتننامەکەیان ئیمزا کردووە، بە فراوانکردنی چوارچێوەی تاوانەکان کە بەتاوانی سیاسی دانانرێت یان پەیوەندیی بە تاوانی هاندانی سیاسیەوە هەیە، دوای دیاریکردنی ئەو کۆمەڵە تاوانە دیاریکراوەی لە مادەی یەکەمدا دیاریکراوەو دواتر ناچارکردنی بۆخۆ بەدەستەوەدان، لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:

١-هەر کردەیەك لە کردە توندو تیژییە مەترسیدارەکان کە لە دژی ژیانی کەسان و سەلامەتی جەستەیی و ئازادییان ئاراستە دەکرێت.

٢-هەر کردەیەکی توندوتیژی ئاراستەکراو دژی شتومەك، ئەگەر دروستکردنی مەترسی بۆ سەر کۆمەڵی لێبکەوێتەوە.

لیستی ئەو کردارانەی کە رێکەوتننامەکە لە خۆی دەگرێت، مەودای ئەو گشتگیری و ئەبستراکتە روون دەکاتەوە کە گرتییەبەر، لە کاتی دیاریکردنی تاوانکارییەکان بەپێی ناوەڕۆکیان کە دەروازەیەك لەبەردەم ژمارەی راڤەکردنەکان

---

[111] ئەو کردانە ئاماژەکردنێکی ئاشکران، بۆ ئەو تاوانانەی لە رێکەوتننامەی بنبڕکردن و سزادانی ئەو تاوانانەدا هاتووە کە دژی ئەو کەسانە ئاراستەدەکرێت کە لەژێر پارێزگاریی نێودەوڵەتیدان، بەو نوێنەرە دبلۆماتانەوە کە لە ١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٣دا مۆرکراوە.

لە کاتی دەستکردن بە جێبەجێکردنی ئەم دەقە[١١٢]. هەروەها ئەوەی دەچێتە سە
ئاڵۆزیی پێوەر(ئەنجامدانی کردەیەك لە کردەکانی توندوتیژی ترسناك) کە
ماددەی دووەمدا هاتووە. لەبەرئەوە هەموو توندوتیژییەك بەمەترسی
لێکدەدرێتەوە، بەڵام تیرۆر هەموو شێوەکانی توندوتیژی ناگرێتەوە، بەڵکو ئە
کردانەی توندوتیژی دەگرێتەوە کە بۆ ئامانجی سیاسی ئەنجامدەدرێت و تیا
ئاستێك لە ترس و تۆقاندن دابین دەکات، ئەمەش دەروازەیەك بۆ ئەندازە گیر
توندوتیژی لەلایەن دەوڵەتانەوە ئاوەڵادەکات بۆ دیاریکردنی ئەوەی بە تیر
ئەژمار دەکرێت[١١٣]. لەگەڵ ئەوەشدا لە مادەی دووەمدا، خواستی داڕێژەران
ڕێکەوتننامەکە روون دەبێتەوە، بۆ لابردنی کۆسپ و تەگەرەیەکی یاسایی ک
دەبێتە هۆی بەدەستەوە نەدانی ئەنجامدەرانی ئەو کردانەی کە لە مادەی یەکە
دووەمدا هاتوون، بە هۆی مۆرکی سیاسی ئەو تاوانانەی کە ئەنجامیان داو
چونکە مادەی یەکەم و دووەم کۆمەڵێك لە تاوان و کردەی تیرۆری دەست نیشـ
کردووە کە پێویستە بە تاوانە مادییەکان دابنرێن و ڕێوشوێنی بەدەستەوەد
پیادەبکرێت، بەبێ تاوتوێکردنی هاندەرەکانی یان سروشتیە سیاسییەکانی.

## ٢-دەسەڵاتی دادوەری:

بنبڕکردنی کردە تیرۆرییەکان پێویستە؛ یان بەدەستەوەدانی تاوانبارانـ
ئەنجامدەرانی کارەکە، یان دادیکردنیان بێت، لەراستیدا ڕێکەوتننامەی ئەورو
ئەولەویەتی داوە بەمەسەلەی ڕێوشوێنی بەدەستەوەدانەکە. هەروەه
ڕێکەوتننامەکە ئەوەشی بە هەند وەرگرت کە دەوڵەتی پەیوەندیدار بـ
قەدەغەکردن یان ڕێگەنەدانی بەدەستەوەدانی ئەنجامدەری کارە تیرۆرییەکە، لەبە
هۆی تایبەت، وەك ئەوەی یەکێکە لە هاووڵاتیەکانی یان لەبەر هۆی تر

---

[١١٢] بەشێوەیەکی گشتی مادەی(١)ی ڕێکەوتننامەکە ئاماژە بۆ چۆنیەتی خراپ بە کارهێنانـ
بەندەکانی وەك لەناوبردنی نەیارە سیاسیەکان دەکات، بۆ ئەمەش بڕوانە:

*In wwai pasen arrier, Jourrnal des Ttribunaux, September, 24,1977.99+*

[١١٣] بڕوانە کتێبی:"الارهاب الدولي" ، و. عبدالعزيز مخيمر عبدالهادى، سەرچاوەی ئاماژە پێکراو
پێشوو.

دەستووریی و یاساییەوە. لەو بارەدا، پێویستە ڕێوشوێنی گونجاو و پێویست بگرێتەبەر، بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی پسپۆڕیی، لە بواری دادگاو ڕەوانەکردنی دۆسیەی کێشەکە بۆ دادگاکەی، بۆ تاوتوێکردنی دۆسیەی تاوانکاریی دژی تاوانبارەکە، بە دەستەوەنەدانی تاوانبار، بە مانای پاشگەزبوونەوەی دەوڵەت نابێت لەو پابەندبوونە، بەڵکو دادگایکردنی تاوانبارەکە دەسەپێنرێت و بەدانانی سزای گونجاو لەسەری[114].

ئەوەی جێی ئاماژە بۆ کردنە، ڕێکەوتننامەکە ئازادیی سەرپشك بوون لە نێوان بەدەستەوەدان و دادگاییکردنی پێ نابەخشێت، هەمیشە ئەولەویەت بۆ بەدەستەوەدانەو، دەسەڵاتی دادگایی بۆ دادگای دەوڵەتێکی دەست نیشانکراو نابەسترێت، تەنها لەو بارانەدا نەبێ کە مەحاڵە تاوانبار بدرێتە دەست ئەو دەوڵەتەی کە کردە تیرۆرییەکە لە قەڵەمڕەوەکەیدا ئەنجامدراوە. هەردوو مادەی شەشەم و حەوتەم لە ڕێکەوتننامەکە دەوڵەتی پابەند بەڕەوانەکردنی تاوانبار بۆ دەسەڵاتداری دادگایی تایبەت، بۆ دەستپێکردنی ڕێوشوێنی تاوانکاری دژی، لە حاڵەتی ئەوەی کە دەوڵەتەکە بەدەستەوەدانی تاوانبارەکە ڕەتبکاتەوە. ڕێکەوتننامەکە پێی باشە ئەنجامدەرانی کردە تیرۆرییەکان، لە بەردەم ئەو دەوڵەتەی کە تاوانەکە لە قەڵەمڕەوەکەیدا ئەنجامدراوە، بەوەی کە خاوەنی تایبەتمەندییەتی سروشتییە، بۆ چاوخشاندنەوە بەو جۆرە تاوانانەداو، کە دەکرێت لە ڕێگەیەوە بەرژەوەندیی هەردوولا(سکالاکەر)و دەوڵەتی پەیوەست بەدی بێت و ڕاگرتنی سەنگی دادوەری بە شێوەیەکی گشتی لێبکەوێتەوە.

## ٣-بەدەستەوەدان

ڕێکەوتننامەی ئەورووپا بە شێوەیەکی تایبەتی، جەخت لەسەر گرنگی پرەنسیپی بەدەستەوەدانی ئەنجامدەرانی کردە تیرۆرییەکان دەکاتەوەو، وەك یەکێك لە توخمە سەرەکییەکانی، بۆ دابین کردنی کارایی ڕێکەوتننامەکەو بەدیهێنانی بۆ ئەنجام و ئامانجە خوازیارەکانی. ڕێکەوتننامەکە ئەولەویەتی دا بەڕێوشوێنی بەدەستەوەدان و داوای تێپەڕاندنی کۆسپ و لە مپەرەکانی یاساییە

---

[114] بڕوانە مادەی ٦ و٧ی ڕێکەوتننامەکە.

کۆنباوەکانی کرد کە ڕێگە لە جێبەجێکردنی دەگرن و کە گرنگترینیان ئەوەیە کە ئەو کردانە تاوانی سیاسی پێك نایەنن، یان پاڵنەری سیاسی لە پشتەوە بێت، یان ئەو کردەیە پەیوەندیی بە یەکێك لە تاوانە سیاسییەکانەوە هەبوو بێت. لەبەر ئەوە دەبینین ڕێکەوتننامەکە کاتێك لە مادەی یەکەم و دووەمیدا، ژمارەیەك تاوان و کردەی تیرۆری دیاری دەکات، بڕیاریدا لەسەر ئەوە کە پێویستە بە تاوانی سروشتی دابنرێت و ڕێوشوێنی بەدەستەوەدان بگرێتەوە و هیچ هەلێك بۆ لێکۆڵینەوەی پاڵنەرەکەی یان سروشتە سیاسیەکەی نەهێڵرێتەوە.

ڕێکەوتننامەکە داوای لەو دەوڵەتانە کردووە کە ڕێکەوتننامەکەیان ئیمزایان کردووە، پێویستە چاو بە دیسپلینی کارپێکراوی نێوانیاندا بخشێنرێتەوە و، پەیماننامە و ڕێکەوتنامە بەرپاکانی نێوانیان، سەبارەت بە بەدەستەوەدانی تاوانباران و یارمەتییدانی دادگایی ڕاست بکەنەوە، بۆ ئەوەی ڕێکبکەوێت لەگەڵ بڕگەکانی ڕێکەوتننامەی ئەوروپادا، بۆ بنبڕکردنی تیرۆر، بەشێوەیەکی تایبەت ڕێکەوتننامەی ئەوروپا، بۆ بەدەستەوەدان کە لە ١٣ی کانونی یەکەمی ١٩٥٧دا ئیمزا کراوە و، ڕێکەوتننامەی ئەوروپا، سەبارەت بەیارمەتیدانی دادوەری، لەمەسەلە تاوانکارییەکان کە لە ٢ی نیسانی ١٩٥٩دا ئیمزا کراوە، ئەوەش بەئامانجی نەهێشتنی لەمپەرەکان لەبارەکانی بەدەستەوەدان، یان یارمەتییدانی دادگایی لەبارەی ئەوکەسانەی کە تاوانبارن، یان حوکمی ئەنجامدانی کردەی تیرۆرییان بەسەردا دراوە[١١٥].

---

[١١٥] ماددەی سێهەم لەڕێکەوتننامەی ئەوروپا، بۆ بنبڕکردنی تیرۆر. لەسەر دەقی مادەی سێهەم هەریەك لەولاتانی: ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، بەریتانیا، نەمسا، ئیسپانیا ڕازیبوون، بەڵام هەریەك لەدانیمارك، سوید، نەرویج، ئایسلەنداو قوبرس موحافیزانە ڕوانیانە دەقەکە، وئێرلەنداش ئیمزاکردنی ئەو ڕێکەوتنامەیەی ڕەتکردەوە، بەهۆی یەکنەگرتنەوەی ڕێکەوتننامەکە لەگەڵ پرەنسیپە نێودەوڵەتییە باوەڕپێکراوەکاندا.

بڕوانە ئەو ڕاپۆرتەی جۆن کیلی کە لەکۆنگرەی (بەرگریی لەدیموکراسییەت، دژی تیرۆری نێودەوڵەتی و ناونیشانەکەی:

*C a gainst Terrorism in Europe: Tasks and*

*1980).*

بەڵام لەمادەی پێنجەمی ڕێکەوتننامەکەدا هاتووە، کەنابێت هیچ کام لە دەقەکانی ڕێکەوتنامەکە وا ڕاڤە بکرێت، کە پابەندبوون لەسەر ئەو دەوڵەتانەی ڕێکەوتننامەکەیان ئیمزا کردووە پێکدەهێنێت و بەدەستەوەدانی هەرکەسێك لەئەنجامدەرانی ئەو کردانەی، لەمادەی یەکەمی ڕێکەوتنامەکەدا هاتووە، ئەگەر هاتوو شتێك لەئارادابێت وا لەو دەوڵەتە بکات کەدەبێ کاری بەدەستەوەدانەکە ئەنجام بدات، بگاتە ئەو بڕوایەی چەند هاندەرێکی ئیدانە کردن یان سزادانی هەرکەسێکی لەپشتەوە بێت کە بەدەستەوەدانی داواکراوە، بەهۆی ڕەگەز، ئایین، ڕەگەزنامەیان ئایدیای سیاسییەوە، ڕەنگە هەڵوێستی ئەوکەسەی داواکراوە بەدەستەوە بدرێت، بەیەکێك لەم هۆیانە، کاری لێبکات. ئەمەش مانای ئەوەیە کە ڕێوشوێنی بەدەستەوەدانەکە، بەپێی مادەی (٥)ی ڕێکەوتنامەکە، بەجێهێڵرا بۆ بۆچوونی ئەو دەوڵەتانە بەجیا، بەگوێرەی ئەو بارودۆخەی پەیوەندیی بەباری پێشنیارکراوەکەوە، بۆ لێکۆڵینەوەیان بەکەسی تاوانبارکراوەوە هەیە کە بەدەستەوەدانی داواکراوە.

بۆیە مادەی حەوتەم هاتووە، بۆ بڕیاردان لەسەر پرەنسیپی بەدەستەوەدان، یان ئیدانەکردن. ئەمەش مانای وایە کە بەدەستەوەدان لێرەدا ناتەوزیمییە، بەپێی بارودۆخی هەر دەوڵەتێك و واقیعی پەیوەندیدار بەهەموو حاڵەتێکەوە بەجیا، بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی لەکاتی ڕەتکردنەوەی داوای بەدەستەوەدان، بەهەر هۆیەك بێت کە ئەو دەوڵەتە دەیبینێت، داوای لێکراوە بەدەستەوەی بدات، لەبەرئەوە پێویستە ئەنجامدەری کارەکە دادگایی بکرێت و سزا بدرێت بەگوێرەی یاساکانی تاوانکاری، وەکو ئەڵتەرناتیڤێك بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە. ئەم دەقە لەمادەی هەشتی ڕێکەوتننامەکە داوای پابەندبوونی ئەو دەوڵەتانە دەکات کە ڕێکەوتننامەکەیان مۆرکردووە، بۆ هاوکاریی و یارمەتییدانی یەکتری، لەبواری کاروباری تاوانکاریداو گرتنەبەری ڕێوشوێنی پەیوەندییدار بەو تاوانانەی ڕێکەوتننامەکە کە دەیانگرێتەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو تاوانانە مۆرکی سیاسییان پێوەبێت[١١٦].

---

[١١٦] ئەمەش لەدەقی ماددەی ٣ی پەیماننامەکەدا هاتووە، کەرانەهاتن لەگەڵ مۆرکی سیاسی تاوانەکە، وەك هۆیەك بۆ بەدەستەوەنەدان بێبەری نەبوو، لەڕەخنە لەلایەن هەندێك لەنوێنەرانی حکومیو ئەندامانو زانایانی یاسایی بەوەی کەپشت گوێ خستنی پاڵنەرە سیاسییەکان، تەنیا بەمەبەستی

سەرەڕای ئەوەی کە ڕێککەوتننامەی ئەورووپا، بۆ بنبڕکردنی تیرۆر ئەولەویەت دەدات بە بەدەستەوەدانی تاوانبار، بەتۆمەتی ئەنجامدانی تیرۆر بۆ ئەو دەوڵەتەی کە کردەکە لەقەڵەمڕەوەکەیدا ئەنجامدراوە، ئەم ڕێکەوتننامەیە بەڕێکەوتننامەی بەدەستەوەدان هەژمار نەکرێت، چونکە ئەو تایبەتمەندییەی نییە، تەنها بەسیفەتێکی لاوەکی نەبێت. لەبەرئەوەی دەقی ڕێکەوتننامەکە بەروونی دەوڵەتان پابەند ناکات، بۆ بەدەستەوەدانی ئەنجامدەرانی ئەو کردانە کە بەپێی دەقەکان سزایان لەسەر دەدرێت. بنەمای یاسایی بۆ بەدەستەوەدان لە هەموو حاڵەتێکدا، تەنها بەپەیماننامەی بەدەستەوەدان دەمێنێتەوە یان هەر بەڵگەنامەیەکی یاسایی دیکەی بەرپایە، لەبارەی ئەو کێشەیەی جێی لێکۆڵینەوەیە.

هەروەك چۆن ڕێکەوتنامەکە بوار بەهەر دەوڵەتێك دەدات کە بەدەستەوەدانی هەرکەسێکی ئەنجامدەری کردە تیرۆرییەکە ڕەتبکاتەوە، بەهۆی بوونی گومانی هاندەری سیاسی لەپشت ئەنجامدانی تاوانەکەیەوە، کە ئەوەش کاراکردنی ڕێکەوتننامەکە لاواز دەکات، وەکو ئامرازێکی یاسایی، بۆ قەڵاچۆکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی. هەروەها ڕێکەوتننامەکە جیاوازیی، لەنێوان تیرۆری نێودەوڵەتی و تیرۆری ناوخۆدا ناکات، ئەوەش وایکردوە کە هاوکاریی نێودەوڵەتی لەو بوارەدا، کارێکی قورس بێت. چونکە ڕێکەوتننامەکە تەنها یەك لایەنی لەتیرۆر چارەسەرکردوە، کە ئەویش تیرۆری سیاسیی ئاراستەکراوی دژی دەوڵەتانە، کە تیرۆری تاکەکەسی ناگرێتەوە کە، بەئامانجی ناسیاسی ئەنجام دەدرێت، یان ئەو تیرۆرەی کە دەوڵەتان پراکتیزەی دەکەن. ڕێکەوتننامەکە بەشێوەیەکی بنەڕەتی، چەق لەسەر ئەو کردە تیرۆرییانە دەبەستێت کە مۆرکی سیاسییان لەخۆگرتووە،

---

سوککردنی زیادە ڕەوی تاوانەکانەو ئەو هۆکارانەی لەپشتییەوەن، وەك ناکۆکی سیاسی کەبوونیان بۆتە هۆی تەشەنەسەندنی ئەو دیاردەیە کە بوویێتە هاندەرێك بۆ ئەنجامدانی ئەم تاوانانە. بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە: ئەو کۆمەڵە توێژینەوانەی پێشکەش کراون، بەگوێرەی (الدفاع عن الديمقراطية ضد الارهاب في اوروبا)و لەوانە:

*(strasborg, 1980), p.p4-5* *an*

*1980), p.p 4-5*

*1980), P.P. 13-*

*14.*

کە ئەنجامدەرەکانی روو دەکەنە دەوڵەتێکیتر کە کارە تیرۆرییەکە لە قەڵەمڕەوەکەیدا ئەنجام نەدراوە، بەئامانجی هەڵاتن لەدادگاو سزا. هەروەها بوونی چەندین یاسای تاوانکاریی ناوخۆ، لەگەڵ جیاوازیی ئەو یاسایانە بۆ چارەسەرکردنی یەك تاوان و بوونی چەندین رێوشوێن کە یاسایەك بڕیاری لەسەر دەدات و جیاوازیی لەشێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو تاوانانەدا، کە لەراستیدا دەبێتە هۆی تێکدان و لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی هەموو هەوڵدانێك، بۆ هاوکاریکردنی نێودەوڵەتی لەرووبەروو بوونەوەی کردەی تیرۆرییدا. لەبەر ئەوە ناتوانین بەئاسانی بڵێین کە رێکەوتنامەی ئەوروپا هەنگاوێکە بەرەو هاوکاریی نێودەوڵەتی، لەبواری قەلاچۆکردنی ئەو تاوانە تیرۆرییانەدا کە مۆرکی نێودەوڵەتییان پێوەیە، چونکە شتێکی ئەوتۆی تێدا نییە کە یەکگرتنی یاسادانانی تاوانکاریی ناوخۆیی، تایبەت بەقەلاچۆکردنی تیرۆر بگرێتەوە، بۆ دەوڵەتانی ئەندام تیایدا، وەکو هەنگاوێك بەرەو هەڵوێستی یاسایی یەکگرتوویان، بەرەو بنبڕکردنی تیرۆرو کۆتایی هاتن بە دیاردەی توندوتیژیی سیاسی و سزادانی ئەنجامدەرانی. وێڕای چەندین رەخنە کە رووبەرووی رێکەوتنامەی ئەوروپابووەوە بۆ بنبڕکردنی تیرۆر، بەلام بەیەکێك لەهەوڵە گرنگەکان دادەنرێت، بەرەو بنبڕکردنی کردە تیرۆرییەکان، لە ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراودا، لەکیشوەری ئەوروپاو، دەتوانین بڵێین هاندەر لەپشت بڕیار، لەسەردانی ئەو رێکەوتننامەیە، ئەو گۆڕانکارییەی کیشوەری ئەوروپا بووە، تاببێتە گۆڕەپانێك بۆ چەندین کردەی تیرۆری، کە لەبەر چەندهۆیەك و هاندەرێکی سیاسی ئەنجام دەدرێت، لەگەڵ شکستی کۆمەڵەی ئەوروپادا، لەسەر رێکەوتن لەسەر پێناسەیەك، بۆ کردە تیرۆرییەکان و دانانی سستمێکی کارا بۆ بنبڕکردن و قەدەغەکردنی تاوانە تیرۆرییەکان. لەلایەکی دیکەوە تەبایی نێوان دەوڵەتانی ئەندام لەئەنجومەنی ئەوروپاداو نزیکبوونەوی سستمە سیاسی و یاسایی و کۆمەلایەتییەکان، بۆ بەدیهێنانی ئەو ئاستە، لە هاوکاری لەدەقەکانی رێکەوتننامەکەدا بەرجەستەبوون[١١٧].

---

[١١٧] سەرچاوەی پێشوو، ل١٨١، لە یاسادانانی ناوخۆ بۆ قەلاچۆکردنی تاوانی تیرۆری نێودەوڵەتی، بڕوانە: د. محمود ابو الفتح الغنام، ((الارهاب وتشريعات المكافحة في الدول الديمقراطية))، ١٩٩١.

# بابەتی دووەم
# بەڵگەنامە تایبەتەکان بۆ قەدەغەکردن و سزادانی ئەو کارە تیرۆرییانەی دژی تاکەکان ئاراستەکراوەو ئەو کەسانەی لەژێر پارێزگاریی نێودەوڵەتیدان

دیاردەی تیرۆری نێودەوڵەتی، تەنها لەئاستی کارە ئاراستەکراوەکانی دژی دەوڵەتدا نەوەستا، بەڵکو توندوتیژی پەلی کێشا تارفاندنی بێ تاوان و دەست بەسەراگرتن وەك بارمتە، لە پێناوی داوای قەرەبووکردنەوە، یان گوشار خستنە سەر حکومەت، بۆ جێبەجێکردنی داوکاریی سیاسی. هەروەك چۆن دەیاردەی رفاندنی نوێنەرە دبلۆماسییەکان و دەستدرێژیی کردنە سەریان بڵاو بووەوە، ئەوەیش بوو هۆی جێی بایەخ و گرنگی پێدان، هەروەها دیاردەی رفاندن و بەبارمتەگرتن و لەسێدارەدانیان زیادی کرد، ئەگەر هاتوو ئەو حکومەتەی شاندەکەی ناردووەو ئەو حکومەتەشی میوانداریی دەکات، هەڵنەستان بەجێبەجێکردنی داوکاریی رفێنەرەکان. ئاساییە کەیاسای نێودەوڵەتی بڕیاری پارێزگاریی تایبەتی، بۆ نوێنەرە دبلۆماسییەکان بدات، هەروەها ئەو کردانەی کەرووبەڕوویان دەکرێتەوە، بەتاوان هەژمار دەکرێت و یاسای نیشتمانی لەهەموو دەوڵەتاندا سزای بۆ داناوە.

لەم ساڵانەی دواییدا، تێکۆشانێکی نێودەوڵەتی ئاشکرا بەدیکرا، بەئامانجی قەڵاچۆکردنی ئەو تاوانانەو توندکردنی سزا لەسەر ئەنجامدەرانی، لەو بارەیەوە سێ رێککەوتننامەی نێودەوڵەتی ئیمزا کرا:

١. رێککەوتننامەی قەدەکردن و سزادانی کارە تیرۆرییەکان کەشێوەی تاوانەکانی دژی خەڵك وەردەگرێت و، کردەی وەرسکردنی پەیوەندیدار پێیەوە

کەلــەخۆیداگرنگی نێودەوڵــەتی هەیــە، کــە لــە ٢ی شــوباتی ســاڵی ١٩٧١دا، لەواشنتۆن ئیمزاکرا.

٢. رێککەوتننامەی قەدەغەکردن و سزادانی تاوانە ئاراستەکراوەکان، دژی ئەو کەسانەی کەلەژێر پارێزگاریی نێودەوڵەتییدان، بەوانەوە کەنوێنەری دبلۆماسین، لە١٤ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٣دا، لەواشنتۆن مۆرکرا.

٣. رێککەوتننامــەی نێودەوڵــەتی، بــۆ بەرەنگاربوونــەوەی بەبارمتــەگرتن، کەلــە ١٧ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٩دا، لەنیۆیۆرك ئیمزا کرا.

هەریەك لەو رێککەوتننامانە، بەدرێژی باس دەکەین:

**یەکەم:** رێککەوتنامەی قەدەغەکردن و سزادانی کاری تیرۆر کەشێوەی تاوانی دژی کەسەکان لەخۆ دەگرێت و کاری وەڕسکردن کە بایەخی نێودەوڵەتی هەبێت، لەواشنتۆن لەشوباتی ١٩٧١دا ئیمزا کرا[١١٨].

بــەهۆی زیــادبوونی کــردە تیرۆرییــەکان لەکیشــوەری ئــەمریکای لاتینــداو زیــادبوونی حاڵەتــەکانی توندوتیژیــی سیاســی و دەســت درێــژی کردنــە ســەر باڵیۆزخانــەکان و رفــاندنی کەســانی دبلۆماســی، کۆمەڵــەی گشــتیی رێکخــراوی دەوڵەتانی ئەمریکا، لەخولی سێیەمی نائاسایی کۆمەڵەکە، لە واشنتۆن بەســترا، لــەماوەی ٢٥ی کــانونی دووەم بــۆ ٢ی شــوباتی ســاڵی ١٩٧١، رازیبــوو لەســەر رێکەوتننامــەی قەدەغــەکردن و ســزادانی کــردە تیرۆرییــەکان کــە لــەدژی کــەس و مرۆڤــەکان ئــەنجام دەدرێــت و، ئــەوکارە وەڕســکەرانەی بایــەخی نێودەوڵــەتی وەردەگرن[١١٩]. رێکەوتننامەکە لە پێشەکییەك و ١٣ مادده پێك دێت، کە ئامانجی

---

[١١٨] بڕوانە:

*1971 Convention to prevent and punish the Acts of Terrorism Taking the Form of Crimes against persons Related Extortion that are of International G.A, Third Special Session.*

[١١٩] ئەم رێکەوتننامەیە لەلایەن هەریەك لە: کۆلۆمبیا، کۆستاریکا، کۆمــاری دۆمینیکــان، جامایکــا، هندۆراس، مەکسیك، نیکاراگوا، پەنەما، سلڤادۆر، ترینیدادو تۆباگۆ، ویلایەتــە یــەکگرتووەکانی ئــەمریکا،

پاراستنی ئەو کەسانەیە کە بەپێی بنەمای یاسای نێودەوڵەتی، بەشێوەیەکی تایبەتی ئەندامانی شاندە دبلۆماسییەکان مافی پاراستنی تایبەتییان هەیە[١٢٠].

## ١- چوارچێوەی جێبەجێکردنی رێکەوتننامەکە:

بەپێی مادەی یەکەمی رێکەوتنامەکە، ئەو دەوڵەتانەی رێکەوتننامەکەیان مۆرکردوە، هاوکاریی یەکتر دەکەن، بۆ گرتنەبەری رێوشوێنی کاریگەرو کارا، بەگوێرەی بواری یاساو یاسادانانی تاوانکاری، لەگەڵ گرنگی پێدانی تایبەتی بەوەی کە لە رێکەوتننامەکەدا هاتووە، بۆ قەدەغەکردن و بنبڕکردنی کارە تیرۆرییەکان، بەتایبەتی رفاندن و کوشتن و دەستدرێژییەکانی دیکەش کە لەدژی ژیان و گیانی کەسەکان ئاراستەیان دەکرێت. بەگوێرەی یاسای نێودەوڵەتی، دەوڵەتەکە پابەند دەکات بە دەستەبەرکردنی پاراستنی تایبەتی بۆیان و هەروەها دژی کردە وەرسکارییەکانی کە پەیوەندییان بەو تاوانانەوە هەیە، وەك چۆن ئەو دەوڵەتانە ئەو تاوانانەیان خستۆتە نێو یاساکانی سزادانی خۆیانەوە.

وێڕای ئەوەی کە لەمادەی یەکەمدا، ئەوە راسپێردراوە کە سەرجەم کردە تیرۆرییەکانی دژی ئەو کەسانەی باسکران، بڕگەکانی ئەو رێکەوتننامەیە دەیانگرێتەوە، بەڵام مادەی دووەم لەچوارچێوەی جێبەجێکردنی رێکەوتننامەکە دیاریکراوە، لەهەندێ کردەی تیرۆریی ئاراستەکراو دژی ژیان و ئاسایشی ئەو کەسانە، بەرفاندن و کوشتن و کاری گاڵتەجاڕییەوە، ئەو تاوانانەو گرنگی پێدانی

---

ئۆرگوای و فەنزویلا ئیمزا کراوە. رێکەوتننامەکە لە ٨ی مارسی ١٩٧٣دا، چووە خانەی جێبەجێکردنەوە. لەدەقی رێکەوتننامەکە بڕوانە:

*UN General Assembly A/C.6/418, Suppl. No. 5.pp.l-4; A.J.I.L., Vol. ‹5, 1971, P.P.898-901.*

(١٢٠) ئامادەکردنی ئەم رێکەوتنامەیە لەرێگەی لیژنەی یاسایی ئەمریکی سەر بەرێکخراوی دەوڵەتانی ئەمریکا(OAS)تەواوکراو لەسەر داوای کۆمەڵەی گشتیی ئەو رێکخراوە، بەپێی بڕیارێك کە لە ٣٠ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٧٣دا دەرچوو، بڕوانە:

*Resolution AG/Res. 4(1/70). Rev. 1 OAS (official Records) ser. P.*

نێودەوڵەتی بەو تاوانانە، بەبێ رەچاوکردنی ئەو هاندەرانەی کە بوونەتە هۆی ئەنجامدانی، یان هۆکارە شاراوەکانی پشتەوەی.

**٢ـ دەسەڵاتی دادوەری:**

لەمادەی پێنجەمی رێکەوتننامەکەدا، بڕیار لەسەر ئەوە دراوە کە ئەگەر ئەو دەوڵەتانەی رێکەوتننامەکەیان ئیمزا کردوە، رێوشوێنی بەدەستەوەدان رەتدەکەنەوە، لەبەر ئەوەی تاوانبار بەئەنجامدانی تاوانەکەی کە لەمادەی دووەمدا بڕیاری لەسەر دراوە هەڵگری رەگەزنامەی خۆیەتی، یان لەبەر هەر هۆیەکی یاسایی، یان دەستووری دیکەبێت، دەبێت ئەو دەوڵەتە پابەند بێت بەرەوانەکردنی کێشەکە بۆ دەسەڵاتە پسپۆرییەکان، بۆ گرتنەبەری رێوشوێنی گونجاو، بۆ دادگایکردنی تاوانبارەکە، هەروەك ئەوەی تاوانەکە لە قەڵەمڕەوەکەیدا ئەنجام درابێت. پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتەی کە تاوانبارەکە لە قەڵەمڕەوەکەیدایەو بەدەستەوەدانی رەتدەکاتەوە، لەبەر هەر هۆیەك بێت هەستێت بە ئاگادارکردنی دەوڵەتەکەی کە داوای بەدەستەوەدان دەکات، بەگرتنە بەری رێوشوێنی گونجاو، بۆ سزادانی ئەنجامدەرانی تاوانبارییەکە، بەپێی بنەمای یاساو رێسا کارپێکراوەکانی.

لەپێناو پشتگیریکردنی هاوکاریی نێوان دەوڵەتان، بۆ قەدەغەکردن و سزادانی ئەو تاوانانەی بڕیاریان لەسەردراوە لە رێکەوتننامەکەدا، مادەی هەشتەم بڕیاری لەسەر پابەندبوونی ئەو دەوڵەتانە داوە، بەگرتنەبەری سەرجەم رێوشوێنی گونجاو، بۆ قەدەغەکردنی ئامادەکاری ئەو تاوانانە، لە قەڵەمڕەوەکانی سەر بەوانداو، ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری و تاوتوێکردنی رێوشوێنە کارگێڕییەکان بکەن کە تایبەتن، بەپاراستنی کارای ئەوکەسانەی ئاماژەیان پێکراوە لە ماددەی

دووەمداو، تاوانبارکردنی ئەو کردانە لەیاسادانانی نیشتمانیدا، ووەڵامدانەوەی داواکارییەکانی بەدەستەوەدان لە نزیکترین کاتدا[١٢١].

## ٣- بەدەستەوەدان:

مادەی سێیەمی رێکەوتننامەکە، رێگە دەدات بە بەدەستەوەدانی کەسانی تاوانبار کە ئەنجامدانی هەر تاوانێك کە لەمادەی دووەمدا بڕیاری لەسەر دراوە، ئەویش بەپێی دەقەکانی پەیماننامەکانی بەدەستەوەدان کە لەنێوان ئەو دەوڵەتانەو، یان بەپێی یاساو رێسا ناوخۆییەکانیان بەرپایە.

هەرچەندە رێکەوتننامەکە، لەچوارچێوەی رێکخراوی دەوڵەتانی ئەورووپادا بڕیاری لەسەر دراوە، بەڵام بوار دەدات بەهەموو دەوڵەتانی ئەندامی نەتەوەیەکگرتووەکان و رێکخراوە تایبەتەکانی سەربە دەوڵەتانی ئەندام لەپەیڕەو پرۆگرامی دادگای نێودەوڵەتیدان، یان هەر دەوڵەتێك کە کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەککگرتووەکان بانگهێشتی بکات بۆ ئیمزا کردنی رێکەتننامەکە[١٢٢].

---

[١٢١] هاوکاریکردنی ئەو دەوڵەتانەی رێکەوتنامەکەیان ئیمزا کردوە، کە لەمادەی(٨)دا بڕیاری لەسەر دراوە، بۆ قەدەغەکردن و سزادانی کردە تیرۆرییەکان کە لەمادەی دووەمی رێکەوتننامەکەدا ئاماژەی پێکراوە، ئەم رێوشوێنانە دەگرێتەوە:

١. گرتنەبەری رێوشوێنی گونجاو لەدەسەڵاتی هەموو دەوڵەتێك، لەچوارچێوەی یاساداناني نیشتمانیدا.

٢. ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری و رێوشوێنە کارگێڕییەکان کە بەئامانجی پاراستنی ئەو کەسانەی ئاماژەیان بۆکراوە، لەمادەی دووەمی رێکەوتننامەکەدا وەرگیراوە.

٣. پێویستە ولاتانی پەیماننامەکە مافی تەواوی ئەوکەسە دابین بکات کە ئازادیی سنووردار دەکات، بەهۆی جێبەجێکردنی ئەم رێکەوتننامەیە، بۆ ئەوەی بتوانێت داکۆکی لەمافی خۆی بکات.

٤. ئەو تاوانانەی لەرێکەوتننامەکەدا هاتوون، بخرێنە نێو یاساداناني تاوانکاریی ولاتانی رێکەوتننامەکەوە.

٥. خێرایی لەوەڵامدانەوەی داواکارییەکانی بەدەستەوەدانی، تایبەت بەوتاوانانەی لەرێکەوتننامەکەدا هاتوون.

[١٢٢] مادەی (٩) لە رێکەوتننامەکە.

تێبینی دەکرێت رێکەوتننامەکە، ئەو کۆمەڵە کردەیەی لەخۆنەگرتووە، کە تاوانەکانی لێ پێك دێت، بەپێی دەقەکانی(Corpa Delecti)و، هەروەها لەمادەی دووەمدا، وشەی پاراستنی تایبەتی(Special Protection) هاتووە، بەبێ ئەوەی مەبەست لەپاراستنی تایبەت، یان ئەوکەسانە کێن کەمافی ئەو پاراستنەیان هەیە روون بکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا رێکەوتننامەکە، بەهەنگاوێکی ئیجابی هەژمار دەکرێت، بەرەو تاوانبارکردنی ئەو کردە تیرۆرییانەی کەجێی گرنگی پێدانی نێودەوڵەتی و، رێکخستنی هاوکاریکردنی نێودەوڵەتی و سزادانی ئەو تاوانانەن.

دووەم: رێکەوتننامەی رێگەگرتن و سزادانی ئەو تاوانانەی ئاراستەی ئەوکەسانە دەکرێن کە لەژێر پارێزگاریی نێودەوڵەتیدان، بەکەسانی دبلۆماسییەوە، کە لە نیویۆرك لە ١٤ی کانونی یەکەمی ١٩٧٣دا مۆرکراوە[١٢٣].

لەگەڵ زیادبوونی کارەکانی توندوتیژی دژی ئەندامانی کونسوڵگەرییەکان و، رووبەڕووبوونەوەیان بۆ کردەی تیرۆری، لەشوێنە جیاجیاکانی جیهاندا، ژمارەیەك لەو دەوڵەتانەی ئەندامن لەرێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، پێشنیاریان پێشکەشکردوە، بە مەبەستی چڕکردنەوەو زیاتر پابەندبوونی دەوڵەتان، لەبواری پاراستنی کەسانی دبلۆماسی.

لەسێی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧١دا، کۆمەڵەی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان رازیبوو لە سەر بڕیاری ژمارە ٢٧٨٠ کە بەوپێیە داوا لە

---

(١٢٣) بڕوانە:

*Convention on the Prevention and Punishment of Crimes against Internationally protected persons, including Diplomatic Agents.*

بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە:

*A/RES/3166(XXVILL)*

ئەم رێکەوتننامەیە پەسەندکرا لە ١٤ی کانونی یەکەمی ١٩٧٣و. لە ٢٠ی شوباتی ١٩٧٧دا جێبەجێکراو ژمارەی ئەو وڵاتانەی بڕیاریان لەسەردا یان چوونە ریزییەوە، تا ١٦ی حوزەیرانی ١٩٩١و لە ٢٥ی کانوونی دوەمی ١٩٨٦دا میسر، چووە ریزی ئەم رێکەوتننامەیەوە. لەدەقی رێکەوتننامەکە، بڕوانە:
*U.N.T.S., Vol. 1035, No. 154/0.*

لیژنـەی یاسـای نێودەولـەتی سـەربە کۆمەڵەکـە کـرا، بـۆ ئامـادەکردنی پـرۆژەی ڕێکەوتننامەیـەك، سـەبارەت بەپێـەوکردنی ڕێگـەکانی پاراسـتن و بـەرگریکردن لەوانەی مافی پاراستنی تایبەتییان هەیە، بەپێی یاسای نێودەوڵەتی، بەمەرجێ لەخولی داهاتوودا پێشکەش بەکۆمەڵە بکرێت.[١٢٤]

لیژنـەی یاسـای نێودەوڵـەتی، لـەخولی ٢٧ی کۆمەڵەکـەدا، پـرۆژەی ڕێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی، بۆ پاراستنی ئەو کەسانە خستەڕوو کە لەژێر پارێزگاریی نێودەوڵەتیدان، بەڵام ڕەزامەندیی کۆمەڵەی گشتیی بەدەست نەهێنا، و خرایە خولی داهاتوو. هەندێ ڕاستکردنەوە لەپرۆژەی ڕێککەوتننامەکەدا کرا، و لیژنەکە لەخولی ٢٨مدا، پێشکەشی بە کۆمەڵەکە کردەوەو بەپێی بڕیاری ژمارە ٣١٦٦ی ١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٣ ڕەزامەندی لەسەردا، ڕێککەوتننامەکە لەپێشەکییەك و ٢٠ مادە پێکهاتووە.

## ١- چوارچێوەی جێبەجێکردنی ڕێککەوتنامەکە:

ڕێککەوتنامەکە لەمادەی یەکەمدا، مەبەستی لەو کەسانەی کەمافی پاراستنی نێودەوڵەتیان هەیە دیاریکردوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

أ. سەرۆکی دەوڵەتان، و هەر ئەندامێك لەلیژنەیەکدا بەپێی دەستووری ئەو وڵاتە، ئەرکی سەرۆکی دەوڵەت و، هەموو سەرۆکی حکومەت یان وەزیرانی دەرەوەی بیانی بەڕێوە دەبات، کاتێك کە یەکێك لەوانە لە دەوڵەتێکی بیانیدا بن و، هەروەها ئەندامانی خێزانەکانیان کە لەگەڵیاندا بێت.

ب. هەموو نوێنەر یان کارمەندێك، یان کەسێك کە کاری ڕەسمی دەکات بۆ دەوڵەت، یان هەرکەسێکی‌تر کە نوێنەری ڕێکخراوێکی حکومی بێت، بەپێی یاسای نێودەوڵەتی مافی پاراستنی نێودەوڵەتی دەبێت، لەکات و شوێنی ئەنجامدانی تاوان دژی خودی ئەو، یان دژی بارەگا ڕەسمییەکان، یان شوێنی تایبەتی نیشتەجێبوونی، یان دژی هۆیەکانی گواستنەوەی، بەپارێزگارییەکی

---

[١٢٤] بڕوانە:

*UN General Assembly Resolution 2780 (XXVI), 3 December, 1971*

تایبەتی دژی دەستدرێژی کردنە سەر کەسەکە، یان ئازادییەکانی، یان شکۆمەندیی کەسەکەو، هەروەها دژی ئەندامانی خێزانەکەی.

**مادەی دووەم/** ئەو دەست درێژییانە دیاری دەکات کە بڕگەکانی ڕێکەوتننامەکە دەیگرێتەوە، ئەویش دەستدرێژی کردنی بەئەنقەست، کە بەپێی یاسادانانی ناوخۆی دەوڵەتانی ئەندامانی ڕێکەوتنامەکە، تاوانەکانی لێپێك دێتو، ئەمانە دەگرێتەوە:

ا. کوشتنی کەسێك کە مافی پاراستنی نێودەوڵەتی هەبێت، یان ڕفاندنی، یان هەر دەست درێژی کردنێکی‌تر لەدژی کەسەکەو ئازادییەکانی.

ب. هەر دەستدرێژیکردنێکی توندوتیژ، بۆسەر بارەگای کاری ڕەسمی ئەوکەسەی کە مافی پاراستنی نێودەوڵەتی هەیە، یا شوێنی نیشتەجێبوونی، یان بۆسەر هۆیەکانی گواستنەوەی کە کەسەکەو ئازادییەکانی ڕووبەڕووی مەترسی دەکاتەوە.

جـ. هەڕەشەکردن بە مەبەستی ئەنجامدانی هەر دەستدرێژییەکی لەوجۆرە.

د. هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی هەر دەستدرێژییەکی لەو جۆرە.

هـ. هەر ڕێك کە بەشداریکردن لەو دەست درێژییانە دادەنرێت.

## ٢ـ دەسەڵاتی دادوەری:

مادەی سێیەمی ڕێکەوتننامەکە، هەموو دەوڵەتانی ئەندام پابەند دەکات، بەگرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست، بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی دادوەری، بەو تاوانانەی لە مادەی دووەمدا بڕیاری لەسەر دراوەو، هەروەها ئەگەر کەسێك تاوانێك ئەنجام بدات لەسەر فڕۆکە یان کەشتییەك کە ئاڵاکەی بەرزکردبێتەوە[١٢٥] یان تاوانبارە بەئەنجامدانی تاوانەکە کە هەڵگری ڕەگەزنامەی ئەو دەوڵەتەیە[١٢٦]، یان کاتێك تاوانێك دژی ئەو کەسانە ئەنجام دەدرێت کە مافی پارێزگاریی

---

[١٢٥] مادەی ٣/ب ی ڕێکەوتننامەی نیویۆرك.

[١٢٦] مادەی ٣/ج لە ڕێکەوتننامەی نیویۆرك.

نێودەوڵەتییان هەیە، لەکاتی ئەنجامدانی ئەرکەکانیان بەناوی ئەو دەوڵەتەوە[127]، یان کاتێك کەسێکی تاوانبار، بە ئەنجامدانی تاوان لەقەڵەمڕەوەکەیدا، بێت و لەبەر هەر هۆیەك بێت نەیەوێت بیدات بەدەستی ئەو دەوڵەتەی کە داوای دەکات[128].

رێکەوتننامەکە بریاری بۆ ئەو سزا دیاریکراوانە لەخۆنەگرتووە کە بەسەر ئەنجامدەرانی ئەو تاوانکارییانەی کە لەمادەی دووەمدا هاتوون، تەنها بەوەوە وەستاوەتەوە کە کارەکە رەوانەی یاساکانی دەوڵەتی پەیوەندیدار بکات، لەگەڵ پابەندکردنی، بەپێویستی سەپاندنی سزای توند، بەسەر ئەنجامدەرانی ئەو کردانە بەجۆرێ کە لەگەڵ مەترسی تاوانەکەدا بگونجێن. هەروەها رێکەوتننامەکە دەوڵەتانی ئەندامی پابەندکرد، بەگرتنەبەری رێوشوێنی گونجاو، بۆ بنبرکردنی ئەنجامدانی ئەو تاوانانەی لە رێکەوتننامەکەدا بریاریان لەسەردراوە لەو قەڵەمڕەوەی کە لە ژێر دەسەڵاتی خۆیدایە، چ ئەو تاوانانە لەناوخۆیان لە دەرەوەی ئەو قەڵەمڕەوەدا ئەنجام درابن، لەگەڵ هاوکاریکردنی لەقەڵاچۆکردنی ئەو تاوانانە، لەرێگەی ئاڵوگۆڕکردنی زانیارییەکانی پەیوەندیدار بەکردە تیرۆریستییەکان و ئەنجامدەرانی و هاوئاهەنگی رێوشوێنی یاسادانان و کارگێری و هونەری بۆ بنبرکردنی.

## ٣- بەدەستەوەدان:

مادەی حەوتەمی پەیماننامەکە ئاماژە دەکات، بۆ ئەوەی ئەگەر بێت و لەحاڵەتێکدا هیچ کام لەو دەوڵەتانە، تاوانبارانیان بەدەستەوە نەدەن، بەپێی دەقی رێکەوتننامەکە کە لەبەر هەر هۆیەك بێت، ئەوکاتە پێویستە لەسەری لەلایەن خۆیەوە بەخێرایی رەوانەی دەسەڵاتە تایبەتمەندەکانی خۆی، بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵیاندا بکات، بەپێی ئەو رێوشوێنانەی لەیاسای نیشتمانی خۆیدا هاتووە.

**سێیەم:** رێکەوتننامەی نێودەوڵەتی بۆ بەگژداچوونەوەی بەبارمتەگرتن کە لە نیویۆرك لە ١٧ی کانونی یەکەمی ١٩٧٩دا مۆرکرا[129].

---

[127] مادەی ٣/٢ لە رێکەوتننامەی نیویۆرك.

[128] مادەی ٣/٢ لە رێکەوتننامەکە.

دیاردەی رفاندنو بەبارمتەگرتن بلاوبووەوەو، بەکارهێنانیان وەکو ئامرازێك بۆ گوشـارو وەرسـکردنی دەوڵـەتانو حکومەتـەکان، لـەپێناوی جێبـەجێکردنی داواکـاریی رفێنـەرەکاندا، ئـەم دیـاردە تاوانکارییانـە لـەم سـالأنەی دواییـدا، توندوتیژیو بێ بەزەییو فەرامۆشکردنی بەهاو هەستە مرۆییەکانی پێوەدیارە، کە کۆمەڵێکی زۆر لەمرۆڤ بوونە قوربانی [(١٣٠)] و. تاوانی رفاندنو بەبارمتـەگرتن بەکردەی تیرۆر هەژمار دەکرێتو، دەچێتە چوارچێوەی سزا سەپاندن بەسەریدا، لە یاسا نیشتمانییەکانی هـەر دەوڵـەتێکی پـەیوەندیدارو، دەچێتـە چوارچێوەی زۆربەی رێکەوتننامـە نێودەوڵەتییـەکانی پـەیوەندیدار بەقەدەغـەکردنو سزادانی تـاوانی تـیرۆریی نێودەوڵەتییـەوە. لەگـەڵ ئەوەشـدا، حکومـەتی یـەککگرتووی ئەڵمانیا، لەئەنجامدانی داگیرکردنی باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا لە ستۆکهۆڵم، لە ٢٤ی نیسانی ساڵی ١٩٧٥، لەلایەن رێکخراوی هۆلگەرمینز (Holger)، داوای دانانی بابەتی داڕشتنی رێکەوتننامەیەك بۆ بەگژداچوونەوەی دیاردەی رفاندنی کـرد،

---

(١٢٩) ئەم رێکەوتننامەیە لـە ٣ی کـانونی دووەمـی سـاڵی ١٩٨٣دا چـووە خانـەی جێبەجێکردنـەوەو، ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی کە مۆریان کرد، یان چوونە ریزییەوە تا ١٦ی حوزەیرانی ١٩٩١، گەیشتە ٦٥ دەوڵـەتو، وەمیسریش لە ١٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٠دا ئیمزای کردو لـە ٢ی ئـەیلولی سـاڵی ١٩٨٠دا بڕیاریان لەسەردا. سەبارەت بە دەقی رێکەوتننامەکەن بڕوانە:

*GA RES. 34/146, Annex, 17 December 1979; YUN 1979, P.1144.*

(١٣٠) دیارترین پرۆسەکانی رفاندنو بەبارمتەگرتنی ئەندامانی شاندی وەرزشی ئیسرائیلی، لە خولی ئۆلۆمپیـی لـە (میونیـخ)ی ئـەڵمانیای رۆژئـاوا، لـە سـاڵی ١٩٧٢دا، بـەهۆی گروپێـك لـە ئـەندامانی سـەر بەرێکخراوی ئەیلولی رەشو، بەبارمتەگرتنی ژمارەیەك لە دبلۆماتەکان، لە باڵیۆزخانەی سعودیە لەخەرتووم لەسـاڵی ١٩٧٣داو دەسـت بەسـەرکردنی وەزیرەکـانی پـترۆڵی رێکخـراوی ئۆپیـك، وەکـو بارمتـە لـەکاتی کۆبوونـەوەیاندا لـە ڤییـەنا سـاڵی ١٩٧٥و گواسـتنەوەیان بەفڕۆکەیـەك بـۆ جـەزائیر، لەسـەر داوای رفێنەرەکانو، رفاندنی ئەلدومۆرۆی سیاسەتمەداری ئیتالی، لەرێگەی گروپێکی سەر بەرێکخراوی (الألویة الحمراء) پاش ئەوەش کوشتنیو. رفاندنی هانز چیللـەری ئـەڵمانیو تیرۆرکردنی لەلایەن کۆمەڵەی بادر- ماینهۆفی تیرۆریستییەوە.

بڕوانە کتێبی(الارهاب الدولی)، د. عبد العزیز مخیمر عبدالهادی، سەرچاوەی ئامـاژەپێکراوی پێشوو، پەراوێز ١٨٩.

لەخشتەی کارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، لەخولی ٣١ی ساڵی ١٩٧٦دا[١٣١].
حکومەتی ئەڵمانیا پرۆژەی ڕێکەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی، بۆ بنبرکردنی کردە تیرۆرییەکان خستەروو، بۆ مەسەلەی بەبارمتەگرتن، تا ببێتە بنەمایەك بۆ وتوێژکردن سەبارەت بەو مەسەلەیە.

کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەپێی بڕیاری ١٠٣/٣١ی ١٥ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٦ ڕازیبوو لەسەر پێکهێنانی لیژنەیەکی تایبەت، بۆ دانانی پرۆژەی ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی، بۆ بەرەنگاربوونەوەی بەبارمتەگرتن، کە لەخولی دووهەمی کۆمەڵەکەدا بخرێتە ڕوو[١٣٢].

لیژنەکە لەماوەی ١-١٩ی مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٧٧دا کۆبووەوە، بۆ تاوتوێکردنی پرۆژەی ئەو ڕێکەوتننامەیەی کە ئەڵمانیا پێشکەشی کردو هەندێ پێشنیاری دیکە کە دەوڵەتان، سەبارەت بەمەسەلەکە پێشکەشیان کردبوو. وێڕای ئەو کۆسپ و لەمپەرانەی هاتە بەردەم لیژنەکە، بەهۆی جیاوازیی هەڵوێستی دەوڵەتانەوە، سەبارەت بەپێناسەی بەبارمتەگرتن و چوارچێوەی جێبەجێکردنی و، تێکۆشان نێودەوڵەتی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانی، بۆ ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی، تایبەت بە بەرەنگاربوونەوەی بەبارمتەگرتنی ١٧ی‌ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٧ی لێکەوتەوە[١٣٣].

---

[١٣١] بڕوانە:

*A/ 31/242.*

[١٣٢] لیژنەکە لە ٣٥ نوێنەری دەوڵەتانی ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان پێك هاتووە، ئەوانیش: جەزائیر، باربادۆس، ڕوسیای سپی، کەنەدا، چیللی، لیبیا، مەکسیك، نەیجیریا، دانیمارك، میسر، فەرەنسا، بەریتانیا، ئێران، ئیتالیا، یابان، ئەردەن، کینیا، لیسیۆتۆ، یەمەن، فلیپین، پۆڵەندا، سوریا، سوماڵ، سوید، هۆڵەندا، نیکاراگوای، ویلایەتە یەکگرتووەکان، یەکێتی سۆڤیەت، تەنزانیا، فەنزوەیلا، ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، یۆگۆسلافیاو بولگاریا.

[١٣٣] لەقۆناغەکانی داڕشتنی ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی بۆ بەگژداچوونەوەی بەبارمتەگرتن، بڕوانە: (تقرير اللجنة السادسة)، ١٣ی کانونی یەکەم لە بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان ژمارە A/4/819.

## ١- چوارچێوەی جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەکە:

مادەی یەکەمی ڕێکەتنامەکە، تاوانی بەبارمتەگرتن بەوە پێناسە دەکات کە کەسێك هەستێت بەگرتنی کەسێکی ترو بەندکردنی و دەست بەسەرکردنی و یان هەرەشەی کوشتنی لێبکات، یان لەرووی جەستەییەوە، ئازارو ئەشکەنجەی بدات، یان بەردەوام بێت لەسەر دەست بەسەرکردنی، بەمەبەستی ناچارکردنی لایەنی سێیەم، چ دەوڵەت بێت یان ڕێکخراوی حکومی نێودەوڵەتی، یان کەسێکی ئاسایی یان ئیعتیبار بۆکراو، یان کۆمەڵە کەسێك، تا هەستێت بەکارێکی دیاریکراو، وەکو مەرجێکی ئاشکرا یان شاراوە، بۆ رزگارکردنی ئەو کەسە بارمتەیە.[١٣٤] هەروەها ئەو کەسەش بەئەنجامدەری تاوانی دەست بەسەرکردن هەژمار دەکرێت کە دەست دەکات بەئەنجامدانی هەر کردەیەك لەکردەکانی بەبارمتەگرتن، یان هاوبەشیی لەو کردانەدا دەکات بەسیفەتی بەشداریکردن یان دەستپێکردنی، لەگەڵ هەرکەسێك کە تاوانەکە ئەنجام دەدات[١٣٥] بەپێی مادەی دووەمی ڕێکەوتننامەکە، دەوڵەتانی ئەندام پابەند دەکرێن، بەدانانی ئەو تاوانانەی لە مادەی یەکەمدا لەیاسا نیشتمانییەکانیداو، سزادانی بەجۆرێك کە لەگەڵ مەترسی تاوانەکەدا بگونجێ[١٣٦].

برگەکانی ڕێکەوتننامەکە تەنها بەسەر تاوانی دەست بەسەرکردندا جێبەجێدەکرێت کە مۆرکێکی نێودەوڵەتییان هەیە، واتە کە ڕەگەزێکی دەرەکی یان نێودەوڵەتی لەخۆبگرن و. ئەو تاوانەی کە لەنێو قەڵەمڕەوی یەك دەوڵەتدا

---

(١٣٤) مادەی ١/١ لە ڕێکەوتننامەکە.

(١٣٥) مادەی لە ڕێکەوتننامەکە.

(١٣٦) مادەی دووەمی ڕێکەوتننامەکە بڕیاری لەسەر ئەوە داوە: کە دەبێت هەموو دەوڵەتانی ئەندام، ئەو سزایانەی لەمادەی یەکەمدا دیاریکراون، بەتاوانگەلێك دابنێن کە سزای گونجاوی بۆ دیاری بکرێت بەرەچاوکردنی ماکی ترسناکی ئەو تاوانانە.

(١٣٧) مادەی ١٣ی ڕێکەوتننامەکە.

دەبێــت، لــەچوارچێوەی رێکەوتننامەکــە دەردەچێــت و دەکەوێتــە ژێــر بــاری یاسادانانی نیشتمانی ئەو دەوڵەتەوە. ئەگەر تاوانەکە بەتەواوی لەنێو قەڵەمرەوی یەك دەوڵەتدا ئەنجامدراو، ئەنجامدەرەکەو دەست بەسەرکراوەکە، هاووڵاتیی ئەو دەوڵەتــە بــوون و، تاوانبــار نــەیتوانی لەســنووری دەوڵەتەکەیــەوە هــەڵبێت بــۆ دەوڵەتێکی تـر، ئەوا لـەو بارەدا تاوانەکە بەتاوانی ناوخۆیی هـەژمار دەکرێـت و دەکەوێتــە ژێــر بــاری یاســادانانی نیشــتمانی دەوڵەتەکــە خۆیــەوە، دادگــای ئــەو دەوڵەتە لە لێپێچینەوەیدا دەسەڵاتی دەبێت(١٣٧).

رەنگــە گرنگــترین ئــەو مەســەلانەی کــە رێکەوتننامەکــە لــەخۆی دەگرێــت، چارەسەرکردنی مەسەلەی بەبارمتەگرتن، لەکاتی ململانێی چەکدارییدا بێت کە رێکەوتننامەی جنێڤی ساڵی ١٩٤٩و هەروەها لەپرۆتۆکۆڵەکانی دیکەدا چارەسەر کراوە. پرۆسەکانی بەبارمتەگرتن کە لەسەرو بەندی ئەو ململانێ چەکدارییانەی کــە مۆرکــی نێودەوڵــەتییان پێوەیــە، دوور خراوەتــەوە، لــەچوارچێوەی جێبەجێکردنی رێکەوتننامەکە، ئەو ململانێ چەکدارییانە، دەچنە چوارچێوەی برگەی چوارەمی مادەی یەکەمی پرۆتۆکۆڵی یەکەمی ساڵی ١٩٧٧ کە پەیوەندیی بەکردەی خەباتی چەکدارییەوە هەیە کە گەلان بەرپای دەکەن، لەدژی دەسەڵاتی داگیرکەرو داگیرکردنی بیانی و سستمی حوکمرانی رەگەزپەرستی فەرمانرەوا، بۆ پراکتــیزەکردنی مــافی چارەنووســیان، هــەروەکو چــۆن بەڵگەنامــەی نەتەوەیەکگرتووەکان و جارنامەی پرەنسیپی یاسـای نێودەوڵـەتی، پەیوەسـت بەپەیوەندیی و تەبایی و هاوکاری، لەنێوان دەوڵەتاندا بەرجەستە دەکات، بەپێی بەڵگەنامەی نەتــەوە یــەکگرتووەکان(١٣٨). رێکەوتننامەکە لەم بارەیەوە، جەخت لەســەر رەوابوونــی خــەباتی چــەکداریی پــەیوەندیدار، بــەمافی دیــاریکردنی چارەنووسەوە دەکاتەوەو، دانەنانی ئەو پرۆسانەی کە رێکخراوە سەربەخۆیی خوازە نیشتمانیەکان پێی هەڵدەسن، لە چوارچێوەی کردە تیرۆریستییەکاندا، ئەمەش بۆتە هۆی وروژاندنی وتووێژ لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتییدا، بەهۆی

---

(١٣٨) مادەی ١/٨ لە رێکەوتننامەکە.

جیاوازیی بیرو بۆچوونە سیاسییەکان، لەنێوان دەوڵەتان بەشێوەیەکی تایبەتی لەم مەسەلەیەدا.

## ٢ـ دەسەڵاتی دادوەری:

ڕێکەوتننامەکە پرەنسیپی بەدەستەوەدان، یان دادگایکردن دەگرێتەبەر، لە چوارچێوەی بنبڕکردن و نەهێشتنی تاوانی دەست بەسەراگرتنی بەبارمتە گیراوەکان. هەردەوڵەتێکی ئەندامی ڕێکەوتننامەکە، پابەند دەکرێت کە بەدەستەوەدانی ئەو کەسە لەقەڵەمرەویدا رەتبکاتەوە، کە تاوانی ئەنجامدانی یەکێك لەدیاریکراوەکانی مادەی یەکەمی لەئەستۆدایە، بەرەوانەکردنی بۆ دەسەڵاتدارانی پسپۆر لەو بوارەدا، بۆ دادگایکردنی و سزادانی بەپێی بنەما یاساییە نیشتمانیەکانی[١٣٩]. هەروەها هەریەك لە دەوڵەتانی ئەندامی ڕێکەوتننامەکە پابەند دەکرێت، کە قەڵەمرەوەکەیدا، کەسێك هەبێت تاوانی ئەنجامدانی بەبارمتەگرتنی لەئەستۆدا بێت، ئەوکاتەی قەناعەتی پێدەکات کە بارودۆخێکی ئەوتۆ بێتە ئاراوە پێویست بە پاساودان بکات، بۆ دەستگیرکردنی یان گرتنەبەری ڕێوشوێنیتر، بەپێی یاساکانی، بۆ زامن کردنی مانەوەی بەدرێژایی کاتی پێویست، بۆ ئەنجامدانی گرتنەبەری ڕێوشوێنی تاوانکاری یان ڕێوشوێنی بەدەستەوەدان، هەروەها پابەند دەکرێت، بۆ دوانەخستنی ڕێوشوێنی لێکۆڵینەوەیەکی سەرەتایی، لەسەر چۆنیەتی ڕووداوەکە[١٤٠]. ڕێوشوێنی بەندکردنی، یان ڕێوشوێنی دیکە، بەبێ دواکەوتن بکات، چ بەشێوەی ڕاستەوخۆ بێت، یان بەهۆی سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، بۆ دەوڵەتەکە، یان دەوڵەتی پەیوەندیدار، یان ڕێکخراوێکی حکومی نێودەوڵەتی کەوا زۆر لێکردنەکەی ئاراستەکردوە، یان کردوویەتی بە یاسا لەدژی[١٤١].

---

[١٣٩] مادەی ١/٨ لە ڕێکەوتننامەکە.

[١٤٠] مادەی ١/٦ لە ڕێکەوتننامەکە.

[١٤١] مادەی ٢/٦ لە ڕێکەوتننامەکە.

هەموو دەوڵەتانی ئەندامی ڕێکەوتننامەکە، ڕێوشوێنی گونجاو دەگرنەبەر، بۆ پیادەکردنی دەسەڵاتی دادگایی خۆیان، لەسەر هەر تاوانێك لەو تاوانانەی لەمادەی یەکەمدا دیاریکراوە، ئەگەر لەقەڵەمرەوی ئەو دەوڵەتەدا ئەنجامدرا، لەناو کەشتی یان فرۆکەیەك کە لەسەری تۆمارکرابێت، یان لەلایەن هاووڵاتییەکەوە، یان لەلایەن کەسێکی بێ ڕەگەزنامە، لەوانەی شوێنی نیشتەجێبیان لەقەڵەمرەوەکەیدا بێت، ئەگەر ئەو وڵاتە ئەوەی بەگونجاو زانی[142]. دەسەڵاتی دادوەریی لەسەر ئەوەش بریار دەدات، ئەگەر تاوانەکە ئەنجامدرا، لەپێناوی ناچارکردنی ئەو دەوڵەتە بۆ هەستان بەکارێکی دیاریکراو، یان ئەنجام نەدانی، یان ئاراستەکرابێت بۆ بارمتەیەك لە هاووڵاتییانی ئەو دەوڵەتە، ئەگەر ئەو دەوڵەتە ئەوەی بەگونجاو زانی[143].

---

[142] مادەی ١/٥ ا،ب لە ڕێکەوتننامەکە.

[143] مادەی ١/٥ ج لەڕێکەوتننامەکە. لەمادەی پێنجەمیدا چوار حاڵەت بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی دادگایی هاتووە کە ئەمانەن:

١. دەسەڵاتی ئیقلیمی (*Territorail Jurisdiction*) کە دەسەڵاتی دادگایی دەوڵەتەکە دەچەسپێنێ کە تاوانەکە لەقەڵەمرەوەکەیدا ئەنجامدراوە.

٢. دەسەڵاتی پۆزەتیڤی کەسێتی(*Active personality Jurisdiction*) کە دەسەڵاتی دادگای دەوڵەتەکە دەچەسپێنێ کە ئەنجامدەری تاوانەکە، یەکێك بێت لە هاووڵاتییانی ئەو دەوڵەتە.

٣. چەسپاندنی دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتەی بەر کاری تیرۆریستییانە دەکەوێت، کە ئەو کەسانەی بەبارمتە گیراوەکانیان لەبەردەستدایە هەڵسن بەکارێك، یان مل نەدان بۆ ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو.

٤. دەسەڵاتی نێگەتیڤی کەسێتی(*Passive Personality Jurisdiction*)کە دەسەڵاتی دەوڵەتەکە دەچەسپێنێت کە بارمتەگیراوەکە یان دەست بەسەرکراوەکە یەکێك بێت لەهاووڵاتییەکانی.

ڕێکەوتننامەکە نەگەیشتە ئەولەویەتی دەسەڵات لەو چوار حاڵەتەی باسکرا، جگە لەوەی ڕەنگە ئەولەویەتا لەسەر ڕێکخستنی حاڵەتەکانی کە لەمادەی پێنجەمدا هاتووە دیاری بکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مادەیە بووە هۆی وروژاندنی جیاوازیی، لەنێوان ئەندامانی لیژنەکە، کە لەکاتی وتووێژکردنی پرۆژەی ڕێکەوتننامەکەدا، هەندێك لەئەندامانی نوێنەرانی دەوڵەتانی عەرەبی پێیان وابوو کە ئەولەویەتی چەسپاندنی دەسەلات بۆ حاڵەتی یەکەمو دووەمە، لەگەڵ دەرخستنی نارەحەتی، لەلایەن هەندێکیانەوە بەرهەڵستی لەسەر هەردوو حاڵەتی سێیەمو چوارەم لەدەقی مادەی پێنجەمدا دەکرێت.

هەروەها هەموو دەوڵەتانی ئەندامی ڕێکەوتننامەکە، ڕێوشوێنی گونجاو دەگرنەبەر، بۆ دیاریکردنی دەسەڵاتی دادگایی، لەسەر ئەو تاوانانەی کە لەمادەی یەکەمی ڕێکەوتننامەکەدا، دیاریکراوە، لەکاتێکدا کەسێك لەقەڵەمرەوەکەیدا بێت کە ئەنجامدانی تاوانێکی خرابێتە ئەستۆو، نەیدابێت بەدەستەوە، بۆ هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتە پەیوەندیدارەکان و[144] ڕێکەوتننامەکە ڕێگا ناگرێت لە پراکتیزەنەکردنی دەسەڵاتی تاوانکاری، بەپێی یاسای ناوخۆیی[145].

وڕێکەوتننامەکە ڕێگە دەدات بە ئاڵوگۆڕکردنی یارمەتیدان و هاوکاری یەکتری دەوڵەتانی ئەندامی ڕێکەوتننامەکە، تا ئەویەری، لەبارەی ئەوەی کە پەیوەندیی بە ڕێوشوێنی تاوانکاری وەرگیراوەوە هەیە کە تایبەتە بەوتاوانانەی لە مادەی یەکەمدا دیاریکراون، بەپێدانی هەرچی بەڵگەیەکی لەبەردەستدایەو پێویستە بۆ ئەو ڕێوشوێنانە[146] هەروەها ڕێکەوتننامەکە ئەو دەوڵەتەی دادگایکردنی کەسە تاوانبارەکەی بەپێی یاساکانی تێدا بەڕێوە دەچێت پابەند دەکات، بەسپاردنی ئەنجامی کۆتایی ڕێوشوێنی دادگاییەکە، بۆ سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان کە هەڵدەستێت بەناردنی زانیارییەکانی، بۆ دەوڵەتان و ڕێکخراوە حکومییە نێودەوڵەتییە پەیوەندیدارەکان[147].

### ٣- بەدەستەوەدان:

ڕێکەوتننامەکە دەوڵەتانی ئەندامی پابەندکرد، بە ئەژمارکردنی تاوانی دەست بەسەرکردن بەو تاوانانەی کە دەبێت ئەنجامدەرانیان بەدەستەوە بدرێت و، بەراشکاوی لەسەر ئەوە بڕیار بدرێت، لە پەیماننامەکانی بەدەستەوەدانی تاوانباران، کە لەنێوانیاندا دەبەسترێت. ڕێکەوتننامەکە هەندێ بڕگەی

---

[144] مادەی ٢/٥ لە ڕێکەوتننامەکە.

[145] مادەی ٣/٥ لە ڕێکەوتننامەکە.

[146] مادەی ١/١١ لە ڕێکەوتننامەکە.

[147] مادەی ٧ لە ڕێکەوتننامەکە.

پەیوەندیداری بە بەدەستەوەدانی تاوانبارانی ئامادەکردوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:[148]

أ. ئەو تاوانانەی لەمادەی یەکەمدا دیاریکراوە، بەو تاوانانە دادەنرێت کە دەبێ تاوانبارەکانی بەدەستەوە بدرێن و، دابنرێن لەهەر پەیماننامەیەکی بەدەستەوەدانی تاوانباران و لەنێوانیاندا پەیرەوی بکرێت و، وڵاتانی رێکەوتننامەکە بەڵێن بدەن بۆ دانانی ئەو تاوانانە بەتاوانگەلێ کە دەبێ تاوانباران بەدەستەوە بدرێن، لە هەموو پەیماننامەیەکدا، بۆ بەدەستەوەدانی تاونباران کە لەنێوانیاندا دەبەسترێت.

ب. ئەگەر دەوڵەتی ئەندام، بەدەستەوەدانی تاوانبارانی بەستەوە بەمەرجی بوونی پەیماننامەیەك کە داواکاریی بەدەستەوەدانی لەوڵاتێکی تری پەیماننامەکەوە بەدەست گەیشت کە هیچ رێکەوتننامەیەك لەنێوانیاندا نەبێت، بۆ بەدەستەوادانی تاوانباران، ئەو وڵاتەی کە دەبێت تاوانبار بەدەستەوە بدات ئەگەرویستی دەتوانێت ئەو رێکەوتنامەیە، بە بنەمایەکی یاسایی دابنێت بۆ بەدەستەوەدان سەبارەت بەو تاوانانەی لە ماددەی یەکەمدا هاتووە.

ج. ئەو دەوڵەتانەیکە بەدەستەوەدانی تاوانباران نابەستنەوە بەمەرجی بوونی پەیماننامەیەك، ئەو تاوانانەی لەمادەی یەکەمدا هاتوون، بەو تاوانانە دادەنێن کە دەبێ تاوانبارانیان بەدەستەوە بدرێن لەنێوان خۆیانداو دەیبەستێتەوە بەو مەرجانەی کە یاساکانی ئەو دەوڵەتە دایناوە کە داواکارییەکەی پێشکەش دەکرێت.

د. بەمەبەستی بەدەستەوەدانی تاوانباران، لەنێوان دەوڵەتانی ئەندامی رێکەوتنامەکە، ئەو تاوانانەی کە لەمادەی یەکەمی رێکەوتنامەکە بریاری لەسەردراوە، وەکو ئەوەی کە نەك تەنها لەو شوێنەدا ئەنجام دراوە کەتیایدا رووی

---

[148] مادەی ١٠ لە رێکەوتننامەکە.

داوە، بەڵکو لەقەڵەمرەوی ئەو دەوڵەتانەشدا کە داوایان لێکراوە بەپێی مادەی پێنجەمی برگەی یەکەم[149] بریار لەدەسەلاتی دادوەریی خۆیان بدەن.

رێکەوتنامەکە دەوڵەتانی ئەندام پابەند ناکات، بە بەدەستەوەدانی ئەو کەسانەی تاوانی بارمتەگرتنیان خراوەتە پاڵ، ئەگەر ئەو دەوڵەتەی داوای بەدەستەوەدانی دەکات، چەند هۆکارێکی جدی لەبەردەستدابوو، سەبارەت بەیەکێك لەو تاوانانەی کە داوای دادگایکردن، یان سزادانی دەکات، بەهۆی رەگەزەکەی، یان بەهۆی ئایینی، یان رەچەڵەك، یان بۆچوونی سیاسی، یان ئەوەی کە هەڵوێستی ئەو کەسەی داوای بەدەستەوەدانی کراوە، رەنگە بەهۆی هەر هۆیەك بێت، لەو هۆیانە کاری تێبکرێت، یان بەهۆی نەتوانینی پەیوەندیکردن، لەلایەن دەسەلاتدارانی پەیوەندیدارەوە لەو دەوڵەتەدا کەمافی پراکتیزەکردنی پاراستنی هەیە[150]. هەروەها رێکەوتنامەکە دەوڵەتانی ئەندام پابەند دەکات، بەراستکردنەوەی برگەکانی سەرجەم رێکەوتنامەکانو رێکخستنی رێوشوێنە بەرپاکردنی بەدەستەوەدان، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو رێکەوتننامەیەدا یەکبگرێتەوە، سەبارەت بەوەی پەیوەندیی بەتاوانە بریار لەسەر دراوەکانەوە هەیە[151].

لەچوارچێوەی هاوکاریی نێودەوڵەتی، بۆ قەدەغەکردنو سزادانی تاوانی دەست بەسەرکردنی بارمتەگیراوەکان، رێکەوتنامەکە دەوڵەتانی ئەندام پابەند دەکات، بەوەرگرتنی هەموو رێوشوێنێکی پراکتیکی، لەهەرێمەکەیدا، بۆ قەدەغەکردنی ئامادەکاری، بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانانە، لەناو یان دەرەوەی خاکەکەیدا، بەو رێوشوێنانەوە کە دەبنە هۆی گەمارۆدان یان قەدەغەکردنی چالاکییە رەواکان کە لەخاکەکەیدا، لەلایەن کەسانو گروپو رێکخراوەکانەوە پەیرەوەیی دەکرێن، بۆ هاندانی کاری بەبارمتەگرتن، یان هاندان بۆی،یان

---

[149] رێکەوتنامەکە هیچ دەقێکی لەخۆنەگرتووە کە پەیوەندیی بەرێکخستنی پرۆسەی بەدەستەوەدانەکە هەبێت، یان رەچاوکردنی ئەولەوییەتەکان، لەکاتێکدا کە چەند داواکارییەك هەیە، بۆ ئەو بەدەستەوەدانە.

[150] مادەی ۱/۹ی رێکەوتننامەکە.

[151] مادەی ۲/۹ی رێکەوتننامەکە.

ڕێکخستنی، یان بەشداریکردن لە ئەنجامدانەکەی و، ئاڵوگۆڕکردنی زانیارییەکان و هاوئاهەنگی پێویست، لەڕێوشوێنەکانی کارگێڕی و هتد بۆ قەدەغەکردنی ئەو تاوانانە[١٥٢].

بەڵام مادەی چواردەهەم، کە بڕیاری دا بەوەی، کە لەڕێکەوتننامەکەدا شتێك نییە، وا لێك بدرێتەوە کە پاساوی پێشێلکردنی سەلامەتی قەڵەمڕەوەکەی، یان سەربەخۆیی سیاسی وڵاتێکی تر، بەپێچەوانەی برگەکانی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوەیە. دەقەکە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژە بۆ ڕێگەنەدان بەدەستێوەردانی نێودەوڵەتی دەکات و، بەتایبەتی لە ڕێی بەکارهێنانی هێز، یان هەڕەشەکردنی بەکارهێنانی، بۆ ئازادکردنی بارمتەگیراوەکان، ئەویش بەگەڕانەوە بۆ مادەی ٥١ی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکانی تایبەت بەمافی دەوڵەتان لەبەرگریکردن لەخۆیان، بەهۆی نەبوونی ئەو مەرجانەی کە ئەو مادەیە دەست نیشانی کردووە بەسەر ئەو حاڵەتانەدا کە ڕێکەوتنامەکە چارەسەری کردوون[١٥٣].

وێڕای ئەوەی کە بارمتەگرتن بە تاوان هەژمار دەکرێت و سزادان لەسەری لە هەموو یاساکانی تاوانکاریی لەجیهاندا[١٥٤]، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێکەوتنامەکە بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێت، بۆ تاوانبارکردنی نێودەوڵەتی بەبارمتە گرتن، بەشێوەیەکی تایبەتی و، کردە تیرۆرییەکان بەشێوەی گشتی و، ڕێکخستنی هاوکاریی نێودەوڵەتی، لەبواری قەدەغەکردن و سزادانی ئەو تاوانانەدا.

---

[١٥٢] مادەی ٤ لە ڕێکەوتننامەکە.

[١٥٣] لەمەرجەکانی مافی بەرگریی یاسایی بەپێی مادەی (٥) لە بەڵگەنامەکە، بڕوانە:

123-127.

[١٥٤] بڕوانە کتێبی: "الارهاب في القانون الجنائي"، د.محمد مؤنس محب الدين، ل٢٥٦.

# بابەتی سێیەم
## ڕێکەوتننامە پەیوەندیدارەکان، بەبنبڕکردنی دەستێوەردانی نایاسایی لەخزمەتگوزاری فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتیدا

کردەکانی توندوتیژی ئاراستەکراوی دژی فڕۆکەوانی مەدەنیی نێودەوڵەتی، لەسەرجەم شوێنەکانی جیهاندا، لەساڵی ١٩٤٨ تا ئەم کاتەی ئێستاش لەزیادبووندایە[١٥٥]. بەهۆی زیادبوونی کردەکانی ڕفاندنی فڕۆکە لەم دوو دەیەی دواییدا، چەندین ڕێوشوێن لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی گیراوەتەبەر، بۆ ڕێگەگرتن لە ئاڵۆزتربوونی ئەم دیاردەیەو، بنبڕکردنی سەرجەم کردە ئاراستەکراوەکانی دژی ئاسایشی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتی[١٥٦]و هاوکاری نێودەوڵەتی لەو

---

[١٥٥] دەربارەی ڕفاندنی فڕۆکە بەشێوەیەکی گشتی، بڕوانە کتێبی: "خطف الطائرات بين المنطق الثوري والامن الدولي"، عبدالعزيز العجيزي ، ١٩٧٠، ل٤٨٧و دواتر؛ "المقاومة الشعبية المسلحة في القانون الدولي"، د. صلاح الدين عامر، ١٩٧٧، ل٤٨٧و دواتر؛ "خطف الطائرات"، د. محمد توفيق المجذوب، ١٩٧٤، ل١١٩و دواتر؛ "تغيير الطائرات بالقوة"، د. سمعان بطرس فرج الله، ١٩٦٩، ل١٧١و دواتر.و هەروەها بڕوانە:

*Current Legal Problems Vol. 24, 1971, P.P. 256 Seq. ;*
*V. Air piracy: A Sabstantial Misunderstanding not a Quarred over*
*Revue Hellenique de Droit International, 1970, P.P. 80*
*1968-1969, P. 193*

*September,1974*
*An International Journal, Vol.1, No. 3-4.*

[١٥٦] لەماوەی نێوان کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ەوە تا ئەیلولی ساڵی ١٩٦٩دا، ١٢١ فڕۆکەی مەدەنیی ڕفێنراو، گەشتی فڕۆکە مەدەنییەکان لەو ٤٧ دەوڵەتدا پەکخرا، نزیکەی ٩٧ کەس کوژران‌و ٢٣

بـوارەدا، بڕیـار لەسـەردانی سـێ ڕێکەوتننامـەی نێودەوڵـەتی لێکەوتـەوە، بـۆ دابینکردنی گەشتی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتیو پارێزگاریکردنی گیانی سەرنشینان، ئەو ڕێکەوتنامانەش بریتیین لە:

١. ڕێکەوتننامەی تاوانەکانو کردەکانیتر کە لەناو فڕۆکەدا ئەنجامدەدرێن، کە لە ١٤ی ئەیلولی ساڵی ١٩٦٣دا لەتۆکیۆ ئیمزاکرا.

٢. ڕێکەوتننامەی بنبڕکردنی، دەست بەسەراگرتنی نایاسایی فڕۆکـە، کـە لـە ١٦ی ئەیلولی ساڵی ١٩٧٠دا، لە لاهای ئیمزاکرا.

٣. ڕێکەوتنامەی بنبڕکردنی تاوانی دەستدرێژیکردنە سەر ئاسایشی فڕۆکـە مەدەنییەکان، لە ٢٣ ئەیلولی ساڵی ١٩٧١دا، لە مۆنتریال ئیمزاکراوە.

هەریەك لەو ڕێکەوتننامانە، بەتێرو تەسەلی باس دەکەین:

**یەکەم**- ڕێکەوتننامـەی تاوانـەکانو کردەکـانیتر کـە لـەناو فڕۆکـەدا ئـەنجام دەدرێن، کە لە ١٤ی ئەیلولی ساڵی ١٩٦٣دا، لە تۆکیۆ ئیمزا کرا[١٥٧]:

## ١ـ چوارچێوەی جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەکە:

ڕێکەوتننامەی تۆکیۆ بەسەر ئەم تاوانانەدا جێبەجێدەکرێت[١٥٨]:

ا. ئەو تاوانانەی بڕگەکانی یاسای سزادان دەیانگرێتەوە.

---

کەس لەکاتی ئەو پرۆسانەدا بریندار بوون. ئامارەکان ئاماژە بۆ زۆرترین یان بەرزترین ژمارەی رفاندنی فڕۆکە دەکەن، لەماوەی نێوان ساڵی ١٩٦٨-١٩٧٠. سەبارەت بەو ئامارانە بڕوانە:

*Air Craft*

*1969, Vol. 63, No, 4, P. 697.*

(١٥٧) ئەم ڕێکەوتنامەیە لە ٤ کانونی یەکەمی ١٩٦٩وە کاری پێدەکرێتو، ژمـارەی ئـەو دەوڵەتانـەی بڕیاریان لەسەر داوە، گەیشتۆتە ١٤٢ دەوڵەت، هەتا ١٦ی حوزەیرانی ١٩٩١و. میسریش لە ١٢ی شوباتی ساڵی ١٩٧٥دا، چووە ریزیانەوە. لەدەقی ڕێکەوتنامەکە بڕوانە:

*UN Juridical Yearbbok, 1963, P.136; UNTS, Vol. 704, No. 10106.*

(١٥٨) مادەی ١ لە ڕێکەوتننامەکە.

ب. ئەو کردانەی کە بەتاوان هەژمار دەکرێن، یان وا هەژمار ناکرێن کە سەلامەتی فڕۆکەکە، یان سەرنشینان، یان ئەو کەلوپەلانەی تێدایە، یان کەدیسپلین لەناو فڕۆکەکەدا رووبەرووی مەترسی دەکاتەوە.
ج. ئەو تاوانانەی ئەنجامدەدرێت، یان ئەو کردانەی کە کەسێك لەناو فڕۆکەدا پێی هەڵدەستێت کە تۆمار کراوە، لە دەوڵەتێکی ئەندامی رێکەوتننامەکە، لەکاتی فڕینی ئەو فڕۆکەیەدا، یان لەسەر بەرزاییەکانی دەریاکان، یان لەسەر هەر ناوچەیەکی‌تر، لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی هەر دەوڵەتێکدا[١٥٩].

## ٢ـ دەسەڵاتی دادوەری:

مادەی سێیەمی رێکەوتننامەی تۆکیۆ بڕیار دەدات لەسەر ئەوەی: بەچاوپۆشین لە رەگەزنامەی گومانلێکراوەکە، کە ئەو دەوڵەتەی کە فڕۆکەکەی تیا تۆمارکراوەو دەست دەکات بە جێبەجێکردنی دەسەڵاتی دادوەریی خۆی، سەبارەت بەو تاوان‌و کردەوانەی کە لەناو فڕۆکەکەدا ئەنجام دەدرێت[١٦٠].
پێویستە لەسەر دەوڵەتانی ئەندامی رێکەوتنامەکە- بەوەی کە دەوڵەتی تۆمارکردنە- هەست بەگرتنەبەری رێوشوێنی پێویست‌و گونجاو بکەن بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتەکانیان، سەبارەت بەو تاوانانەی کە لەناو ئەو فڕۆکانە ئەنجام دەدرێن کە تیایدا تۆمارکراون[١٦١]. لە هەموو بارێکدا رێکەوتننامەکە هیچ دەسەڵاتێکی تاوانکاری بەدوور نازانێ کە ئیشی پێبکرێت، بەپێی برگەکانی یاسای نیشتمانی[١٦٢].
مادەی سیانزەهەم لە رێکەوتننامەی تۆکیۆ رێگە دەدات، بەهەر دەوڵەتێکی ئەندامی رێکەوتننامەکە- ئەگەر بینی بارودۆخەکە وا دەخوازێت- کە هەستێت

---

[١٥٩] مادەی ١ لە رێکەوتننامەکە.
[١٦٠] مادەی ٣/١ لە رێکەوتنامەکە.
[١٦١] مادەی ٣/٢ لە رێکەوتننامەکە.
[١٦٢] مادەی ٣/٣ لە رێکەوتننامەکە.

بەگرتنی هەر کەسێکی گومانلێکراو، لەئەنجامدانی تاوانەکە لەنێو هەر فڕۆکەیەکدا، بەیەکێك لەو کردانەی کە بەتاوانی گەورە دادەنرێت، بەپێی یاسای سزادان لەو دەوڵەتەی فڕۆکەکەی تیادا تۆمارکراوە، دەبێت هەموو رێوشوێنێك بگرێتەبەر، بۆ دەستەبەرکردنی ئامادەبوون و گرتنی ئەو کەسە، یان گرتنەبەری رێوشوێنیتر، بەپێی برگەکانی یاسای ئەو دەوڵەتە، بەمەرجێ کە ئەو رێوشوێنانە بەردەوام بێت، بۆ کاتێکی گونجاوو پێویست تەنها بۆ تەواوکردنی رێوشوێنە تاوانکارییەکە، یان رێوشوێنی بەدەستەوەدانی[١٦٣]. هەروەها پێویستە یارمەتی هەرکەسێك بدرێت، بەو شێوەیەی پێشتر دەگیرێت دەسبەجێ پەیوەندیی بکرێت بە نزیکترین نوێنەری ئەو دەوڵەتەوە، کە بەیەکێك لە هاوولاتییەکانی دادەنرێت[١٦٤].

پێویستە لەسەر هەر دەوڵەتێك، لەکاتی هەستان بەگرتنی کەسێکی گومانلێکراو بە ئەنجامدانی یەکێك لەو کردانەی کە بەتاوانی گەورە دادەنرێت، بەپێی یاسای سزادان، لەو دەوڵەتەی کە فڕۆکەکەی تیا تۆمارکراوە، دەسبەجێ ئاگاداری ئەو دەوڵەتە بکاتەوە کە فڕۆکەکەی تیادا تۆمار کراوە، یان ئەو دەوڵەتەی، کەسەگیراوەکە سەر بەوە، لەو هۆکارانەی ئاگادار بکرێتەوە کە بوونە هۆی گرتنەبەری ئەو رێوشوێنانە. هەروەها بۆی هەیە، ئەو زانیاریانە بداتە هەر دەوڵەتێکیتر کە بەرژەوەندیی تێدایە، ئەگەر کارەکە پێویستی کردو، پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتەی کە یەکەم لێکۆڵینەوەی تێدا ئەنجام دەدرێت، دەستبەجێ راپۆرتێك لەبارەی ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە بنێرێت، بۆ دەوڵەتی ئاماژەپێکراوو ئەوە روون بکاتەوە کە ئایا بەنیازە لەم بارەوە دەسەڵاتی خۆی پیادە بکات[١٦٥].

---

[١٦٣] مادەی ٢/١٣ لە رێکەوتننامەکە.

[١٦٤] مادەی ١٣/ی لە رێکەوتننامەکە.

[١٦٥] مادەی چوارەمی رێکەوتننامەکە بریاری داوە لەسەر ئەوەی کە نابێت دەوڵەتی ئەندامی رێکەوتننامەکە کە ئەگەر فڕۆکەکەی تیا تۆمار نەکرابوو، رێ لەفڕۆکەیەك بگرێت لەکاتی فریندا، لەپێناوی پراکتیزەکردنی دەسەڵاتی دادوەری خۆی، سەبارەت بەتاوانێك لەناو فڕۆکەکەیدا ئەنجام درابێ، تەنیا لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا نەبێت:

### ٣ـ بەدەستەوەدان:

مادەی شانزەهەمی ڕێکەوتننامەی تۆکیۆ بڕیار دەدات ((بەوەی کە پەیوەندیی بە بەدەستەوەدانی هەیە، بە تاوان دادەنرێت کە لەناو فڕۆکەیەکی تۆمارکراوی هەریەکێك لە دەوڵەتانی ئەندام لەهەر شوێنێکدا ئەنجام بدرێت، هەروەکو ئەوەی کە لەو قەڵەمڕەوەدا ئەنجام درابێت کە فڕۆکەکەی تیا تۆمار کرابێت)). هەروەها بڕگەی دووەمی هەمان ڕێکەوتننامە بڕیاریداوە، بێ ئەوەی ناوەڕۆکی بڕگەی پێشوو بشێوێنرێت لەم پەیماننامەیەدا پابەندبوونی تێدا نییە بەرێوشوێنی بەدەستەوەدانەوە[١٦٦].

لەبابی چوارەمی ڕێکەوتننامەکەداو، لەژێر ناونیشانی: ((دەست بەسەراگرتنی نایاسایی بەسەر فڕۆکەدا)) مادەی (١١) بڕیاریدا [١٦٧]لەسەر ئەوەی: ((لە حاڵەتێکدا ئەگەر کەسێك لەناو فڕۆکەداو لەکاتی فڕیندا، هەوڵیدا لەڕێی بەکارهێنانی هێزەوە، یان هەڕەشەکردن بە بەکارهێنانی هێز بۆ یەکێك لەکردە

---

ا. دەبێت ئەو تاوانە کاریگەریی، لەسەر قەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتە هەبێت.

ب ـ دەبێت ئەو تاوانە هاوڵاتییەکی ئەو دەوڵەتە ئەنجامی دابێت، یان کەسێك کە نیشتەجێی هەمیشەیی ئەو دەوڵەتە بێت، یان لەدژی ئەنجامی دابێت.

ج. تاوانەکە زیان بەئاسایشی ئەو دەوڵەتە بگەیەنێ.

د. ئەگەر تاوانەکە ببێتە هۆی پێشێلکارییەك، بۆ بنەماو سستمە بەرپاکانی ئەو دەوڵەتەو، پەیوەندیی بەجموجوڵی فڕۆکەوە هەبێت.

هـ. ئەگەر پراکتیزەکردنی ئەو دەسەڵاتە پێویست بێت، بۆ دڵنیابوون لە پابەندبوونی ئەو دەوڵەتە، بۆ هەر خاڵێك کە ڕێکەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی چەند لایەنە دەیسەپێنێت بەسەریدا.

[١٦٦] مادەی (١٦) ئاماژە بە نەبوونی ڕێکەوتننامەی بەدەستەوەدان ناکات، لەنێوان وڵاتانی ڕێکەوتننامەکەو سەبارەت بەخستنەرووی ئەو کارەساتانەی کە تا ئێستا ڕوویانداوە، دەتوانین بڵێین، هێشتا زۆربەی دەوڵەتان بەدەستەوە نەدان بەمافی خۆیان دەزانن، مەگەر لەداوای ڕێکەوتننامەی بەدەستەوەدان نەبێت، جگە لەتاوانە سیاسییەکان تەنانەت لەحاڵەتەکانی ڕفاندنی فڕۆکەدا، سەرەڕای ئەوەی کە تائێستا، سەبارەت بە بیرۆکەی تاوانە سیاسییەکان نەگەیشتونەتە ڕێکەوتننامەیەك.

[١٦٧] مادەی ١/١١لە ڕێکەوتننامەکە.

ناڕەواکان کە بەدەستێوەردان لەبەکارهێنانی فڕۆکەکە، یان دەست بەسەراگرتنی یان کۆنترۆڵکردنی بەشێوەیەکی هەڵە، یان لەباری دەستپێکردنی ئەوەدا، ئە پێویستە لەسەر دەوڵەتانی ئەندامی ڕێکەوتننامەکە، هەموو ڕێوشوێنێک گونجاوو پێویست بگرنەبەر، بۆ دووبارە کۆنترۆڵکردنی فڕۆکەکە لەلایە فڕۆکەوانە یاسایییەکەی خۆیەوە، یان بۆ پارێزگاریکردن لە کۆنترۆڵکردنیدا)).

لەم دەقەدا بۆمان روون دەبێتەوە کەبوونی چەند مەرجێك، یان چەند خاڵێک دەست نیشانکراو لە پرۆسەی کۆنترۆڵکردنی نایاسایی فڕۆکەدا، پێویستە ب ئەوەی دەوڵەتی ئەندامی ڕێکەوتننامەکە، پابەندبێت بەگرتنە بەری ڕێوشوێن گونجاو کە ڕێکەوتننامەکە بڕیاری لەسەرداوە.

لەو مەرجانەش دەبێت کاری ئەنجامدەرەکە کارێکی ناڕەوابێ جێبەجێکردنی لەڕێگەی بەکارهێنانی توندوتیژیی، یان هەڕەشەکردن بە بەکارهێنانی بێت[168].

کردەکەش لەناو فڕۆکەکەدا کرابێت، هەروەها کردەکە لەکاتی فڕین بووبێت و، بەمەبەستی کۆسپ دروستکردن، یان دەست بەسەراگرتنی فڕۆکەک یان کۆنترۆڵکردنی بووبێت بەهەرجۆرێك لە جۆرەکان[169].

ئەوەی جێی ئاماژەبۆکردنە، ڕێکەوتننامەی تۆکیۆ شتێکی وای تێدا نیە ک دەست بەسەراگرتنی ناڕەوای فڕۆکە، بەتاوانێك دابنێت کە پێویستی بەسزادا بێت[170]. وەك چۆن ڕێکەوتننامەکە ئەو دەوڵەتانە پابەند ناکات کە فڕۆک

---

[168] هەندێك پێیان وایە، رەنگە رفێنەرەکە دەست بەسەر فڕۆکەکەدا بگرێت، بەبێ بەکارهێنانی هێ توندوتیژی، وەك ئەوەی خواردنەوە یان مادەی بێهۆشکەر بدات بە فڕۆکەوانەکەو پاشان دەستی بەسەر بگرێت، یان هەڕەشە لەفڕۆکەوانەکە، بەکوشتنی یان رفاندنی ئەندامانی خێزانەکەی بکات.

لەم بارەوە، بڕوانە کتێبی: (خطف الطائرات)، د. محمد المجذوب، ١٩٧٤، ل١٢٤.

[169] بڕوانە کتێبی: ((الارهاب الدولی)، د. عبدالعزیز مخیمر،سەرچاوەی ئاماژەپێکراوی پێشو، ل١٢٢ ١٢٦.

[170] بڕوانە: ((الابعاد القانونیة للارهاب الدولي))، د. عصام صادق رمضان، ژمارە ٨٥، حوزەیران ١٩٨٦، ل٢٢.

رفێنراوەکەی تێدا دەنیشێتەوە، بەبنبڕکردن و نەهێشتنی ئەو دەست بەسەراگرتنە ناڕەوایە، ئەویش لەڕێگەی بەدەستەوەدانی رفێنەرەکە، بۆ ئەو دەوڵەتەی فڕۆکەکەی تیا تۆمارکراوە، یان ئەو دەوڵەتەی کە رفاندنەکەی تیادا روویداوە، یان ئەو دەوڵەتەی دادگایکردنی رفێنەرەکەی، لەبەردەم دادگادا تیادا ئەنجام دەدرێت.
لەبەرئەوە رێکەوتننامەکە، بەپلەی یەکەم سووربوو لەسەر پابەندکردنی ئەو دەوڵەتەی کە فڕۆکەکەی تیادا دەنیشێتەوە، بەوەی کەرێگا بەسەرنشینەکانی بدات، گەشتەکەیان تەواو بکەن لەنزیکترین کاتداو، فڕۆکەکە بەکەل وپەلی ناو فڕۆکەکەشەوە بۆ خاوەنەکانیان بگێڕێتەوە[171].
دووەم-رێکەوتننامەی بنبڕکردنی، دەست بەسەراگرتنی ناڕەوای فڕۆکە، کە لە ١٦ی ئەیلولی ١٩٧٠دا لەلاهای ئیمزا کراوە[172]:

بەهۆی ناتەواوی و کەم و کورییەکانی رێکەوتننامەی تۆکیۆ، دەربارەی خستەرووی چارەسەری کارا، بۆ رووبەروو بوونەوەی کێشەی دەست بەسەراگرتنی فڕۆکە، ئاڵۆزبوونی رووداوەکانی رفاندنی فڕۆکەو فراوانبوونی ئەو چوارچێوەیە[173]، رێکخراوی نێودەوڵەتی فڕۆکەوانی مەدەنی گرنگیی دا بەئامادەکردنی رێکەوتننامەیەکی نوێ، بۆ بنبڕکردنی دەست بەسەراگرتنی ناڕەوا بەسەر فڕۆکەدا. لەکانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٠دا، رێکخراوەکە بانگەشەی بەستنی کۆنگرەیەکی دبلۆماسی لە شاری لاهای لە هۆڵەندا کرد، بۆ وتوێژ کردن لەسەر پرۆژەی رێکەوتنامەکە[174]. هەول و کۆششی نێودەوڵەتی لەوبارییەوە، ، بۆ

---

(171) مادەی ٢/١١ی رێکەوتننامەی تۆکیۆ، (في الانتقادات الموجهة الى الاتفاقية)، و(الارهاب الدولي)، د. عبدالعزيز مخيمر عبدالهادی، سەرچاوەی ئاماژەپێکراوی پێشو، ل١٢٦-١٢٧.

(172) لەدەقی رێکەوتننامەکە، بڕوانە:

*U.N.T.S., Vol. 860, No, 72325.*

(173) ژمارەی ئەو رووداوانەی کە لەنێو فڕۆکە ئەنجامدراون، یان لەدزێ، تەنها لەماوەی ساڵی ١٩٦٩دا گەیشتنە ٨١ رووداو.

(174) لەکۆنگرەی دبلۆماسییدا، نوێنەری ٧٧ دەوڵەت ئامادەبون ، نوێنەری ١٢ رێکخراوی نێو دەولتیش بەشدارییان کرد . و لەکاتێکدا کەپرۆژەکە خرایە روو ، بۆ دەنگدان لە سەری ، ٧٤ دەوڵەت

بنبڕکردنی دەست بەسەراگرتنی نایاسایی، بەسەر فڕۆکەدا ڕێکەوتننامەکەی لاهایساڵی ١٩٧٠ی لێکەوتەوە.

## ١ـ چوارچێوەی جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەکە:

بەپێی بڕگەکانی ئەو ڕێکەوتننامەیە، هەرکەسێك لەفڕۆکەو لەکاتی فڕیندا، هەستان بەئەنجامدانی ئەم کارانەی خوارەوە، بە ئەنجامدەری تاوانی دەست بەسەراگرتنی نایاسایی بەسەر فڕۆکەدا دادەنرێت[١٧٥]:

ا. کە بەشێوەیەکی نایاسایی هەستێت، بە بەکارهێنانی هێز، یان هەڕەشەکردن بە بەکارهێنانی هەر جۆرێك لە جۆرەکانی زۆرەملێ، بۆ دەست بەسەراگرتنی فڕۆکە یان هەوڵدان بۆ کۆنترۆڵکردنی، یان بەنیازبێت هەر کردەیەك لەوانە ئەنجام بدات.

ب. بەشداریی بکات لەگەڵ هەرکەسێك کەهەستێت بەئەنجامدان یان ئاراستەکردنی ئەنجامدانی هەریەکێك لەوکردانە.

---

ڕەزامەندییان دەربڕی ، و نوێنەری ٥٠ دەوڵەت ئیمزایان کرد ، و کەس لەدژی دەنگی نەدا . ڕێکەوتننامەکە لە ١٦ی کانونی یەکەمی ١٩٧١ دا چووە خانەی جێبەجێکردنەوە ، و ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی دەنگیان لەسەردا گەیشتە ١٤٣ دەوڵەت ، هەتا ١٦ ی حوزەیرانی ١٩٩١ ،و میسریش لە ٢٨ی شوباتی ساڵی ١٩٧٥دا ، چووە ریزییانەوە . هەوڵ و کۆششی ڕێکخراوی فڕۆکەوانی نێو دەوڵەتی و کۆمەڵی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ، بەردەوام بوو لە ١٢ ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٩و بڕیاری ژمارە ٢٥٥١ لەخولی (٢٤)ەمدا دەرچوو وتایبەت بوو بەگۆڕینی زۆرەملێی ڕەوتی فڕۆکە، کە مەودای گرنگی ڕێوشوێن گرتنەبەری روون کردۆتەوە، ڕێگە لەم جۆرە چالاکییە ترسناکانە دەگرێت و، داوای لە دەوڵەتانی ئەندام کرد کە ڕێوشوێنی یاسایی دابڕێژن، بۆ قەدەغەکردنی سەرجەم کردەکانی دەست تێوەردانی ناڕەوا، بۆ گۆڕینی ڕەوتی فڕۆکە، یان رفاندنی، یان هەرجۆرێك لەجۆرەکانی کۆنترۆڵکردنی فڕۆکەو سزادانی ئەنجامدەرانی ئەو کردانە.

هەروەها ئەنجومەنی ئاسایش، لە ٩ی ئەیلولی ساڵی ١٩٧٠دا، بڕیاری ژمارە ٢٨٦ی دەرکردو تیایدا داوای لەو دەوڵەتانە کرد کە هەموو پلانێکی یاسایی بگرنەبەر، لەپێناو کەمکردنەوەی رفاندنی فڕۆکە، یان هەر دەست تێوەردانێك لەکاروباری فڕۆکە مەدەنییە نێودەوڵەتییەکاندا.

[١٧٥] مادەی ١ لە ڕێکەوتننامەکە.

سـەرجەم دەوڵــەتانی ئـەندامی ڕێکەوتننامەکــە بــەڵێنیان دا بــە ســزادانی هەریـەکێك لـەو تاوانانـە بەسزایەکی تونـد[١٧٦]. لـەوەوە بۆمـان ڕوون دەبێتــەوە کـە توخمــە پێویسـتەکانی پێکـهێنانی تـاوانی دەسـت بەسـەراگرتنی فڕۆکـە، بـەپێی ڕێکەوتننامەکـەی لاهـای بریتیـین لـەوەی: کـە کردەکـە لـەنێو فڕۆکەکـەدا ئـەنجام بدرێــت و، ئـەوەش بــەهۆی بـەکارهێنانی توندوتیــژی، یــان هەڕەشــەکردن بــە پـەیڕەوکردنی و، کـە دەســت بەسـەراگرتنی فڕۆکـە، یــان کۆنـترۆڵکردنی ڕەوتـی فڕۆکەکە، یان بەنیازی ئەنجامدانی ئەو کردانـەو ئەنجامدانی ئەو کارانـە لـەکاتی فڕینـی فڕۆکـەدا ڕوودەدەن و، کردەکـانی دەسـت بەسـەراگرتن، یـان کۆنـترۆڵکردنی بەشێوەی نایاسایی بن[١٧٧].

ڕێکەوتننامەکە یەکسان بوونێك لـەنێوان ئـەنجامدەری کردەی دەست بەسـەرا گرتنە نایاساییەکەو هاوڕێ و هاوبەشەکانی لەو تاوانانەدا ڕەچاو دەکات، هـەروەك چۆن بەشێوەیەکی یەکسان سـەیری ئـەو کەسـە دەکـات کـە هـەوڵی ئـەنجامدانی تاوانەکـەی داوەو ئەوکەسـەیش لەگـەڵیدا هاوبەشـە لەتاوانەکـەدا. لــەم بارەیــەوە ڕێکەوتننامەی لاهای لەڕێکەوتننامەی تۆکیۆ جیادەکرێتەوە، لەکاتێکدا دووەمیان بڕیاردانی لەسەر تاوانی بەشداریکردن لەپرۆسەی ڕفاندنی فڕۆکەکەدا پشت گوێ دەخات.

---

[١٧٦] ماددەی دووەمـی ڕێکەوتننامەکە، بیرۆکـەی دەسـەڵاتی ئیقلیمی بـۆ یاسـا تاوانکارییـەکانی ئـەو دەوڵەتانە داناوە، بەبێ جەخت کردن، یان دڵنیابوون لەسەربیرۆکەی دەسەڵاتی جیهانی، بۆ دادگایکردنی ڕفێنـەرانی فڕۆکـە. سـەبارەت بــە بیرۆکــەی دەســەڵاتی نــاوخۆیی بـۆ یاسادانانی تاوانکـاری و یاسـای نێودەوڵەتی، بڕوانە: *(New York, 1950), P.16.*

[١٧٧] بڕوانە کتێبی: ((الارهاب الدولی))، د. عبدالعزیز مخیمر عبدالهادي، سەرچاوەی ئاماژەپێکراوی پێشوو، ل١٣١-١٣٦.

ڕێکەوتننامەی لاهای چوارچێوەی جێبەجێکرنەکەی فراوان بوو، دەقەکانی دیاریکردنی پێناسی فڕۆکەکانی لەخۆ نەگرتووە، کە ڕووداوەکانی تاوانی دەست بەسەراگرتنی نایاسایی تیادا ئەنجامدراوە. لەبەرئەوە ڕێکەوتننامەکە بەسەر ئەو کردانەدا جێبەجێدەکرێت کە کارەکەی تیادا ئەنجامدراوە، بەبێ جیاوازیی لەنێوان فڕۆکەی دەوڵەتانی ئەندامو فڕۆکەکانی دەوڵەتانی تردا، ئەوەش دەبێتە هۆی وەدیهێنانی ئەو ئامانجانەی کە بڕیاریان لەسەر داوە. لەو پێناوەدا، ڕێکەوتننامەکە تەنها ئەو فڕۆکانەی نەخستە چوارچێوەی جێبەجێکردنەکەوە کە بۆ کاروباری سەربازیی، گومرگی، یان کاروباری پۆلیسی بەکار دەهێنرێن[178]. بەڵکو ئەو فڕۆکانەی کە بۆ مەبەستی مەدەنی بەکار دەهێنرێن، ئەوا بڕگەکانی ڕێکەوتننامەکە دەیانگرێتەوە، جا ئەگەر ئەو فڕۆکانە بەشێوەیەکی ڕێكوپێك لەهێڵەکاندا کار بکەن، یان فڕۆکەی کرێ بن.

مادەی سێیەمی ڕێکەوتننامەکە، چوارچێوەی جوگرافی بۆ جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەکە دیاری دەکات. چونکە ڕێکەوتننامەکە جێبەجێ ناکرێت، ئەگەر شوێنی هەستانی ئەو فڕۆکەیەی تاوانەکەی تیادا ئەنجامدراوە، یان شوێنی نیشتنەوەی فیعلی بکەوێتە دەرەوەی ئەو دەوڵەتەی فڕۆکەکەی تیا تۆمارکراوەو، بەچاوپۆشین لەوەی کە ئەگەر فڕۆکەکە بۆ گەشتی نێودەوڵەتیو ناوخۆیی بەکاربێت[179] هەروەها ڕێکەوتننامەکە جێبەجێ ناکرێت، ئەگەر شوێنی هەستانی فڕۆکەکەی کە تاوانەکەی تیا ئەنجامدراوەو، شوێنی نیشتنەوە فیعلی بکەوێتە ناو قەڵەمڕەوی هەمان ئەو دەوڵەتەی فڕۆکەکەی تیا تۆمار کراوە[180]. لێرەوە تێدەگەین کە ڕێکەوتننامەکە بەسەر فڕینی ناوخۆییدا جێبەجێ ناکرێت، بەرەچاوکردنی ئەوەی کە هیچ هۆکارێکی دەرەکی، یان نێودەوڵەتی لەو کردەی دەست بەسەرا گرتنەی فڕۆکەکەدا نییە، لەم حاڵەتانە دەوڵەتەکە یاسادانانە نیشتمانیەکانی خۆی جێبەجێ دەکات.

---

[178] مادەی ٣/٢ لە ڕێکەوتننامەکە.

[179] مادەی ٣/٣ لە ڕێکەوتننامەکە.

[180] مادەی ٣/٤لە ڕێکەوتننامەکە.

## ٢ـ دەسەڵاتی دادوەری:

مادەی چوارەمی ڕێکەوتننامەکە، هەموو دەوڵەتانی ئەندام پابەند دەکات، بەگرتنە بەری ڕێوشوێنی پێویست، بۆ دانانی بنەمای دەسەڵاتی دادوەری، سەبارەت بە تاوانەکانی دەست بەسەراگرتنی نایاسایی فڕۆکەداو، هەر کردەیەکی توندوتیژیی ئاراستەکراو، لەدژی سەرنشینەکان و ستافی فڕۆکەکە کە تاوانبار ئەنجامی دەدات، دەربارەی دەست پێکردنی ئەو تاوانە، لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:

ا. کاتێك تاوانەکە ئەنجامدەدرێت، لەناو فڕۆکەیەکی تۆمارکراو لەو دەوڵەتەدا.

ب. کاتێك فڕۆکەیەك دەنیشێتەوە کە تاوانەکەی تیا ئەنجام دەدرێت، لە قەڵەمڕەوە کەیداو کە هێشتا تاوانبارەکە لەنێو فڕۆکەکەدا بێت.

ج. کاتێ تاوانەکە لەناو فڕۆکەیەکی بەکرێگیراو ئەنجام دەدرێت کە بەبێ ستاف دەدرێت بەو لایەنەی بەکرێی دەگرێت و شوێنی کارەکەی لەو وڵاتەدا دەبێت، یان نیشتەجێبوونی هەمیشەیی تیادا هەیە، ئەگەر پێگەیەکی وەك ئەو کارانەی نەبێت.

مادەی چوارەم حاڵەتێکی تری زیادکردوە کە ئەویش بوونی تاوانباری، لەقەڵەمڕەوی دەوڵەتێکی ئەندامی ڕێکەوتننامەکەداو هەڵناسێت بە بەدەستەوەدانی[181] ڕێکەوتننامەکە هیچ دەسەڵاتێکی تاوانکاری بەدوور نازانێ ئیشی پێبکرێت، بەپێی بڕگەکانی یاسای نیشتمانی[182]. هەروەها لەمادەی دووەم بڕیار لەسەر پێویستی سزادانی توندی تاوانی دەست بەسەراگرتنی نایاسایی فڕۆکە درا.

مادەی شەشەمی ڕێکەوتننامەکە، ڕێوشوێنی گرتنی ئەوکەسە پەیڕەو دەکات کە تاوانی دەست بەسەرا گرتنی فڕۆکەکەی بەشێوەی نایاسایی داوە. بەپێی ئەو مادەیەش دەوڵەتی ئەندامی ڕێکەوتننامەکە کە تاوانبارەکە لەنێو

---

(181) مادەی ٢/٤ لە ڕێکەوتننامەکە.

(182) مادەی ٣/٤ لە ڕێکەوتننامەکە.

قەڵەمڕەوەکەیدایە پابەند دەکرێت بە بەندکردنی، یان هەر ڕێوشوێنێکی‌تر کە گرەنتی مانەوەی دەدات لەو وڵاتەدا، لە حاڵەتێکدا ئەگەر بۆی دەرکەوت بارودۆخەکە وادەخوازێت. بە بەندکردن، یان گرتنەبەری ڕێوشوێنی‌تر، بەپێی برگەکانی یاسای ئەو دەوڵەتە دەبێت، بەمەرجێ ئەو ڕێوشوێنانە لەکاتی پێویستی خۆی زیاتر درێژە نەکێشێت، بۆ بەئەنجام گەیاندنی ڕێوشوێنی تاوانکارییەکە، یان ڕێوشوێنی بەدەستەوە دانەکە[١٨٣].

دەبێت دەوڵەتی ناوبراو، دەسبەجێ هەستێت بەڕێوشوێنی لێکۆڵینەوەی سەرەتایی ڕووداوەکەو[١٨٤]، پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتە کە یارمەتی پێویستی کەسی بەندکراو بداتو کارئاسانی بۆ بکات، بەوەی دەرفەتی بداتێ لەنزیکترین کاتدا، پەیوەندیی بەنوێنەری ئەو دەوڵەتەوە بکات کە ڕەگەزنامەی هەڵدەگرێت[١٨٥].

ڕێکەوتننامەکە سەرجەم دەوڵەتانی ئەندام، بەپێی یاسای نیشتمانی، پابەند دەکات، بەئاگادارکردنەوەی ئەنجوومەنی ڕێکخراوی نێودەوڵەتیی فڕۆکەوانی مەدەنی، بەزووترین کات، بەهەر زانیارییەك کە لەبەردەستی دایە، سەبارەت بە بارودۆخی ئەنجامدانی تاوانەکەو، ڕێوشوێنی ڕەچاوکراو بۆ گێڕانەوەی کۆنترۆڵ، یان دەسەڵات بۆ فڕۆکەوانەکەی خۆی، یان بۆ پارێزگاریکردن لە دەسەڵاتی بەسەریدا، بەپێی مادەی حەوتەمی ڕێکەوتننامەکەو، ئەو ڕێوشوێنانە یان هەر ڕێوشوێنێکی تری یاسایی دەگرێتەبەر، لەدژی ئەنجامدەری تاوانەکە، یان ئەوەی تاوانبارەکە بە ئەنجامدانی و بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە بەدەستەوەدانی هەیە[١٨٦].

---

[١٨٣] مادەی ٦/١ لە ڕێکەوتننامەکە.

[١٨٤] مادەی ٦/٢ لە ڕێکەوتننامەکە.

[١٨٥] مادەی ٣/٣ لە ڕێکەوتننامەکە.

[١٨٦] مادەی ١١ لە ڕێکەوتننامەی لاهای.

### ٣- بەدەستەوەدان:

ڕێکەوتننامەی لاهای پرەنسیپی بەدەستەوەدان، یان دادگایکردن پەیڕەو دەکات. ئەگەر دەوڵەتی ئەندامی ڕێکەوتننامە، کاتێك تاوانبارێك لە قەڵەمڕەوەکەیدا بێت و بەدەستیەوە نەدات، ئەوا پابەندی دەکات بەبێ جیاوازیو، هەرکەسێك بێت و تاوانەکەی لەقەڵەمڕەوەکەیدا ئەنجام دابێت یان نەء بەڕەوانەکردنی کێشەکە بۆ دەسەڵاتە پسپۆرییەکان بۆ دادگاییکردنی و، پێویستە لەسەر ئەو دەسەڵاتانە هەمان ئەو بڕیارانە بدەن، کە سەبارەت بەتاوانێکی ئاسایی دەیدەن کە بەپێی یاسای ئەو دەوڵەتە بەگەورە دادەنرێت[١٨٧].

ڕێکەوتننامەکە بڕیاری داوە، تاوانی دەست بەسەرا گرتنی نایاسایی فڕۆکە، لەنێو ئەو تاوانانەدا دابنرێت کە کاری بەدەستەوەدانیان لەسەر دەکرێت و لە هەر ڕێکەوتننامەیەکی بەدەستەوەداندا، بڕیاری لەسەر درابێت کە لەنێوان وڵاتانی ڕێکەوتننامەکاندا بەرپایە، لەگەڵ بەڵێندانی لایەکانی ڕێکەوتننامەکە بەدانانی دەست بەسەراگرتنی نایاسایی بەسەر فڕۆکەدا، وەکو تاوانێك کە دەبێت ئەنجامدەرانی بەدەستەوە بدرێن، لەهەر پەیماننامەیەکدا بۆ بەدەستەوەدان کە لەداهاتوودا لەنێوانیاندا ببەسترێت[١٨٨].

ڕێکەوتننامەکە ڕێگە دەدات بەوەی ئەگەر دەوڵەتێکی ئەندام داواکاری بەدەستەوەدانی لەوڵاتێکیتر وەرگرت و هیچ جۆرە پەیماننامەیەکی وەها لەنێوانیاندا نەبوو، مەرجی بوونی ڕێکەوتننامەی بەدەستەوەدانی هەبوو ئەوا- بەپێی خواستی خۆی- دەتوانێت ئەو ڕێکەوتننامەیە بە بەڵگەیەکی یاسایی بۆ بەدەستەوەدانی، سەبارەت بە تاوانی دەست بەسەراگرتنی فڕۆکە دابنێت و بەدەستەوەدانەکە لەم بارەدا دەکەوێتە ژێر چەند مەرجێکی ترەوە کە لەیاسای ئەو دەوڵەتەی داوای بەدەستەوەدانەکەی دەکات بڕیاری لەسەر درابێت و[١٨٩].

---

[١٨٧] مادەی ٧ لە ڕێکەوتننامەی لاهای.

[١٨٨] مادەی ١/٨ لە ڕێکەوتننامەی لاهای.

[١٨٩] مادەی ٢/٨ لە ڕێکەوتننامەی لاهای.

پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتەی کە ئەندامی ڕێکەوتنامەکەیەو پێویستە لەسەر دەوڵەتانی ئەندامی ڕێکەوتننامەکە بۆ بەدەستەوەدان لەنێوانیاندا، پەیماننامەیەك هەبێت، کە تاوانی دەست بەسەراگرتنی ناڕەوای فڕۆکە، بەیەکێك لەو تاوانانە دابنێت کە دەبێت بەدەستەوەدانی تێدابێت لەنێوانیاندا، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەو مەرجانەی لەیاسای ئەو دەوڵەتەدا هاتوون کە داوای لێدەکرێت کاری بەدەستەوەدان ئەنجام بدات[190]. مامەڵەکردنی تاوانی دەست بەسەراگرتنی فڕۆکە بەشێوەی نایاسایی، بۆ مەبەستی بەدەستەوەدان، لەنێوان دەوڵەتانی ئەندامی ڕێکەوتننامەکە، وەکو ئەوە دەبێت کە تاوانەکە لەشوێنی خۆیدا ڕووی نەدابێت، بەڵکو لەقەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتانەشدا کە کارەکە، بەپێی ئەحکامی برگەی (١) لەمادەی چوار، پێویستی بەدامەزراندنی دەسەڵاتی دادوەری هەیە[191].

ڕێکەوتننامەی لاهای بەهەنگاوێکی گرنگ هەژمار دەکرێت، بۆ قەلاچۆکردنی رفاندنی فڕۆکەو سزادانی ئەنجامدەرانی، چونکە جەخت لەسەر بیرۆکەی دەسەلاتی جیهانی، بۆ قەلاچۆکردنی رفاندنی فڕۆکە دەکات. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا، ڕێکەوتننامەکە چارەسەری هەندێ تاوانی پەیوەندیدار بەئاسایشی فڕۆکەوانی نەکردووە، وەکو هێرشکردنە سەر فڕۆکە لەسەر زەویدا، یان دەستدرێژیکردنە سەر دامەزراوەکانی فڕۆکەوانیی مەدەنی لە فڕۆکەخانەکاندا[192]. هەروەها ڕێکەوتننامەکە حاڵەتەکانی دەست بەسەراگرتنی دەرەکی فڕۆکەی نەکردوە، چ بە بەکارهێنانی فڕۆکەی جەنگییەوە بێت، یان هەڕەشەکردن بە بەکارهێنانی جۆرێکی دەست نیشانکراو لەچەکی دژە ئاسمانی، وەکو موشەکی زەمین بەئاسمان کە ئاراستەی فڕۆکە دەکرێت[193]. هەر لەم ڕێکەوتننامەیەدا، بڕیار نەدراوە لەسەر سزادانی ئەو دەوڵەتانەی کەمتەرخەمی لە

---

[190] مادەی ٣/٨ لە ڕێکەوتننامەی لاهای.

[191] مادەی ٤/٨ لە ڕێکەوتننامەی لاهای.

[192] بڕوانە کتێبی ((خطف الطائرات))، د. محمد المجذوب، ل١٧٢؛ و ((الابعاد القانونية الارهاب الدولي))، د. عصام صادق رمضان، ل٢٣.

[193] د. محمد المجذوب، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣.

جێبەجێکردنی ئەحکامەکانیدا دەکەن، هێشتا پابەندبوون بەناوەڕۆکی ڕێکەوتننامەکە، بەندە بەویستی وڵاتانی ڕێکەوتننامەکەوە[١٩٤]. دواتر ڕێکەوتننامەکە ئەو دەقانەی تێدا نییە کە تایبەتن بەجیاکردنەوەی ئەو حاڵەتانەی کە زیاتر لەوڵاتێك لەوڵاتانی ڕێکەوتننامەکە ئیدعای دەسەڵاتی خۆیان دەکەن، بۆ دادگایکردنی رفێنەران.

**سێیەم:** ڕێکەوتننامەی نەهێشتنی تاوانەکانی دەستدرێژیکردنە سەر ئاسایشی فڕۆکەوانیی مەدەنی، لە ٢٣ی ئەیلولی ١٩٧١دا، لە مۆنتریال ئیمزاکراوە(١٩٥).

ڕێکخراوی فڕۆکەوانیی نێودەوڵەتی داوای بەستنی کۆنگرەیەکی دبلۆماسی لە دەوڵەتان کرد لە مۆنتریال، لە پێناو لێکۆڵینەوەی پرۆژەی ڕێکەوتننامەیەك، بۆ قەدەغەکردنی کردە نایاساییە ئاراستەکراوەکانی دژی ئاسایشی فڕۆکەوانیی مەدەنیو پاراستنیان لە دژی کردەکانی توندوتیژیو تێکدان. ئامادەکردنی ئەو ڕێکەوتننامەیە بە هۆی لیژنەی یاسایی ڕێکخراوەکەوە بووە، کۆنگرەکەش لە ٢٣ی ئەیلولی ١٩٧١دا، ڕەزامەندیی لەسەر دەربڕیوە. و ئامانجی ڕێکەوتننامەکە چارەسەرکردنی ئەو کەلێنو نەهێشتنی ئەو ڕەخنانەیە کە ئاراستەی ڕێکەوتننامەی لاهای ساڵی ١٩٧٠کرا، کە چوارچێوەی جێبەجێکردنەکەی ئەو کردە نایاساییانە ناگرێتەوە کە ئاراستەی فڕۆکە دەکرێت، لە کاتی ئەوەی لەسەر زەوی فڕۆکەخانەکە بێت لە زەویدا، یان لە کاتی بەرزبوونەوەیدا لە ئاسمان، یان ئەوانەی ئاراستەی دامەزراوەوەو خزمەتگوزارییەکانی فڕگەکان دەکرێت.

---

[١٩٤] بڕوانە ((الارهاب الدولی))، د. عبدالعزیز مخیمر عبدالهادی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٣-١٤٤.

[١٩٥] ئەم ڕێکەوتننامەیە لە ٢٦ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٣دا چووە خانەی جێبەجێ کردنەوە، ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی کە بڕیاریان لەسەرداوە ئەوانەشی هاتنە ریزەوە گەشتە ١٤٤ دەوڵەت تا ١٦ی تەمووزی ١٩٩١و میسریش لە ٢٤ی تشرینی دووەمی ١٩٧٢دا ئیمزای کردو، لە ٢٠ی مایسی ١٩٧٥دا بڕیاری لەسەردرا، سەبارەت بە دەقی ڕێکەوتننامەکە، بڕوانە:

*10 I .L. M., November, 1971; U. N. T. S., Vol. 974, No. 14178.*

## ١-چوارچێوەی جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامە :

برگـەکانی ڕێکەوتننامـەی مۆنتریـال بەسـەر هـەر کەسـێکدا جێبـەجێدەکرێت کە[١٩٦]:

أ-هەستێت بە یەکێك لە کردە توندوتیژی، دژی کەسێك لەناو فڕۆکە لە کاتی فڕینیدا، ئەگەر شیمانەی ئەوە هەبوو کە ئەو کردەیە، ئاسایشی فڕۆکەکە بخاتە مەترسییەوە[١٩٧].

ب-خراپکردنـی فڕۆکـە لـە کـاتی ئیشـکردنی یـان خزمـەتکردندا، یـان زیـان پێگەیاندنی ئەو جۆرە فڕۆکانە بەجۆرێك کە سوودی فڕینـی نـەبێت، کـە ڕەنگـە مەترسیی لەسەر ئاسایشی لە کاتی فڕیندا دروست ببێت[١٩٨].

ج-دانانی ئامرازێك یـان بوونـە. هـۆی دانـانی ئـامرازێك، یـان مادەیـەك لـە نێـو فڕۆکەیەك کە لـە ئیشـکردندا بێـت، بەهـەر هۆیـەك بێـت، کـە ڕەنگـە ببێتـە هـۆی تێکشـکاندنی فڕۆکەکە، یان زیان پێگـەیاندنی کـەوای لێبکـات بـە کـەڵکی فڕیـن نەیەت، یان ببێتە هۆی ڕوودانی زیان لێکەوتن کە ڕەنگە لە کاتی فڕیندا، مەترسی بۆ سەر ئاسایشی فڕۆکەکە دروست بکات.

---

[١٩٦] مادەی ١/١ی لە ڕێکەوتننامەکە.

[١٩٧] لـەو کاتـەوەی سەرنشینەکان دەچنـە فڕۆکەکەو سەرجەم دەرگاکانی دادەخەن بە حاڵەتی فڕیـن دادەنرێـت، تـا ئـەو کاتـەی دەرگاکـان دەکرێتـەوە، بەمەبەسـتی دابـەزینیانو، لـە حاڵـەتی نیشـتنەوەی ناچارییدا، هەر بە حاڵەتی فڕین دادەنرێت، تا ئەو کاتەی دەسەڵاتە پەیوەندیدارە بەرپرسەکە لە فڕۆکەکەو لەسەر نیشنانی دەست بەکاردەبەن(مادەی٢/أ لە ڕێکەوتننامەکە)

[١٩٨] فڕۆکـە هـەر لـە کاتی ئامادەکردنی بەر لـە فڕیـن، لەلایـەن ستافی خزمـەتگوزاریی زەمینـی یـان بـە هۆی ستافی فڕۆکەکە لە کاتی گەشتێکی دیاریکراو وا دادەنرێت کە لـە حاڵـەتی فڕینـدا بێت، تـارەتبوونی ٢٤ سەعات بەسەر هەر نشیتنەوەیەکی فڕۆکەکەو، بەهەر حاڵ ماوەی ئیشکردنەکە بە درێژایی ئـەو ماوەیـە دەبێت کە فڕۆکەکە وا دادەنرێت لە حاڵەتی فڕیندایە، بە تایبەتی لە بڕگەی(أ) لـەم مادەیـە (مـادەی ٢/ ب لـە ڕێکەوتننامەکە).

د-هەموو ئەو ئامێرانەی کە گەشتی ئاسمانی تێکبدات، یان خۆی هەڵقورتێنێت تیایاندا، ئەگەر هاتوو ئەو کردەوانە، ئاسایشی فڕۆکەکە لە کاتی فڕیندا بخاتە مەترسییەوە.

هـ-هەر زانیارییەك رابگەیەنێت کە بزانێت راست نییەو لەوانەبێت ئاسایشی فڕۆکەکە، لە کاتی فڕیندا بخاتە مەترسییەوە.

هەروەها هەرکەسێ بیەوێت یەکێك لەو کارانەی سەرەوە ئەنجام بدات بە ئەنجامدەری تاوانەکە دادەنرێت، یان بەشداریی بکات لەگەڵ کەسی تاوانبار یان کەسێك بیەوێت یەکێك لەو کارانە ئەنجام بدات(١٩٩).

## ٢-دەسەڵاتی دادوەری:

مادەی پێنجەمی رێکەوتننامەکەی مۆنتریال بڕیاریدا، چاوپۆشین لە رەگەزنامەی ئەنجامدەری کارەکە. پێویستە لە سەرجەم دەوڵەتانی ئەندامانی رێکەوتننامەکە، هەموو رێوشوێنێکی پێویست بگرنەبەر، بۆ پیادەکردنی دەسەڵاتی دادوەری، لەم تاوانانەدا:

ا-کاتێك تاوانەکە لە قەڵمرەوی ئەو دەوڵەتەدا ئەنجام دەدرێت.

ب-کاتێك تاوانەکە لە دژی فڕۆکەیەك یان لەناو فڕۆکەیەکی تۆمارکراو لەو دەوڵەتەدا ئەنجام دەدرێت.

ج-کاتێك ئەو فڕۆکەیەی تاوانەکەی تیا ئەنجام دراوە، لە قەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتەدا دەنیشێتەوە کە هێشتا تاوانباری ئەنجامدانەکە لە نێویدایە.

د-کاتێك تاوانێك دژی فڕۆکەیەك، یان لەناو فڕۆکەیەکدا ئەنجام دەدرێت کە بە کرێ گیراوە بەبێ ستاف، بۆ بەکرێ گرتەیەك کە بارەگای سەرەکی کارەکانی، یان نیشتەجێبوونی هەمیشەیی، لەو ولاتەدا بێت.

رێکەوتننامەکە هیچ دەسەڵاتێکی دادوەری بەدوور نازانێت ئیشی پێبکرێت، بەپێی یاسای نیشتیمانی ئەو دەوڵەتەی کە کەسی تاوانبار، بە ئەنجامدانی یەکێك لەو کردانەی تێدایە کە دەچێتە چوارچێوەی جێبەجێکردنیەوە.

---

(١٩٩) ماددەی ١/٢/ا، ب لە رێکەوتنامەکە.

بەپێی مادەی شەشەمی ڕێکەوتننامەکە، هەر دەوڵەتێکی ئەندام، کە ئەنجامدەری تاوانەکە، یان تاوانباری ئەنجامدانەکە لە قەڵەمڕەوەکەیدا بێت، پابەندی دەکات بە دەستگیرکردنی، یان بە گرتنەبەری ڕێوشوێنی تر کە گرەنتی مانەوەی دەکات، کاتێك گەیشت بەو قەناعەتەی داوای لێدەکرێت، ئەگەر هاتوو هەستی بەوەکرد کە بارودۆخەکە وا دەخوازێت، بە مەرجێ ئەو ڕێوشوێنانە، تەنیا تا کاتی پێویست بێت، بۆ هەستان بەڕێوشوێنی تاوانکاری، یان هەر ڕێوشوێنەکانی بەدەستەوەدانی[200].

پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتەی کە تاوانبارەکەی لایە، دەسبەجێ هەستێت بە کاری لێکۆڵینەوەی سەرەتایی لە ڕووداوەکە[201]. هەروەها پێویستە لەسەری یارمەتی ئەنجامدەری تاوانەکە، یان تاوانبار بە ئەنجامدانەکەی بدات، بە پەیوەندیی کردنی بە نوێنەری ئەو دەوڵەتەوە کە یەکێکە لە هاووڵاتیاینی[202]. و هەروەها پێویستە دەسبەجێ ئەو دەوڵەتانە ئاگادار بکاتەوە کە تاوانەکە لە قەڵەمڕەوەکەیدا ئەنجامدراوەو زیانی بە بەرژەوەندییەکانی گەیاندوەو، ئەو دەوڵەتەی کە کەسی دەستگیرکراو هەڵگری ڕەگەزنامەیەتی، یان هەر دەوڵەتێکی تری بەرژەوەندیدار، ئەگەر بینی پێوست دەکات و، دەبێ دەسبەجێ دەست پێشخەری بکات، بەناردنی ئاکامی لێکۆڵینەوەکە بۆ دەوڵەتانی ئاماژە پێکراو کە ئایا دەیەوێت دەسەڵاتی خۆی لەو بارەوە جێبەجێ بکات[203].

## ٣-بەدەستەوەدان:

أ-ئەو کردانەی دەچنە نێو چوارچێوەی ڕێکەوتننامەی مۆنتریال، بەو تاوانانە دادەنرێن کە شایەنی بەدەستەوەدانن کە لە هەر پەیماننامەیەکی بەدەستەوە داندا هەبێت کە دەوڵەتانی ئەندام لەسەری ڕێك دەکەون. و دەوڵەتانی ئەندامی

---

[200] مادە ٦/١ لە ڕێکەوتننامەکە.

[201] مادەی ٦/٢ لە ڕێکەوتننامەکە.

[202] مادەی ٦/٣ لە ڕێکەوتننامەکە.

[203] مادەی ٦/٤ لەڕێکەوتننامەکە.

ڕێکەوتننامەکە بەڵێن دەدەن، بە دانانی ئەو تاوانانە لە هەر پەیماننامەیەکی بەدەستەوەداندا بێت، کە لە داهاتوودا دەبەسترێت، بەوەی کە وەکو تاوانی شایەنی بەدەستەوەدانە

ب-ئەگەر دەوڵەتێکی ئەندام- مەرجی بوونی ڕێکەوتننامەی بەدەستەوەدان دادەنێت، بۆ ئەنجامدانی بەدەستەوەدان- لەلایەن دەوڵەتێکی تری ئەندامەوە داوای لێکراو هیچ پەیماننامەیەکی بەدەستەوەدانیش لە نێوانیاندا نەبوو، ئەوا دەتوانرێت بە پێی خواستی خۆی، ئەو پەیماننامەیە بکات بە بنەمایەکی یاسایی، بۆ بەدەستەوەدانەکە سەبارەت بەو تاوانانەی دەچنە نێو چوارچێوەی جێبەجێکردنەکەوە، لەم حاڵەتەدا ڕێوشوێنی بەدەستەوەدانەکە، بە پێی مەرجی دیکە کاری پێدەکرێت کە یاسای ئەو دەوڵەتە دیاری دەکات کە داوای بەدەستەوەدانەکەی لێ دەکات.

ج-پێویستە لەسەر دەوڵەتانی ئەندامی ڕێکەوتننامەکە کە بوونی ڕێکەوتننامەیەکی بەرپا، بەمەرجی بەدەستەوەدان دانانێن، لەناو خۆیاندا دان بەوەدا بنێن کە ئەو کردانەی ڕێکەوتننامەی مۆنتریال بڕیاری لەسەرداون، بە تاوانێکی بزانن کە شایەنی بەدەستەوەدان نین.

د-مامەڵەکردنی هەموو ئەو تاوانانەی دەکەونە نێو چوارچێوەی جێبەجێکردنی پەیماننامەکەوە- ئەوەی پەیوەندیی بە بەدەستەوەدان هەیە، لە نێوان دەوڵەتانی ئەندامدا- وەکو ئەوەی کە ئەنجامدانەکە، تەنها لەو شوێنەدا ڕوونەدابێت، بەڵکو لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتانی دیکەشدا کە دەسەڵاتە دادوەرییەکەی بۆ ڕەچاو دەکرێت، بە پێی بڕگەکانی ڕێکەوتننامەکە.

دەتوانرێت تێبینی ئەوە بکرێت کە ڕێکەوتننامەی مۆنتریال و ڕێکەوتننامەی لاهای، لە چەندین ڕووەوە لە یەکتری دەچن، بە جۆرێك کە دەگاتە ئەو ئاستەی کە دەتوانین بڵێن ڕێکەوتننامەی مۆنتریال هەمان دەقەکانی ڕێکەوتننامەی لاهای لەخۆگرتووە، بەڵام ڕێکەوتننامەی مۆنتریال لەوەدا جیاوازەکە ئامانجی بەگژداچوونەوەی دەستدرێژی و کاری تێکدانی ئاراستەکراوە بۆ فڕۆکە مەدەنییەکان، چ لە کاتی فڕیندا بێت، یان لە کاتێکدا لەسەر زەوی فڕگەکە بێت،

بەلام ڕێکەوتننامەی لاهای جەخت لەسەر زەوتکردنی نایاسایی فڕۆکە، یان خودی کردەی"رفاندن" دەکات.
ڕێکەوتننامەی مۆنتریال هەندێ پێشکەوتنی بەسەر ڕێکەوتننامەی لاهایدا هێناوە، لەبارەی قەلاچۆکردنی تاوانی رفاندنی فڕۆکە، کە لە مادەی دەیەمدا، سەرجەم دەوڵەتانی ئەندامی ڕێکەوتننامەکەی پابەندکرد، بەوەی کە هەوڵ و کۆششەکانیان بخەنەگەڕ، لە پێناو گرتنەبەری هەموو ڕێوشوێنێکی گونجاو، بۆ قەدەغەکردنی ڕوودانی ئەو تاوانانەی کە لە مادەی یەکدا بڕیاریان لەسەردراوە، ئەوەش بە پێی یاسای نێودەوڵەتی و یاسا نیشتیمانییەکان[٢٠٤]. هەروەها ڕێکەوتننامەکە، سەرجەم دەوڵەتانی ئەندام پابەند دەکات، کە پاساوی ئەوەیان بە دەستەوەیەو بڕوایان وایە کە یە کێك لەو تاوانانە ئەنجامدەدرێت کە لە مادەی یەکەمدا هاتوون، کە بە پێی یاسای نیشتیمانی خۆی هەستێت بە ڕاگەیاندنی هەر زانیارییەك کە هەیەتی سەبارەت بەو تاوانە، بۆ ئەو دەوڵەتانەی کە پێی وایە لەو دەوڵەتانەن کە لە بڕگەی (١)ی مادەی پێنجەمدا هاتوون[٢٠٥].
ڕێکخراوی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتی هەوڵیدا پشتگیریی جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامە نێودەوڵتیە پەیوەندیدارەکان بکات، بۆ بنبڕکردنی دەستێوەردانی نایاسایی لە خزمەتگوزارییەکانی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتی(تۆکیۆ، لاهای، مۆنتریال) لە ڕێی ئامادەکردنی ڕێکەوتننامەیەکەوە کە بواری خزمەتگوزارییە ئاسمانییەکانی و چەند بوارێکی تری دەوڵەت لەخۆ بگرێت، بۆ ئەو دەوڵەتانەی پابەند نابن بەو ڕێکەوتننامانەوە، بەلام ئەو هەوڵدانە لە کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوەکە لە ساڵی ١٩٧٣دا، سەرکەوتنی بەدەست نەهێناو، دواتر تێکۆشانی نێودەوڵەتی بۆ بەگژداچوونەوەی رفاندنی فڕۆکە بەردەوام بووو داوای لەو دەوڵەتانەش کرد کە هێشتا نەهاتوونەتە ریزی ڕێکەوتننامەکەوە، کە

---

[٢٠٤] مادەی ١/١٠ لەڕێکەوتننامەکە.

[٢٠٥] مادەی ١٢ لە ڕێکەوتننامەکە. و بڕوانە:

*Sundberg, J. "Unlawful Seizure of Aircraft", Arkiv for Lufrett, September, 1974, p. 27.*

ئەوانیش لە دژی ئەو جۆرە کارانە بوەستنەوە، لەگەڵ هاندان بۆ توندکردنی ڕێوشوێنی پاراستنی ئاسایش لە فڕۆکە خانەکاندا[٢٠٦].

**چوارەم: چەند تێبینییەك سەبارەت بە ڕێکەوتننامەکانی بنبڕکردنی دەستێوەردانی نایاسایی، لە خزمەتگوزارییەکانی فڕۆکەوانیی مەدەنی نێودەوڵەتیدا**

پێشتر هەوڵ و تێکۆشانی کۆمەڵی نێودەوڵەتیمان خستەڕوو، لە پێناو بڕیاردان لەسەر ڕێکەوتننامە نێودەڵەتییەکان، بۆ قەدەغەکردنی دەستێوەردانی نایاسایی لە خزمەتگوزارییەکانی فڕۆکەوانیی مەدەنی نێودەڵەتیداو، بنبڕکردنی کردە تیرۆرییەکان کە مۆرکی نێودەوڵەتییان هەیە کە بە ئامانجی ڕفاندنی فڕۆکە ئەنجام دەدرێن و سزادانی ئەنجامدەرانیان. تێبینی دەکرێت ڕێکەوتننامەی مۆنتریال کە لە ساڵی ١٩٧١دا بڕیاری لەسەردرا، (بۆ بنبڕکردنی کردە نایاساییە ئاراستەکراوەکانی دژی ئاسایشی فڕۆکەوانیی مەدەنی، بوو. هەروەها لە مادەی یەکەمی هەمان ڕێکەوتننامەدا، ئاماژە بۆ هەندێ کردە کراوەکە((ئەگەر بە ئەنقەست و بەبێ مافێکی یاسایی ئەنجام دران، ئەوا بە تاوان دادەنرێن)).

بەکارهێنانی دەستەواژەی(Unlawful Acts)، تەنیا ڕێکەوتننامەی مۆنتریالی نەگرتەوە، بەڵکو لە هەردوو ڕێکەوتننامەکەی دوایشدا بە کارهات، مەبەست لە ڕێکەوتننامەی لاهای کە لە ساڵی ١٩٧٠ بڕیاری لەسەردرا، لەو پێناوەدا بوو، وەکو لە ناونیشانەکەیەوە دەردەکەوێت، بریتییە لە بنبڕکردنی زەوتکردنی نایاسایی فڕۆکە کە ئەوەش ئاماژەیەکی ئاشکرایە، بۆ ئەوەی کە دەقەکانی

---

[٢٠٦] کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی فڕۆکەوانیی مەدەنی، لە خولی نا ئاسایی(خولی ٢٥) دا کە لە مۆنتریال بەسترا، پشتی بە پرۆتۆکۆڵێك بەست لە ١٠ی مایسی ١٩٨٤ بەراستکردنەوەی ڕێکەوتننامەی شیکاگۆی ساڵی ١٩٤٤، بە پێی ئەوە مادەیەکی بۆ زیادکرا لە ژێر ژمارەی ٣ی دووبارەدا، بڕگەی یەکەمی بڕیار لەسەر دانانی دەوڵەتانی ڕێکەوتننامەکە دەدات کە پێویستە لەسەریان پەنا نەبەنە بەر بەکارهێنانی چەك دژی فڕۆکەی مەدەنی لە کاتی فریندا، لە کاتی بەکارهێنانیدا گیانی سەرنشینانی و ئاسایشی فڕۆکەکە ئەکەوێتە مەترسییەوە. بڕوانە:الابعاد القانونية للارهاب الدولي)، د. عصام رمضان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣-٢٤.

ڕێکەوتننامەکە، تەنها بەسەر زەوتکردنی نایاساییدا(Unlawful) جێ بەجێ ناکرێت. بەڵام ڕێکەوتننامەی تۆکیۆ سەوبارەت بە تاوانەکان و کردەکانی تر کە لە ناو فڕۆکەدا ئەنجام دەدرێت، لە بابی چوارەمیدا ئاماژە بە حاڵەتەکانی(زەوتکردنی نایاسایی فڕۆکە) دەکات.

ئەو پرسیارەی لێرەدا دێتە پێشەوە ئەوەیە کە: ئایا زەوتکردنی یاسایی و زەوتکردنی نایاسایی فڕۆکە هەیە؟ و ئایا دەستتێوەردانی یاسایی و دەستتێوەردانی نایاسایی لە خزمەتگوزارییەکانی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتییدا هەیە؟

و مەبەست لە کردەی نایاسایی(Unlawful) چییە؟ و ئایا تاوانێك هەیە دژی مافی یاسایی ئەنجامبدرێت، ئەگەر گونجا لێرە دا چەمکی پێچەوانە بەکاربرێت؟

لەراستیدا لە چوارچێوەی تاوانی نێودەوڵەتیدایەو، بەهۆی نەبوونی یاسایەکی تاوانکاریی نێودەوڵەتیی یەککگرتوو، دەکرێت ئەوەی بە سەرجەم دەوڵەتانی جیهاندا جێبەجێ بکرێت، کە لە چوارچێوەیەکدا تیۆرێکی نایاسایی هەبێت، ئەگەری جێبەجێکردنی هەبێت لەسەر بنەمای جیهانی، ئەوا ناکرێت پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ ئەوەی کە یاسایی(Lawful) و ئەوەی کە نایاساییە(Unlawful)، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی دابنرێت. دەتوانرێت- تەنها- بگەین بە دیاریکردنی، لە چوارچێوەی یاسای تاوانکاریی تایبەت بە هەموو سیستمێکی یاسایی بە جیا. لێرەدا ڕەنگە کێشەیەکی تر بوروژێت، کاتێك ڕووبەڕووی چەندین یاسای تاوانکاری جیاواز دەبینەوە کە زۆربەیان جیاوازن، لەمەڕ پەیوەندی بە تیۆری نایاساییەوە، دەبینین ئەوەی لە سایەی سستمی یاسای تاوانکاری دەوڵەتێکدا یاسایی بێت و، بۆ یەکێکیان ڕەنگە لە چوارچێوەی یاسایی دەوڵەتێکی تردا، نایاسایی بێت. ئەمەش جارێکی تر وامان لێدەکات بپرسین، لەمەڕ مەبەست لە کردەی نایاسایی(Unlawful)، کاتێك تاوانی ڕفاندنی فڕۆکەکە مۆرکی نێودەوڵەتی هەیەو ڕەنگە چەندین یاسای سزادان کە شیاوی جێبەجێکردنە، لەسەرکردەی تاوانێك لەبەردەمماندا بێت. دەشێ ئاماژەکە ڕوون نەبێت بۆ دەستەواژەی(دەستتێوەردانی نایاسایی) یان (مافی نایاسایی) لە

ڕێکەوتننامەکانی بنبڕکردنی دەستێوەردان لە خزمەتگوزارییەکانی فڕۆکەوانیی مەدەنی کە ڕەگ و ڕیشەیەکی قوڵی هەیە، لە تیۆری نایاساییدا کە لایەنێکی گرنگە لە هەر سیستمێکی یاسایی سزادانداً. لە نموونە ئاشکراو دیارەکان لەو بارەیەوە، بیرۆکەی جەنگە لە سایەی یاسای نێودەوڵەتیی کۆنباودا، کاتێك تیۆری جەنگی عادیلانە(Just War)بڵاوبۆوەو جاران زانستیی نێودەوڵەتی جیاوازیی لە نێوان جەنگی عادیلانەو جەنگی ناعادیلانە(Unjust War)دا دەکرد، هەر چەندە کە کاری جەنگی- بە شێوەیەکی گشتی و بەبێ باسکردنی- بە یەکێك لەو تاوانانە دادەنران کە سزادانی لەسەرە، لە زۆربەی یاساکانی تاوانکاریی ناوخۆداو، لە چوارچێوەی یاسای نێودەوڵەتیی هاوچەرخدا، دەبینین کە بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان، سەرەڕای تاوانبارکردنی هەموو شێوەکانی بەکارهێنانی هێزو هەڕەشەکردنی بەکارهێنانی لە پەیوەندییە بێودەوڵەتییەکاندان، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، چەندین یاسای نەتەوە یەکگرتووەکان هەیەو بەتایبەتی ئەوانەی لە کۆمەڵەی گشتییەوە دەرچوون، پشتگیریی خەباتی چەکداریی بزووتنەوە سەربەخۆیی خوازە نیشتیمانییەکان دەکات و، لە بازنەی کاری نایاسایی نێودەوڵەتییدا، دەریان دەهێنێت[٢٠٧]. هەروەکو چۆن لە کۆنگرەی پێنجەمی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، بۆ قەدەغەکردنی تاوان و مامەڵەکردنی تاوانباران بەسترا، لەوێدا بە گشتی ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی پێویستە جەخت و قوڵبوونەوە، لە چەمکی دادوەری تاوانکاریدا بکرێت، لە ڕوو بەڕووبوونەوەی تیرۆردا، نەك لە ڕوو بەڕووبوونەوەی بەرەنگاربوونەوەی یاسایی دژی داگیرکردن[٢٠٨].

---

[٢٠٧] بڕوانە:

*International Journal, Vol. 1, Nos. 3-4, pp. 426- 427.*

[٢٠٨] بڕوانە:

*Fifth United Nations Congress for the prevention of Ceime and the* Treatment of offenders, (Geneva, 1975.(

وا دەردەکەوێت کە بۆچوونێك لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا. بۆ جێبەجێکردنی هەمان بیرۆکە هەیە کە پەیوەندیی بە تاوانەکانی رفاندنی فڕۆکەوەیە، ئەوەش ئەو خۆگرتنە لەدەستەواژەی(Unlawful) راڤە دەکات کە لە رێکەوتننامەکانی بنبڕکردنی دەستێوەردانی نایاسایی لە خزمەتگوزارییەکانی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتیدا هاتووە، بە مانای ئەوەی ئازادی دەدرێت بە هەموو وڵاتێکی ئەندامی رێکەوتننامەکە کە لای خۆیەوە بڕیار بدات، بەوەی کە ئەو کارە بە یاسایی یان نایاسایی دابنێت، سەبارەت بە رفاندنی فڕۆکە. و ئاسان نەبوونی مەسەلەی راگەیاندنی بڕواکردنی وڵاتێك بەڕەوابوونی یەکێك لە کردەکانی رفاندنی فڕۆکە، ئەوا ئەو هەڵوێستە دەکرێ بەوە دەربخرێت، ئەویش لە رێگەی بەدەستەوەنەدانی ئەنجامدەرانی یەکێك لە تاوانەکانی رفاندنی فڕۆکەدا.

بە دوور دەزانرێ کە دەوڵەتێك هەستێت بە هاوکاریکردن و پشتگیریکردنی بزووتنەوەکانی رزگاریخوازیی نیشتیمانی، بە بەدەستەوەدانی رفێنەرەکانی فڕۆکەیەك کە سەر بەو بزووتنەوانەن، یان ئەوانەی ئەو کردەیە ئەنجام دەدەن، بەمەبەستی دەربازبوون لەسەرکوتکردنی سیاسی، یان کۆمەڵایەتی کە دەوڵەت لە دژی ئەندامەکانی ئەو بزووتنەوانە پیادەی دەکات. هەر وەکو چۆن پێش بینی ناکرێت کە دەوڵەتێکی عەرەبی، یەکێك لە خۆبەختکەرانی فەلەستینی، کە هەستاوە بە رفاندنی فڕۆکەیەکی ئیسرائیلی، بدات بەدەست دەسەڵاتدارانی ئەو دەوڵەتەوە. یان یەکێك لە دەوڵەتانی خۆرئاوا یان ئەمریکا، یان لە بلۆکی کۆمۆنیستی یان تەنانەت دادگاییکردنی[٢٠٩]. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی لە گوزارشتکردنی دەوڵەتان، بۆ ئەوەی کامە یاساییەو کامە نایاساییە؟ بە پێی تیۆری کە باوە، لە سستمە سیاسییەکەی و یاساکانی سزادانیدا.

بەو پێیە روون دەبێتەوە کە رێکەوتننامەی دەستێوەردان، لە خزمەتگوزارییەکانی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتیدا- تەنها- کردەکانی رفاندنی نایاسایی فڕۆکە دەگرێتەوە، لە کاتێکدا کە کردەی رفاندنی یاساییش هەیەو ئەو رێکەوتنامانە باسیان نەکردووە. لەوانەیە ئەوەش مەودای شکستی ئەو

---

[٢٠٩] بڕوانە کتێبی: "الارهاب الدولي"، د. العزيز منجيمر، سەرچاوەی ئاماژە پێکراو، ل١٩٤-١٩٥.

بەڵگەنامانەی، سەبارەت بە چارەسەکردنی تاوانی تیۆری نێودەوڵەتی و کۆتایی هێنان پێی، بەشێوەیەکی بنەڕەتی روون بکاتەوە، ئەوەش وامان لێدەکات، جەخت لەسەر پێویستی رەچاوکردنی ئەمانە بکەینەوە:

١-دانەنانی رفاندنی فڕۆکە لەو کردانەدا کە هەر دەوڵەتە بە جیا لە رووی یاسایی و نایاساییەوە بە پێی یاساکانی تاوانکاری ـمەزەندەی دەکات، لەگەڵ دانانی پێوەرێکی ورد، بۆ ئەو کردە نایاساییانەی کە تاوانەکانی دەستێوەردان، لە خزمەتگوزارییەکانی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتی پێکدەهێنێت، لە چوارچێوەی سەرجەم یاساکانی تاوانکاری دەوڵەتانی ئەندام لەو رێکەوتننامانەدا کە ئەو دیاردەیە چارەسەر دەکات.

٢-پابەندبوونی سەرجەم دەوڵەتانی ئەندامی رێکەوتننامەکە بە لابردنی کۆسپ و لەمپەرە یاساییەکان کە رێگا لە بەدەستەوەدانی ئەنجامدەرانی تاوانی رفاندنی فڕۆکەکە دەگرێت، یان دەستێوەردان لە خزمەتگوزارییەکانی فڕۆکەوانی نێودەوڵەتی، لەوانەش رێگە نەگرتن لەوەی هانی ئەنجامدانی ئەم تاوانانە دەدات، بەوەی کە مەترسی پێکدەهێنێت و هەڕەشە لە گیانی بێ تاوانان دەکات کە مەسەلەی بڕیاری تاوانەکە ناهێڵیرێتەوە بۆ هەر دەوڵەتێك بە پێی هاندەری ئەنجامدانی ئەو تاوانانەو هەڵوەشاندنەوەی ئاکاری سیاسی، لەسەر ئەم تاوانانەو دانانی لە تاوانەکانی یاسای گشتیدا، ئاراستەی باو لە رێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان و زانستی نێودەوڵەتییدا، بریتییە لەبەدەستەوەنەدانی و سوککردنی ئەو سزایانەی لەسەر ئەنجامدەرانیان دانراوە[٢١٠].

٣-دانانی تاوانەکانی رفاندنی فڕۆکە لە پەیماننامەکانی بەدەستەوەداندا، لە نێوان دەوڵەتانی ئەندامی رێکەوتنامەکەدا، یان ئەوانەی کە لە داهاتوودا لە نێوانیایدا دەبەسترێن، بۆ ئاسانکردنی پرۆسەی بەدەستەوەدانی ئەنجامدەرانی

---

(٢١٠) لەرێکەوتننامەکانی تایبەت بە بەدەستەوەدانی تاوانباراندا، بڕوانە:

"الاتفاقيات القضائية الدولية و تسليم المجرمين من عام ١٩٢٦ الى ١٩٨٩"، محمود زكي شمس، دمشق، بەشی یەکەم ١٩٨٦، بەشی دووەم ١٩٨٩.

ئەو تاوانانەو دادگایکردنیان، لەبەردەم دادگاکانی دەوڵەتی پەیوەندیداراو سەپاندنی سزای گونجاو بەسەریاندا.

٤-پەرەپێدانی هاوکاریی نێودەوڵەتی، لە بواری قەدەغەکردنی تاوانی رفاندنی فڕۆکە، یان دەستتێوەردان لە خزمەتگوزارییەکانی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتیدا، بەهۆی رێوشوێنی یاسایی و کارگێڕیو هونەریو، پابەندبوون بە پرەنیسیپی یارمەتیدانی یەکتریو ئاڵوگۆڕکردنی ئەو زانیارییانەی پەیوەندییان هەیە بەکردە تیرۆرییەکانو ئەنجامدەرانیان، لە نێوان دەزگا پەیوەندیدارەکان لە دەوڵەتانی ئەندامی رێکەوتننامەکەدا.

# بابەتی چوارەم
# چەند ڕێکەوتننامەیەکی تر،
# بۆ بنبڕکردنی هەندێ دیاردەی تیرۆری نێودەوڵەتی

## یەکەم- لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی:

ڕەنگە تێبینی چەندین ڕێکەوتننامەو پرۆتۆکۆڵی تر بکەین کە تایبەتن بە هاوکاریی نێودەوڵەتی، بۆ بنبڕکردنی تیرۆر بەشێوە جیاوازەکانیەوە کە دواتر گەلاڵەکراوە، لەگەڵ ئەو ڕێکەوتننامانەی لە پێشەوە ئاماژەیان بۆکرا، ئەوەش وەکو[٢١١]:

١-ڕێکەوتننامەی پاراستنی ماددی لە مادە ئەتۆمییەکان، کە لە ٢٦ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٩ لە ڤییەنادا بەسترا، ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی بڕیاریان لەسەردا، یان چوونە ریزی ئەو ڕێکەوتننامەیەوە، گەیشتە ٥٥ دەوڵەتو، چووە خانەی کارپێکردنەوە.

٢-پرۆتۆکۆڵی پەیوەندیدار بە بنبڕکردنی کردەکانی توندوتیژیی نایاسایی، لەو فڕۆکە خانانەی کە خزمەتی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتی تێدا دەکرێت، کە لە ٢٤ی شوباتی ساڵی ١٩٨٨ لە مۆنتریالدا بەستراو، ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی بڕیاریان لەسەردا، یان چوونە ریزییەوە، گەیشتە(٦٥) دەوڵەتو، چووە خانەی کارپێکردنەوە.

٣-ڕێکەوتننامەی بنبڕکردنی کردە نایاساییەکان، لە دژی ئاسایشی کەشتیوانی دەریایی ئاراستە دەکرێت، کە لە ١٠ی ئاداری ١٩٨٨ لە ڕۆمادا

---

[٢١١] بڕوانە:(الامم المتحدة و مواجهة الارهاب)، د. بطرس غالي، مجلة السياسة الدولية، العدد ١٢٧، يناير ١٩٩٧، ل٨-١٣و، هەروەها: كلمة الامين العام للامم المتحدة، د. بطرس غالي، لە کردنەوەی لوتکەی ئاشتی لە(شرم الشيخ)، ١٣ی مایسی ١٩٩٦.

بەستراو، ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی بڕیاریان لەسەردا، یان چوونە ریزییەوە، گەیشتە ٣٣ دەوڵەت و، چووە خانەی کارپێکردنەوە.

٤-پرۆتۆکۆڵی پەیوەندیدار بە بنبڕکردنی کردە نایاساییەکانی ئاراستەکراو، لە دژی ئاسایشی دامەزراوە جێگیرە بەرپاکان لە کەنارەکاندا، کە لە ١٠ی مارتی ١٩٨٨ لەرۆمادا بەستراو، ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی بڕیاریان لەسەرداو، ئەوانەی چوونە ریزییەوە گەیشتە ٣١ دەوڵەت و، چووە خانەی کارپێکردنەوە.

٥-رێکەوتننامەی جیاکردنەوەی تەقینەوەی پلاستیکی، بەمەبەستی دۆزینەوەی، کە لە ١ی ئاداری ١٩٩١ لە مۆنتریالدا ئیمزا کراو، ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی بڕیاریان لەسەردا، یان چوونە ریزییەوە گەیشتە ٢٣ دەوڵەت و، هێشتا نەچۆتە خانەی جێبەجیکردن و کارپێکردنەوە[٢١٢].

٦-رێکەوتننامەی پەیوەندیدار بە ئاسایشی کارمەندانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەو کەسانەی لە گەڵیاندان، کە کۆمەڵەی گشتی لە کانونی یەکەمی ١٩٩٤دا بڕیاریداو، ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی بڕیاریان لەسەرداو، ئەوانەی هاتنە ریزییەوە، گەیشتە(٩) دەوڵەت، هێشتا رێکەوتننامەکە نەچۆتە خانەی جێبەجێکردنەوە.

## دووەم: لەسەر ئاستی ئیقلیمی:

١- رێکەوتننامەی قەدەغەکردنی کردە تیرۆرییەکان کە بە تاوان لە دژی کەسان و پەیوەندیی بەو کردانەوە هەیە دادەنرێت، کە بایەخی نێودەوڵەتی پێدەدرێت و، سزادانی لەسەرە، کە لە ٢ی شوباتی ١٩٧١دا لەلایەن رێکخراوی وڵاتانی کیشوەری ئەمریکاوە بڕیاری لەسەردرا، ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی بڕیاریان لەسەردا، یان چوونە ریزییەوە، گەیشتە ١١ دەوڵەت و، ئێستا کاری پێدەکرێت

٢- رێکەوتننامەی ئیقلیمی بۆ بنبڕکردنی تیرۆر، کە لە ٤ی تشرینی دووەمی ١٩٧٨دا، لەلایەن وڵاتانی ئەندام لە یەکێتی باشووری ئاسیا بۆ هاوکاریی

---

[٢١٢] ئەو رێکەوتننامەیە دەبێت ٣٥ دەوڵەت بڕیاری لەسەر بدات، یان بچێتە ریزییەوە، تا بچێتە نێو خانەی جێبەجێکردنەوە.

ئیقلیمی بڕیاری لەسەردراو، ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی بڕیاریان لەسەردا، یان چوونە ریزییەوە، گەیشتە ٧ دەوڵەتو، چووە خانەی کارپێکردنەوە.

# بەشی سێیەم
# خەباتی چەکداریی پەیوەست
# بە مافی دیاریکردنی چارەنووس و تیرۆری نێودەوڵەتی

لەم بەشەدا باس لە جیاوازیی یاسایی، لە نێوان خەباتی چەکداریی پەیوەست بە مافی دیاریکردنی چارەنووس و تیرۆری نێودەوڵەتی دەکەین، لە هەوڵداندا بۆ جیاکردنەوەی توندوتیژی جوامێری و توندوتیژی شەڕەنگێزی، وەکو زانایانی یاسای نێودەوڵەتیی کۆنباو کە هەستان بە جیاکردنەوەی جەنگی عادیلانەو جەنگی نا عادیلانە، دەردەکەوێت کە دوور خستنەوەی توندوتیژی لەبنەڕەتدا، لە چوارچێوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا کە بەرژەوەندیی و ململانێ خۆویستەکان دەیبزوێنێت، وەکو خەونێك ماوەتەوە کە هێنانەدی هێشتا دوورە.

مانای مافی دیاریکردنی چارەنووس کە دەبێت هەموو دەوڵەتێك دەسەڵاتی بەرزی لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیدا هەبێت، بەبێ دەستێوەردانی بیانی[٢١٣] و مێژووی ئەم مافەش دەگەڕێتەوە، بۆ چەندین ساڵی رابوردوو، کاتێك

---

[٢١٣] لە پرەنسیپی مافی دیاریکردنی چارەنووسدا، بڕوانە: حسین کامل"حق تقرير المصير القومي" المجلة المصرية للقانون الدولي، مجلة ١٢، الجزء الاول، يناير ١٩٥٦، ص١٠. و د. محمد حافظ غانم"العلاقات الدولية العربية"، القاهرة، ١٩٦٧، ص١٠١. و د. محمد طلعت الغنيمى"بعض الاتجاهات الحديثة في القانون الدولي العام"، منشأة المعارف بالاسكندرية، ١٩٧٤، ص ١٩٩ وما بعدها. و جعفر عبدالسلام"المنظمات الدولية" القاهرة، ١٩٨٢ ص٢٨٤ وما بعدها. د. صلاح الدين عامر"قانون التنظيم الدولي النظرية العامة" دار النهضة العربية، الطبعة الثالثة، ١٩٨٤، ص٢٧٣.

و د. تەلعەت غەنیمی پێی وایە کە مافی دیاریکردنی چارەنووس ئاماژە بەوە دەکات کە"هەموو نەتەوەیەك دەسەڵاتی تەواوی هەبێت تیایداو بۆی هەبێت هەر کاتێ ویستی پراکتیزەی بکات".

د. محمد طلعت الغنيمي"الوسيط في قانون السلام"، منشأة المعارف بالاسكندرية، ١٩٨٢، ص٣٣٢.

و کوبان بەم شێوەیە پێناسەی دەکات:

کە جێی قسەو باسی بیریاران و فەیلەسوفان بووو، یەکێکیش لەو پرەنسیپە گرنگانەی کە بانگەشەی بۆ شۆڕشی فەرەنسی کرد. لەراستیدا شۆڕشی فەرەنسی بوو کە بۆ یەکەمین جار ئاماژەی بۆ ئەو پرەنسیپەکرد لە کاتێکدا بوو کە سەرکردەکانی ئامادەیی خۆیان، بۆ پشتگیریی و پاڵپشتی ئەو گەلانە راگەیاند کە هەوڵی گەیشتن بە مافی دیاریکردنی چارەنووسیان دەدەن، لە ئەنجامی پایەندبوون بەو مافەوە، ئەوە بوو هەڵمەتە پروپاگەندەییەنارەوەکانی وەستان کە ئیمپراتۆریەتی کۆنەپەرستی ئەورووپی، لە دژی سستمی نوێی فەرەنسا ئاراستەی دەکرد، بە ئامانجی تێکدانی پشتگیرییەکانی و لە ناوبردنی[٢١٤]. لەگەڵ ئەوەشدا مافی دیاریکردنی چارەنووس، وەك پرەنسیپێکی سیاسی، دوور لەبازنەی یاسای نێودەوڵەتی گشتی، تا جەنگی یەکەمی جیهانی مایەوە.

لەراستیدا سیاسەتی داگیرکاری کە دەوڵەتانی ئەورووپا پیادەیان کرد، بووە هۆی دوور خستنەوەی پرەنسیپی مافی گەلان، لە دیاریکردنی چارەنووسیان، لە بازنەی یاسای نێودەوڵەتی کۆنباودا. بنەماکانی ئەو یاسایە، تایبەت بوو بە کێشەیەك لەو کێشانەی کە دەوڵەتانی ئەورووپای داگیرکاری ورووژاندنی، ئەویش دابەشکردنی هەرێمەکانە لەنێوان ئەو دەوڵەتانەدا، کە ئەرکەکەی تەنها لە چوارچێوەی رێکخستنی دەستەبەرکردنی بەسەر ئەو کۆلۆنیالانەداو جەخت

---

*The right of a nation to constitue an independent start and determine its own*

*(LONDON, 1944), pp. 45- 46.*

و براونلی بەم شێوەیە پێناسەی دەکات:

*The right of Cohesive national group(Peoples) to choose for them selves s from of public internationale l 1973) P. 575.*

[٢١٤] دەبێ لێرەدا ئاماژە بەوە بکەین کە ئەو راگەیاندنەی کۆمەڵەی گشتی فەرەنسی دەریکرد لە ١٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٧٩٢دا، سەبارەت بە پشتگیریکردنی هەموو ئەو گەلانەی داوای ئازادی دەکەن و ئامادەیی نیشان دەدەن، بۆ پارێزگاریی لەو هاوولاتیانەی کە رووبەرووی ئازار دەبنەوە، بەهۆی خەباتیان لە پێناو ئازادیدا. بڕوانە:الغنیمی الوسیط في قانون السلام"، د. محمد طلعت الغنیمي، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢٤.

کردنی لەسەر بەرژەوەندیی دەوڵەتانی داگیرکەر بوو. هەوڵی حکومەتەکان و زانستەکان لەوکاتەدا، هەموویان بە ئاراستەی دانانی ئەو پرەنسیپ و تیۆرانە بوون کە دەبێتە هۆی شەرعییەتدان و گونجاندنی یاسایی، بۆ ئەم سستمانە. کۆلۆنیالکراوەکەیان بە بەشێك لە دەوڵەتی بنەڕەتیی دانا و، هەروەها بەڕێوەبەردنی کۆلۆنیالکراوەکە، لە ناخی کارەکانی سەروەریی ناوخۆیی دەوڵەتە سەرەکیەکە دانا.

ئالێرەوە پرەنسیپی مافی گەلان، لەدیاریکردنی چارەنووسدا، دوور لە بازنەی یاسایی نێودەوڵەتیی گشتی مایەوە کە گەلانی ئەو هەرێمانەی پشت گوێ خست و نەیکردە بابەتێك، بۆ پاراستنیان کە دانی نەنا بەوەی شیاوی ئەوەبن چێژ لە مافەکانی خۆیان وەربگرن، چ ئەوە مافی سەروەریی، یان مافی چێژ وەرگرتن لە پێگەو کەسایەتی نێودەوڵەتی بێت، ئەوە لە بۆچوونی یاسای نێودەوڵەتیدا، نەبەستراوەتەوە بە بڕگەکانی و، دەکەوێتە دەرەوەی چوارچێوەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوە، هەرچەندە پرەنسیپی گەلان لە بڕیاردانی چارەنووسیاندا، لەلایەن ولسۆنی سەرۆکی ئەمریکییەوە، لە ساڵی ١٩١٦دا پشتگیریی کرا، کە یەکێك بوو لەو پرنسیپانەی لە ١٤خاڵەکەدا هات کە لە ساڵی ١٩١٨دا رایگەیاند[٢١٥]، هەروەها لە جاڕنامەی ئاشتیی حکومەتی سۆڤیەتدا هات، کە دوابەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر دەریکرد، دەربارەی مافی بڕیاردان لەسەر چارەنووسی، بۆ هەموو گەلانی ئیمپراتۆریەتی روسیا راگەیاندو دواتریش لینین لە ساڵی ١٩٢٠دا، بۆ هەموو بزووتنەوە رزگاریخوازەکان، لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا رایگەیاند[٢١٦]. بەڵگەنامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان ئاماژەی بە پرەنسیپی مافی گەلان، بۆ بڕیاردان لە چارەنوسی خۆیان نەکردبوو، تەنیا ئاماژەی بە ئینتیداب کردبوو، بەوەی کە سستمێکی نێودەوڵەتییە، بۆ بەڕێوەبردنی کۆلۆنیاڵەکان کە

---

[٢١٥] بڕوانە:

(London, 1922), P. 45.

[٢١٦] بڕوانە دەقی مادەی ٢٢ لە بەڵێنامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان.

**جیاکرانەوە، لەو وڵاتانەی لە شەڕی جەنگی یەکەمی جیهاندا، بەتایبەتی تورکیا شکستیان هێنا[٢١٧]. واتە پرەنسیپەکە دانی پێدانەنرا، تەنیا لە سنووری خۆنەدان لە بەرژەوەندیی وڵاتە سەرکەوتووەکاندا نەبێت.**

[٢١٧] بڕوانە:
,(New York, 1943), vol. V,
p. 270, vol. X, p. 203.

# بابەتی یەکەم

# سروشتی یاسایی مافی دیاریکردنی چارەنووس

دەوڵەتان لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگەکەدا، بایەخێکی زۆریان بە پرەنسیپی مافی گەلان دا، لە دیاریکردنی چارەنووسیان، پەیماننامەکانی ئاشتی کە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە بەستران، چەند دەقێکیان لەخۆگرتبوو، بە پێدانی مافی دیاریکردنی چارەنووس، بە هەندێ لە هەرێمەکانی کیشوەری ئەوروپا. هەرچەندە ئەو پەیماننامانە، بە هەر شێوەیەك بێت، دانیان بە مافی دیاریکردنی چارەنووس و ئامرازەکانی پراکتیزەکردنیان ناوە، کەچی گومان سەبارەت بە بەهای یاسای ئەو پرەنسیپەو ئەو شوێنەی کەپری دەکاتەوە، وەکو یەکێك لە پرنسیپە دانراوەکانی یاسای نێودەوڵەتی، لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگە جیهانیەکەدا مایەوە[218]. تێڕوانین بۆ مافی دیاریکردنی چارەنووس، وەکو پرەنسیپی سیاسی، لەلایەن زۆربەی زانستەکانەوە، لە نێو ئەو هەوڵانەی کە لە لایەنێکی ترەوە دەدرا زاڵ بوو، بەوەی کە بە پرەنسیپی یاسایی نا ئاسایی دادەنرا کە لە چوارچێوەیەکی بەرتەسکتردا جێبەجێ بکرێت.

---

(٢١٨) جێی ئاماژە بۆ کردنە لیژنەی یاسایی تایبەت کە کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ساڵی ١٩٢٠دا، پێکی هێنا بۆ لێکۆڵینەوەی ململانێی نێوان سویدو فنلەندا، دەربارەی سەروەریی بەسەر دوورگەی ئەلاند(Aland) کاتێك کە فنلەندا سەروەریی خۆی بەسەر دوورگەکەدا پیادە دەکرد، بە شێوەیەکی کاریگەر، سوید لەلای خۆیەوە بانگەشەی بۆ ئەو. دەرکرد، گەلی ئەو دوورگەیە ئارەزووی چوونە پاڵ سویدیان هەیەو هەردوو لایەن، لەسەر ئەو داوایە رێکەوتن لە ئەنجومەنی نەتەوەکاندا، ئەمەش مانای وایە کە پرەنسیپی مافی گەلان، لە بڕیاردانی چارەنووسیاندا، لە پرەنسیپە دانراوەکانی یاسای نێودەوڵەتیدا نییە. بۆ زیاتر روونکردنەوە بڕوانە:" التنظيم الدولي- النظرية العامة" سەرچاوەی پێشتر ئاماژەی پێکراوە، د. صلاح الدين عامر، ل١٧٦- ١٧٧و ل٢٦٠- ٢٦٦.

بە هەڵایسانی جەنگی دووەمی جیهانی، پرەنسیپی دیاریکردنی چارەنووس سەر لە نوێ بووژایەوەو بووە جێی بایەخ پێدانی گەورە، لەلایەن سەرجەم گەلانی دەوڵەتانی ئازادی جیهانیەوەو، هەروەها رێگەی بردەوەسەر راگەیاندنی ئەتڵەنتی کە رۆزفلتی سەرۆکی ئەمریکاو چەرچلی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا لە ١٤ی ئابی ١٩٤١دا رایانگەیاند کە تیایدا ئاشکرایان کرد، کە هەوڵ نادەن بۆ هیچ پاوانکردنێکی ئیقلیمی و رێز لە مافی گەلان، لە هەڵبژاردنی سستمی حوکمڕانی گونجاو دەگرن[٢١٩]. دواتر لە هەموو ئەو راگەیاندنانەی کە پاشان دەرچوون بە تایبەتی راگەیاندنی نەتەوە یەککگرتووەکان، لە یەکەمی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٢[٢٢٠] و، راگەیاندنی مۆسکۆ لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٣[٢٢١]دا ئاماژەی پێکراو، بە تەواوەتی لە لایەن کۆنگرەی دۆمبرتۆن ئۆکس لە ساڵی ١٩٤٤و، کۆنگرەی یاڵتا لە ٣ی شوباتی ١٩٤٥دا پەسەندکرا.

## یەکەم- نەتەوەیەکگرتووەکان و مافی دیاریکردنی چارەنووس:

لەگەڵ دامەزراندنی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٤٥دا، دووجار پرەنسیپی دیاریکردنی چارەنووس، لە بەڵگەنامەکەیدا هاتووە:

---

[٢١٩] لە دەقی بەڵگەنامەی ئەتڵەنتی بڕوانە:

*A. J. I. L,*

*35(1941) supple., p. 191*

*Nation 1958), Appendix B, p. 975.*

[٢٢٠] دەقی لێدوانەکە، بڕوانە:

*36 A.J.I.L., (1941) Supple., P191; Russell, ibid, Appendix C.P.976*

[٢٢١] لەدەقی لێدوانەکە، بڕوانە:

*Russll ibid; Appendix 977; q. u. s Department of state Bulletin, 1943. PP. 308-309*

یەکەمیان لە بڕگەی دووەم لە مادەی یەکەمیدا کە تایبەتە بە ئامانجەکانی نەتەوە یەککگرتووەکان، لە گرنگترین بنەماکانی گەشەپێدانی پەیوەندیی نێودەوڵەتی "بەهێزکردنی پەیوەندیی تەبایی لە نێوان نەتەوەکاندا، لەسەر بنەمای ریزگرتن، لەو پرەنسیپەی کە داوای ئاستکردن لە مافی نێوان گەلاندا دەکات، بەوەی کەهەریەکەیان مافی بڕیاردان، لەسەر چارەنووسی خۆیان هەبێت و هەروەها گرتنەبەری ریوشوێنی پێویست بۆ پتەوکردنی ئاشتی جیهانی).

ئاماژەیەکی تر لەبواری خستنەڕووی بنەماکانی هاوکاریی نێودەوڵەتیی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا هاتووە، کەمادەی (٥٥) بڕیاری داوە لەسەر ئەوە کە (خواستێکە لەئامادەکردنی سەقامگیریی و خۆشگوزەرانی کەپێویستن بۆ بەرپاکردنی پەیوەندیی دروست و تەبا، لەنێوان نەتەوەکاندا لەسەر بنەمای رێزگرتن ، لەو پرنسیپەی کەداوای ئاستکردن دەکات لەمافی نێوان گەلاندا، بەوەی کەهەریەکەیان مافی بڕیاردانی لەسەر چارەنووسی خۆی هەبێت نەتەوەیەکگرتووەکان هەوڵ دەدات بۆ:

أ-بەدیهێنانی ئاستی بەرزی خۆشگوزەرانی و بژێوی و دەستە بەرکردنی هۆیەکانی بەکارهێنانی بەردەوام، بۆ هەر کەسێك و گەشەدان بە هۆکارەکانی گەشەکردن و پێشکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی.

ب-چارەسەرکردنی کێشە ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەندروستییە نێودەوڵەتییەکان و ئەوانەی پەیوەندییان پێوەیەتی و پتەوکردنی هاوکاریی نێودەوڵەتی لە کاروباری فەرهەنگی و خوێندندا.

ج-رێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە سەرەکییەکان، بۆ هەمووان بەبێ جیاوازیکردن، بەهۆی رەگەزو زمان و ئایینەوە دەستەبەر بکرێت بەبێ جیاوازیکردن، لە نێوان پیاو ژنداو بەکردەوەئەو ماف و ئازادییانە لەبەرچاوبگیرێت".

بەشێوەیەکی گشتی، بەشەکانی بەڵگەنامەکە لە ١١-١٣ کە پەیوەندیی بە بەڕێوەبەردنی ئەو هەرێمانەوە هەیە کە خاوەنی دەسەلاتی ئۆتۆنۆمی نین و، ئەو هەرێمانەی لەژێر سستمی چاودێریدان برەو بە بیرۆکەی دیاریکردنی چارەنووس

دەدەن، وەکو پرەنسیپێکی یاسایی، لە چوارچێوەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، بەرێگەیەکی ناراستەوخۆ، هەر وەك جەخت لەسەر بوونی ماف و پێویستی رێزگرتن لێی، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی دەکاتەوە[222]. بڕیارە یەك لە دوا یەکەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان و بەڵگەنامە نێودەوڵەتییە جیاجیاکان، جەخت لەسەر پرەنسیپی دیاریکردنی چارەنووس و مافی گەلان، لەرزگاربوون لە هەموو شێوەکانی داگیرکاری و نەهێشتنی بە شێوەیەکی تەواو دەکەنەوە[223].

---

[222] بە تایبەتی، بڕوانە، بە مادەکانی ٧٣و ٧٦ لە بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان. جێی ئامارژە بۆکردنە، بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان، تەنیا چەق لەسەر رێکخستنی پەیوەندیی نێوان ئەو قەڵەمڕەوانەی لەژێر چاودێرییدان و بەڕێوەبردنی ئەو قەڵەمڕەوانە دەبەستن، خۆی لە قەرەی مافی گەلان و ئەو ئیقلیمە پاشکۆیانە نادات، بۆ بەرگریکردن لە خۆیان، بەڵگەنامەکە لەبەشەکانی١١و١٢و١٣دا، دان بە مافی گەلاندا دەنێت، بۆ دیاریکردنی چارەنووس، بەڵام چۆنیەتی پراکتیزەکردنی ئەو مافە دیاری ناکات و، ئەمەش وای لە کۆمەڵەی گشتی کرد کە کۆمەڵێ بڕیار دەربکات، کە سەرجەمیان جەخت لەسەر مافی بەکارهێنانی هێزو خەباتی چەکدارانە دەکات، بۆ گەیشتن بە بڕیاردان لەسەر چارەنووس.

[223] لێرەدا ئاماژە بەو بڕیارانە دەکەین:

١. جاڕنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ لە ساڵی ١٩٤٨، کە جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئیرادەی گەلان، بناغەی شەرعیەتی حکومییەو گوزارشت کردن لە ئیرادە کەش، لەرێگەی هەڵبژاردنی ئازادەوە دەبێت.

٢. بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە(٦٣٧) (٧)ی ساڵی ١٩٥٢ کە پشتگیریی پرەنسیپی مافی بڕیاردان لەسەر چارەنووس دەکات و دەخوازێت کە خواستەکانی گەلان دەستەبەر دەبێت، لە رێگەی راپرسییەوە، یان هەر رێگەیەکی دیموکراسی ترو، باشتر وایە لەژێر چاودێریی نەتەوەیەکگرتووەکاندا بێت.

٣. بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ژمارە ١٥١٤ (١٥) کە لە ١٤ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٠دا دەرچوو، بە بەخشینی بۆ گەلان و ئیقلیمە کۆلۆنیالییەکان کە بەبڕیاری نەهێشتنی داگیرکاری ناوبراوو، بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە ١٦٥٤(١٦)ی ساڵی ١٩٦١، بە دامەزراندنی لیژنەیەکی تایبەت کە ئامۆژگاریی لەو بارەوە پێشکەش بکات.

٤. بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە(١٨٠٣)ی ١٤ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٢ تایبەت بەسەروەریی هەمیشەیی، بەسەر سەرچاوە سروشتیەکاندا.

پراکتیزەکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووس، بەهەموو ئەو ئامرازانەی لەبەردەستدان[228].

نەتەوەیەکگرتووەکان سووربوو لە سەر جەختکردنی لە پەرەنسیپی مافی گەلان، لە بڕیاردان لەسەر چارەنووسی خۆیان، لەچەندین بۆنەدا، کە نگترینییان لە(ڕاگەیاندنی پردنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتیی پەیوەندیدار بە پەیوەندیی تەبایی و هاوکاریی لە نێوان دەوڵەتاندا، بە پێی بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان)[229] هاتووەو ئەوەی کە دان بە مافی گەلاندا دەنێت، بەبێ دەستێوەردانی بیانی، لە هەڵبژاردنی سستمی دەسەڵاتی گونجاو بۆ خۆی، کە ئازادانە هەوڵبدات، بۆ بەدیهێنانی گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی، هەر وەك چۆن لە ڕاگەیاندنەکەدا بڕیاردراوە کە پێویستە لەسەر

---

[228] بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە ٢٦٢١، سەبارەت بە(بەرنامەی کار لە پێناوی جێبەجێکردنی تەواوی ڕاگەیاندنی پێدانی سەربەخۆیی بە وڵاتان و گەلانی داگیرکراو، لە ١٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٠دا دەرچووە.

[229] بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان ژمارە(٢٦٢٥) (٢٥) لە ڕۆژی ٢٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٠، کە بەتێکڕا پەسەندیان کرد، لەم بارەیەوە بڕوانە:

*enshrined in the Charter of the United Nations, all peoples have the riht freely to determine, Without external interference, thier political stastus and to pursue their economic, Social and Cultural development, and every state has the duty to*

*charter, a status separate and dixtinct from the retritory of the state administering it, and uch Separate and distinct status under the Charter Shall exist until the people of the non- Self- Governing tertitory have exercised their right of Self- determination in a ccordance with the charter, and particularyits*

*U. N. Gen Ass. Resolution 2625(XXV), Annex; 65 A, J. I. L., (1971), p. 243.*

دەوڵەتان، بە شێوەی تاك یان كۆمەڵ، كە گەشە بە بنەماو هۆشیاری پرەنسیپی یەكسانی لە مافەكان‌و مافی بڕیاردانی چارەنووس، بە پێی دەقەكانی بەڵگەنامەی نەتەوەیەكگرتووەكان بدەن‌و، پێشكەشكردنی یارمەتی پێویست بۆ نەتەوە یەكگرتووەكان بكرێت، بۆ هەستانی بە ئەركی خۆی لەو بوارەدا.

ڕاگەیاندنەكە هانی ئەو دەوڵەتانە دەدات، بە بەكارنەهێنانی هێز بۆ بێ بەریی كردنی ئەو گەلانەی دەكەونە ژێر دەسەلاتییانەوە، لە پراكتیزەكردنی مافی بڕیاردانی چارەنووسیان‌و بەدیهێنانی سەربەخۆیی‌و ئازادییەكانیان‌و، دەوڵەتانی تریش مافی پێشكەشكردنی یارمەتی‌و پشتگیریی ئەو گەلانەیان هەیە كە پەیڕەوی مافی بڕیاردانی چارەنووسی خۆیان دەكەن.

دەقی بڕیاری ژمارە، ۲۸۹۰(۲۷)، تایبەت بە جێبەجێكردنی بریكارە تایبەتمەندەكان‌و دەزگاكانی نێودەوڵەتی وا بەستە بە نەتەوە یەكگرتووەكانەوە، بۆ ڕاگەیاندنی پێدانی سەربەخۆیی بۆ ئەو دەوڵەت‌و گەلانەی داگیركراون، لە بڕگەی دووەمی جێبەجێكردنەكەدا كە سەر لە نوێ كۆمەڵەی گشتی‌و ئەنجومەنی ئاسایش‌و دەزگاكانی تری سەر بە نەتەوە یەكگرتووەكان، دانی بەرەوابوونی خەبات‌و كۆششی گەلانی داگیركراودا نا، لە پێناو بەدیهێنانی ئازادی‌و سەربەخۆیی، وەكو ئاكامێكی پێویست، بۆ پێشكەشكردنی هەموو یارمەتییەكی ماددی‌و مەعنەوی پێویست، بە بزووتنەوە ڕزگاریخوازە نیشتیمانییەكانی هەرێمە كۆلۆنیالكراوەكان، لەلایەن نەتەوە یەكگرتووەكانەوە[230]. هەروەها بڕیاری ۳۱۱۸(د-۲۸) تایبەت بە جێبەجێكردنی بریكارە تایبەتەكان‌و دەزگاكانی نێودەوڵەتی وابەستە بە نەتەوە یەكگرتووەكانەوە، بۆ ڕاگەیاندنی پێدانی سەربەخۆیی، بەو دەوڵەت‌و گەلانەی داگیركراون، لە بڕگەی دووەمی جێبەجێكردنەكەدا هەمان مەسەلەی پێشووی دووبارە كردەوە لە ۱۲ی كانونی یەكەمی ۱۹۷۳دا، كۆمەڵەی گشتی بڕیاری ۳۰۳۱(۲۸)ی دەركرد، سەبارەت بە

---

[230] ئەو بڕیارە لە ١٤ی كانوونی یەكەمی ١٩٧٢دا دەرچوو كە زۆرینە دەنگیان لەسەری‌دا، جگە لە پرتوگال‌و باشووری ئەفریقا، بەریتانیاو ئەمریكا. بڕوانە:"الارهاب الدولي"، د. نبيل احمد حلمي، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٠- ١٢١.

پرنسیپە بنەڕەتییەکانی پەیوەندیدار بە مەڵبەندی یاسایی ئەو چەکدارانەی لە دژی دەسەڵاتی داگیرکەرو بیانیو رژێمە رەگەز پەرستییەکاندا، خەبات دەکەنو تێدەکۆشن. برگەی پێنجەمی جێبەجێکردن لە بڕیارەکەدا، بەکارهێنانی بەکرێگیراوی لەلایەن رژێمە داگیرکەرو رەگەز پەرستەکانەوە، لە دژیبزووتنەوەکانی رزگاریخوازی نیشتیمانی کە لە پێناوی ئازادیو سەربەخۆییدا خەبات دەکەن، لەدژی ئەو هێزانە کە بە کردەیەکی تاوانباری لە قەڵەمداو سزای بەکرێ گیراوان دەدات، لەسەر بنەمای ئەوەی کە بە تاوانبار دادەنرێت. برگەی شەشەمی جێبەجێکردنی بڕیارەکە، روونی کردەوە کە پێشێلکردنی مەڵبەندی یاسایی ئەو چەکدارانەی لە دژی دەسەڵاتی داگیرکاریو بیانیو رژێمە رەگەزپەرستییەکان تێدەکۆشن لە کاتی ململانێ چەکدارییەکاندا، بەرپرسیارێتی تەواویان دەکەوێتە ئەستۆ، بە پێی بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتی[٢٣١].

بەشێك لە زانستەکان پێیان وایە، کە ئێمەش لە گەڵیاندایןو، راگەیاندنی پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی پەیوەندیدار بە پەیوەندییەکانی هاوکاریو تەبایی نێوان دەوڵەتان، بەپێی بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکانو، هەموو ئەو بڕیارانەی دوای ئەویش هاتوون کە بە زۆرینە پەسەندکراونو وا دەکات بڕیاردانی چارەنووس ببێتە پرەنسیپێك کە لەسەر ئاستی جیهانی دانی پیادا نرابێت[٢٣٢]. ئەگەرچی زەحمەتە ئەو بڕیارانەی نەتەوەیەکگرتووەکان سیفەتێکی یاسای نێودەوڵەتی پێبەخشرێت، چونکە ئەو لایەنانەی کە دەریدەکات کۆمەڵەی

---

[٢٣١] سەرچاوەی پێشوو، ل١٢١– ١٢٢.

[٢٣٢] لەو بارەیەوە بڕوانە:

*ofinternationale Studies, Vol. 3, 1972, p. 99; Hammi*

*1973). P. 26;*

*1, 1974, p. 32.*

گشتییەکە دەسەڵاتی یاسادانانی نییە، بەڵام گرنگییەکەی لەوەدایە کە گوزارشت لە دیدو بۆچوونی زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی دەکات، بێگومان یەکەم ئامرازە، بۆ بەرجەستەکردنی ڕێسای نوێی نێودەوڵەتی. ئەگەرچی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، یاسا داناڕێژرێت، بەڵام هەر نەبێ بەشداریی لە داڕشتنیدا دەکات[٢٣٣].

ئەگەر ڕۆڵی نەتەوە یەکگرتووەکان، لە ڕێگەی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتییەوە، لە بنەڕەتدا بەمەبەستی داڕشتنی بیرۆکەی مافی دیاریکردنی چارەنووسە، بەڵام لەوە زیاتر پەل دەهاوێت و لە ڕێگەی بەستنی ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان لەم بارەوە، جەخت لەسەر بەهای یاسای پرەنسیپی بڕیار لەسەر چارەنووس دەکات.

نەتەوە یەکگرتووەکان توانی بڕیار لەسەر دوو ڕێکەوتننامە، لە بواری مافەکانی مرۆڤ بدات کە کاریگەریی گەورەیان هەبوو لە دابینکردنی پشتگیریی یاسایی، بۆ پرەنسیپی بڕیاردان لەسەر چارەنووس، کە بڕیاردرا لەسەر ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی، سەبارەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان[٢٣٤] و پرۆتۆکۆڵی ناتەوزیمی کە پاشکۆیەتی و، ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە مافی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی، لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی

---

[٢٣٣] بڕوانە کتێبی: "الغنیمي الوسیط فی القانون السلام"، د.محمد طلعت الغنیمی، سەرچاوەی پێشوو؛ ل٢٣٧و هەروەها : (الآثار القانونیة لقرارات الجمعیة العامة)، د. نبیل عبدالله العربي، گۆڤارێکی میسری یاسایی نێودەوڵەتییە، بەرگی ٣١، ١٩٧٥، ل٢٨٣- ٢٨٤.

[٢٣٤] بڕیاری کۆمەڵەی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان ژمارە ٢٢٠٠ی ڕۆژی ١٦/ کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٦، لە دەقی ڕێکەوتننامەکە، بڕوانە:

*2nd. Ed., (oxford, 1979). Pp. 126 seq.*

ئەو ڕێکەوتننامەیە و پرۆتۆکۆڵە ناتەوزیمییە کە لە ٢٣ مارتی ساڵی ١٩٧٦دا، چووە خانەی جێبەجێکردنەوە.

١٩٩٦دا[٢٣٥]. ئەوەی تێبینی دەکرێت لەو دوو ڕێکەوتننامەیەدا کە پرەنسیپی بڕیاردانی چارەنووس، بۆ هەموو گەلان بە دەقی ئاشکرا هاتووە[٢٣٦].

دەتوانین بڵێین ئەمڕۆ مافی بڕیاردانی چارەنووس، بە یەکێك لە پەرنسیپە سەرەکییەکان دادەنرێت کە دیسپلینی نێودەوڵەتی هاوچەرخ پشتی پێ دەبەستێت، هەروەها بووە بە مافە سەرەکییەکانی گەلان، لەبەر ئەوە بەمەرجی یەکەمی بنەڕەتی، بۆ هەموو مافەکانی تری مرۆڤ دادەنرێت.

بێ ئەو مافەش هیچ گروپ و کۆمەڵەو کەسێك، بۆی نییە ئازادییەکانی پراکتیزە بکات. ئەمەش لە کۆنگرەی(باندونگ)ی ساڵی ١٩٥٥دا، جەختی لەسەر دەقی بەیاننامەی کۆتایی کۆنگرە کردووە"بەوەی کۆنگرە پشتگیریی تەواوی خۆی، بۆ پەرنسیپی مافی گەلان و نەتەوەیەکگرتووەکان لە بڕیاردان لەسەر چارەنووسیان ڕاگەیاند کە مەرجێکی پێش وەخت و پێویستە کە ناکرێت

---

[٢٣٥] بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەیکگرتووەکانی ژمارە ٢٢٠٠(ا) لە ڕۆژی ١٦ کانونی یەکەمی ١٩٦٦ لە دەقی ڕێکەوتننامەکە، بڕوانە محمد وفيق ابو اتلة (موسوعه حقوق الانسان) القاهره/ ١٩٧٠ ل ٤٣٠و لاپەڕەکانی دواترو، ئەم ڕێکەوتننامەیە چووە بواری جێبەجێ کردنەوە، لە ٣ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٧٦.

[٢٣٦] مادەی یەکەمی هەردوو ڕێکەوتننامەکە ڕێگە دەدات:

١. هەموو گەلان مافی بڕیاردانیان لە چارەنووسی خۆیان هەیە، بە پشت بەستن بەو مافە، بڕیاری سەربەخۆیی قەوارەی سیاسی خۆی دەدات کە ئازادانە بەردەوام بێت لەسەر گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی.

٢. هەموو گەلان بۆیان هەیە، ئامانجە تایبەتییەکانیان بەدیبهێنن، بە ئازادانە هەڵس وکەوت لە سامان و داهاتی سروشتیان بکەن، بەبێ پابەندبوون بەو هاوکارییە ئابوورییە نێودەوڵەتییەی کە لەسەر پرەنسیپی بەرژەوەندیی هاوبەش و خزمەتگوزەرانی تایبەتی خۆی بێ بەش بکرێت.

٣. پێویستە لەسەر هەموو وڵاتانی ئەندام لەم ڕێکەوتننامەیەدا. بەوانەشەوە کە بەرپرسن لە بەڕێوەبەردنی ئەو ئیقلیمانەی کە خۆیان بەڕێوەنابەن یان لەژێر چاودێریدان، کە هەوڵ بدەن لە پێناوی بە دیهێنانی مافی چارەنووس و بە پێی دەقەکانی بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان، ڕێز لەو مافە بگرن.

چاوپۆشیی لێبکرێت، لە هەموو مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ[٢٣٧]. نەتەوە یەکگرتووەکان تا ئاستێکی زۆر، هاوبەشیی کرد لە پشتگیریکردن و جێگیرکردنی پرەنسیپی بڕیاردانی چارەنووس، لە ڕێگەی بڕیارەکان و ڕاگەیاندنەکان و لێدوانەکانی کە ئەو بنەمایانەی پتەوکرد کە پەرنسیپەکە تیشکی دەخاتە سەر و بووە هۆی برەوپێدان بەماف و پتەوکردنی بیرۆکەی یاسای بۆ بەکارهێنانی[٢٣٨]. و ساڵانی پەنجاکان و شەستەکان، جێبەجێ کردنێکی بەرفراوانی پەرنسیپی بڕیاردانی چارەنووسی بەخۆوە بینی، لەسەر ئەو بنەمایەش، زۆربەی گەلانی ئەفریقاو ئاسیا سەربەخۆیی خۆیان بەدەست هێنا و، لە ساڵی ١٩٦٥دا(١٧) دەوڵەتی ئەفریقی سەربەخۆیی خۆیان بەدەستهێنا، تا بەجۆرێ لە ساڵی ١٩٨٠دا، (٥٠) دەوڵەتی ئەفریقی توانیان ئەو مافە بەدەست بهێنن[٢٣٩]. ڕەنگە ئەمڕۆ بتوانین بڵێن کە بڕیاردانی چارەنووس، بە هەوڵی دڵسۆزانەی نەتەوە یەکگرتووەکان، گەیشتە ئاستی مافی یاسای نێودەوڵەتی کە پشت بە بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان و بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتی و، هەروەها چەندین بەڵگەنامەی نێودەوڵەتی دەبەستێت، ئەمە جگە لەوەی کە ماوەی ٤٠ ساڵ لە تەمەنی نەتەوە یەکگرتووەکان، بە شێوەیەکی زانستی و کاریگەر هەوڵی پراکتیزەکردنی ئەو مافانەی داوە[٢٤٠].

---

[٢٣٧] بەیاننامەی کۆتایی کۆنگرەی باندۆنگ لە ٢٤ی نیسانی ١٩٥٥ دەرچوو، پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە دەقە هاوشێوەکانی خرایە بەیاننامەی کۆنگرەی ئەدیس ئەبابای ساڵی ١٩٦٠، دارولبەیزای ساڵی ١٩٦١و، کۆنگرەی دەوڵەتانی بێ لایەن ساڵی ١٩٦٤ [illegible]و، کۆنگرەی لوتکەی ئەفریقی ساڵی ١٩٦٤ لە قاهیرە.

[٢٣٨] بڕوانە: "اصول القانون الدولي العام"، د. محمد سامي عبدالحميد، بەشی یەکەم، ١٩٧٧، ل١٩و دواترو، هەروەها "النظرية المعاصرة للحياد"، د. عائشة راتب، ل٢٢٤ دواتر.

[٢٣٩] بڕوانە: "الحكم الذات و حقوق السيادة و تقرير المصير" عصام الدين حواس، گۆڤاری میسری بۆ یاسای نێودەوڵەتی، ژمارە(٣٦)، ١٩٨٠، ل١٥- ١٦.

[٢٤٠] پێویستە ئاماژە بە ڕۆڵی ڕێکخراوە ئیقلیمییەکان لەم بوارەدا بکەین، ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقاو کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەب جەختیان لەسەر مافی بڕیاردان لەسەر چارەنووس کردووە، ئەگەرچی پلەی بایەخدانیان بەناوەڕۆکی ئەو مافە جیاوازە. بەڵگەنامەی ئەفریقا بۆ مافی مرۆڤ و گەلانی، لایەنی تاکەکی و

## دووەم: شێوازەکانی مافی بڕیاردانی چارەنووس:

مافی بڕیاردانی چارەنووس مافێکی رەها نییە، بەڵکو کۆت و بەندی لەسەرە، لێرەدا مەبەست لەو مافە ئەوە نییە کە جێبەجێکردنی بەبێ جیاوازی بەڕێوەبچێت، چونکە رەنگە ببێتە هۆی شکاندن و پەرتکردنی یەکێتی نیشتیمانی، لەبەر ئەوەی بەسەر ئەو کەمایەتیانەدا جێبەجێ ناکرێت کە لە ناو چوارچێوەی ئەو دەوڵەتەدان، جگە لەوە دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەت و روخاندنی سستمی نێودەوڵەتیی هاوچەرخ.

لێرەدا دوو شێواز هەیە، بۆ مافی بڕیاردانی چارەنووس، یەکەم: مافی بڕیاردانی چارەنووسی ناوخۆیی، بە مانای ئەوەی کە چێژوەرگرتن لە ماف، تایبەت دەبێت بەو وڵاتانەی کەوا سەروەریی تەواویان هەیە، دووەم: مافی بڕیاردانی چارەنووسی دەرەکی، تایبەتە بەو دەوڵەتانەی چێژ لە سەروەریی وەرناگرن. رەنگە باشترین نموونەش بۆ شێوازی یەکەم کە بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان، سەبارەت بە راگەیاندنی جیهانیی لە نەگونجانی دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتان و پارێزگاریی لە سەربەخۆیی و سەروەرییەکەی بکرێت، ئەوەش مەودای پەیوەندیی پرەنسیپی دەستێوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتان، لە مافی بڕیاردانی چارەنووسدا روون دەکاتەوە[٢٤١].

---

بە کۆمەڵی ئەو مافەی چارەسەر کردووە، بەڵام پرۆژەی بەڵگەنامەی عەرەبی مافی مرۆڤ جەختی لە سەر مافی مرۆڤ کردووەو بڕگەیەکی تایبەتە بە مافی گەلان.

لە دەقی بەڵگەنامەی ئەفریقیا، بۆ مافی مرۆڤ و گەلان، بڕوانە:

*CAB/ LEG/ 67/ 3/ Rev.5*

لە پرۆژەی بەڵگەنامەی عەرەبی مافی مرۆڤدا، بڕوانە: (دراسة مقارنة بين مشروع الميثاق العربي لحقوق الانسان و الميثاق الافريقي لحقوق الانسان و الشعوب)، باسيل يوسف، گۆڤاری(شؤون عربية)، ژمارە (٣٢)، ١٩٨٣.

[٢٤١] بڕیاری کۆمەڵەی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان، ژمارە١٢٣١ لە خولی (٢١)م لە رۆژی ٢١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٥دا. لە مەڕ دەقی، راگەیاندنەکە، بڕوانە: وفيق ابو اتلة، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٩و دواتر.

لەبەر ئەوە دەبینین کە پێش نووسی ڕاگەیاندنەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە نەتەوەیەکگرتووەکان لەسەر یەکسانی لە سەروەریی لە نێوان دەوڵەتاندا دامەزراوە کە پێویستە پەیوەندییەکانی نێوانیان لەسەر بناغەی ڕێزگرتن لە پرەنسیپی یەکسانیی گەلان لە مافەکانیانداو مافی بڕیاردانی چارەنووس و پابەندکردنی ئەندامەکانی بە قەدەغەکردنی هەڕەشە لە بەکارهێنانی هێزو بەکارهێنانی، لە دژی ئاسایشی قەڵەمڕەوی هەر دەوڵەتێك یان دژی سەربەخۆیی سیاسی. ڕاگەیاندنەکە بە ئاشکرا لە بەندی شەشەمیدا، دیاریکردووە کە پێویستە لەسەر سەرجەم دەوڵەتان، ڕێز لە مافەکانی گەلان و نەتەوەکان بگرن، لە بڕیاردانی چارەنووس و سەربەخۆیی، ئەو مافەی خۆیان بە ئازادی و بەبێ هیچ گوشارێکی بیانی پراکتیزە بکەن، لەگەڵ ڕێزی تەواو لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە سەرەکییەکانی.

بەڵام شێوازی دووەم لە بڕیاری کۆمەڵەی گشتی لە ڕۆژی ١٤ی کانوونی یەکەم ساڵی ١٩٦٠ بە ئاشکرا دەبینین، سەبارەت بەڕاگەیاندنی پێدانی سەربەخۆی بەو هەرێم و گەلانەی داگیرکراون[٢٤٢]. ملکەچ پێکردنی گەلان لەلایەن دەسەڵاتی بیانی بە- دارشتنی ئەو بڕیارەدا- پێشێلکردنی برگەکانی بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان هەژمار دەکرێت. لەبەر ئەوە، بڕیارەکە داوای پێویستی دانانی ئاستێك دەکات بەشێوەیەکی خێراو بەبێ هیچ کۆت و مەرجێك، بۆ داگیرکەران بە هەموو شێوازەکانییەوەو گواستنەوەی دەسەڵاتی سیاسی، لە هەموو ئەو هەرێمانەدا بۆ گەل، بەپێی ویستی ئازادانەی خۆی. بڕیارەکە ئەمانەی خوارەوە لە خۆگرتووە:

١. ملکەچ پێکردنی گەلان بۆ کۆیلەیەتی بێگانەو دەسەڵات و داگیرکردنی بە پێشێلکردنی مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ دادەنرێت، بەسەرپێچی کردنی

---

[٢٤٢] بڕیاری کۆمەڵەی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکانی ژمارە ١٥١٤ لەکاتی کۆبوونەوەی، لە خولی ئاسایی(١٥)یەم، لە ڕۆژی ١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٠دا. بۆ دەقی ڕاگەیاندنەکە، بڕوانە: وفیق ابو اتلة، سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٧) و لاپەڕەکانی دواتر.

بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان لە قەڵەم دەدرێت، زیان بە کێشەی ئاشتی و هاوکاریی نێودەوڵەتی دەگەیەنێت.

٢. هەموو گەلێك مافی بڕیاردانی لەسەر چارەنووسی خۆی هەیە، بەو مافەش رێگەی پێدەدرێت کە بە ئازادی، پێگەی سیاسی خۆی دیاری بکات و ئازادانە هەوڵی بەدیهێنانی گەشەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی بدات.

٣. دەبێت بە هیچ شێوەیەك نەبوونی توانایی لە گۆڕەپانی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و فێرکاری نەکرێتە پاساوێك، بۆ دواخستنی سەربەخۆیی.

٤. دانانی ئاستێك بۆ هەموو جۆرەکانی کاری چەکداری و سەرکوتکردن، کە لە دژی گەلانی نا سەربەخۆ ئاراستە دەکرێت، تا بتوانێت بەشێوەیەکی ئازادو دروست پەیڕەوی مافی سەربەخۆیی بوونی تەواوی بکات، و رێز لە ئاسایشی نەتەوەیی هەرێمەکەی بگرێت.

# بابەتی دووەم
# ڕەوابوونی بەکارهێنانی هێز، لە چوارچێوەی بڕیاردان لەسەر چارەنووس

لەوە گەڕێین کە بڕیاردانی چارەنووس بەرەو پێشەوە چووە، تا بوو بە مافێکی یاسایی نێودەوڵەتی، بە گوێرەی بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان و بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکان، ئەوەش وا دەکات کە خاوەنی کێشەکە ئاکاری کاریگەر بگرێتەبەر، لەبەر ئەوە ئامرازەکانی پێویستی ئەو مافە دروستە کە ڕەنگە لەڕێگەی خەباتی چەکدارییەوە بێت، ئەگەر وتووێژی ئاشتییانە سەرنەکەوت.

وتووێژ دەکرێت لەبارەی ڕەوابوونی بەکارهێنانی هێز وەکو یەکێك لە ئامرازە پێویستەکانی مافی بڕیاردانی چارەنووس، لە چوارچێوەی تیۆری جەنگەکانی ئازادیخوازیی نیشتیمانی(War of National)، تێگەیشتن لەو تیۆرە ئەوەیە کەمافی هەر گەلێکە هەرێمە داگیرکراوەکەی بسەنێتەوە، بەهەموو ئامرازێك کە لەبەردەستدابێت، بە خەباتی چەکداریشەوە، لە ڕێگەی بزووتنەوەکانی رزگاریخوازیی نیشتیمانی. لەبەرامبەر بێ توانایی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هاوچەرخ و دەزگا سەرەکییەکەی کە خۆی لە نەتەوەیەکگرتووەکاندا دەبینێتەوە، بۆ دابینکردنی ڕێزگرتن لە مافی هەر گەلێك بۆ دیاریکردنی چارەنووسی خۆی، ئاساییە مل دان بەو گەلانەی کە لەژێر ستەمی داگیرکەراندا دەناڵێنن، تا شێوازی یارمەتیی خۆیەتی بەکار ببەن، بە خەباتی چەکدارانەوە لە پێناو پراکتیزەکردنی مافی خۆیان، لە دیاریکردنی چارەنووسدا، بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە سەرپێچییەکی تێدابێت، بۆ سستمی یاسایی کە لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا ڕێز لە بەکارهێنانی هێز دەگرێت.

لەسۆنگەی زۆربەی زانستەکانەوە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا، جەنگەکانی رزگاریخوازیی نیشتیمانی، بەڕەوا دادەنرێت. کۆمەڵەی گشتی

نەتەوەیەکگرتووەکان، لە چەندین بڕیاردا کە لە ساڵی ١٩٤٥دەرچوون، جەختی لەسەر ئەو چەمکە کردۆتەوە[٢٤٣]. لە گرنگترین ئەو بڕیارانەش کە کۆمەڵەی گشتی لەساڵی ١٩٧٤دا، دەریکردو پێناسەی دوژمنی لەخۆگرتبوو[٢٤٤]، کە داڕێژەرانی ئەو پێناسەیە سووربوون، لەسەر ئەوەی کە مادەی حەوتەم جۆرێك لەخۆگرتن لەبەرژەوەندیی بزووتنەوەکانی رزگاریخوازیی نیشتمانی تێدابێت و گرنگیی زۆری پێدرا. ئەو مادەیەش بڕیاری لەسەر ئەوەدا کە لەو پێناسەیەدا، بەتایبەتی ئەوەی لەمادەی سێیەمدا هاتووە- هەندێ حاڵەتی دوژمنی لەخۆگرتووە- کە لایەنگری مافی ئەو گەلانەی لەژێر دەستی سستمی دەسەلاتی داگیرکەر، یان رەگەزیدا نەهاتووە، یان هەر جۆرێکیتر لەدەسەلاتیبیانی، لەخەباتدا لەپێناو بڕیاردانی چارەنووس و ئازادیو سەربەخۆییدا، وەکو ئەوەی بەڵگەنامەی نەتەوە یەککگرتووەکان بڕیاری داوە.

ئەوەش جەخت لەسەر بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەککگرتووەکان دەکاتەوە، سەبارەت بە (پرەنسیپە سەرەکییەکان لە مەڵبەندی یاسایی ئەو جەنگاوەرانەی دژی دەسەلاتی داگیرکەرو بیانیو رژێمە رەگەز پەرستەکان خەبات دەکەن[٢٤٥]).

---

[٢٤٣] لە نموونەی ئەو بڕیارانە:- راگەیاندنی پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی تایبەت بە پەیوەندیی تەبایی و هاوکاریی نێوان دەوڵەتان، بەپێی بەڵگەنامەی نەتەوە یەککگرتووەکان و ئامۆژگاریی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەککگرتووەکان ژمارە ٢٦٢٥ (٢٥)، لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٠- بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە ٢٦٤٩(٢٥)، ٣٠٧٠ (٢٨)، ٣٢٤٦(٢٩). لەو بڕیارانەدا کە نەتەوە یەککگرتووەکان دەری کردوون، جەخت لەسەر رەوابوونی خەباتی چەکداری بۆ بزاڤە رزگاریخوازە نیشتمانییەکان دەکات. بڕوانە: د.رجاء موسی (جهود الامم المتحدة في تأييد الكفاح المسلح لحركات التحرر الوطني ومكافحة الارهاب).

[٢٤٤] لەپێناسەی دەست درێژیکردندا، بڕوانە: بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە ٣٣١٤، خولی ٢٩ لە ١٤ی کانونی یەکەمی ١٩٨٤دا.

*GAOR. 29th Session, Suppl. 19(A96 and Corr.1).*

[٢٤٥] بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەککگرتووەکان، ژمارە ٣١٠٢(٢٧) لە ١٢ی کانونی یەکەمی ١٩٧٣دا دەرچووە.

لەوەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە بزووتنەوەکانی رزگاریخوازیی نیشتمانی، مافی بەکارهێنانی هێزیان هەیە، لەپێناو خەبات، لەدژی هێزە داگیرکاریی و دەسەلاتە بیانیی و رژێمە رەگەزییەکان کە داکۆکی لەمافی بڕیاردانی چارەنووسی دەکەن، لەم حاڵەتەدا خەباتەکەیان رەوا (LEGIMATE) دەبێت[٢٤٦]، یان دادپەروەرە (JUST)، بەو مانایەش، لەبیرۆکەی پێچەوانەدا، خەباتی لایەنەکەی‌تر دادپەروەر (UNJUST)نابێت[٢٤٧].

## یەکەم- جەنگەکانی رزگاریخوازی نیشتمانی، جەنگی نێودەوڵەتین:

یاسای نێودەوڵەتیی کۆنبار هەڵوێستێکی توندی، بەرامبەر بە بزووتنەوەکانی رزگاریخوازیی نیشتمانی وەرگرت، کە سەیری کۆلۆنیا لکراوەکان دەکات، بەوەی بەشێکن لەهەرێمی دەوڵەتە داگیرکەرەکە، لەئاکامدا ئەوەی لەسەر هەرێمە داگیرکراوەکەدا روو دەدات، لە بازنەی یاسای نێودەوڵەتی دەردەچێت، بەوەی کارێکە پەیوەندیی بەپسپۆریی ناوخۆیی دەوڵەتە بنەرەتیەکەوە دەبێت و، ملکەچی یاسا نێوخۆییەکانی دەبێت.

لەگەڵ بەرەو پێشچوونی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، ئەو تێڕوانینە کۆنباوە گۆڕاو جیهان لەمێژوودا، لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە، لەبەردەم

---

[٢٤٦] لە بڕیاری ژمارە ٣١٠٣(٢٧)دا هاتووە:

*1. The struggle of People under Colonial, alien domination and racist regimes for the imploemenation of the right to self- derminattion and independence is*

[٢٤٧] لە بڕیاری ژمارە ٣١٠٣(٢٧) دا هاتووە:

*2. Any attempt to Suppress the struggle against Colonial, alien domination and reacist regime are incomepatible with the Charter of the United Nations, the Declartion on principles of Internationale law Concerning Friendly Relation and Co-operation among States in accordance with the United Nations, the Universal Declaration on the Granting of Independence to Colonial Countries*

تەوژمی گیانی نەتەوەیی و داواکاریی مافی بڕیاردانی چارەنووسدا، گەورەترین بزووتنەوەی رزگاریخوازیی بەخۆوە بینی. دەوڵەتانی تازە سەربەخۆ هەستان بەوەرگرتنی بەشی خۆیان لەژیانی نێودەوڵەتیدا، لەهاوبەشیکردن بەرەو کاریگەری لە داڕشتنی بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتی. دەرکەوتنی ئەو کۆمەڵە نوێیانە لە دەوڵەتانی سەربەخۆ، کاریگەریی زۆری لەچاککردن و گۆڕینیی فیکری سیاسیی کۆنباودا هەبوو[٢٤٨]. لەمیانەی کۆنگرەی دبلۆماسی کە لەجنێف لەساڵی ١٩٤٩دا بەسترا، بۆ پارێزگاریی قوربانیانی جەنگ-بەهەوڵی ئەو دەوڵەتانە- توانرا بڕیاری کەمترین ئاست لەپارێزگاریی مرۆڤایەتی، بەگوێرەی مادەی سێیەمی هاوبەش لە رێکەوتنامەکانی جنێڤی ساڵی ١٩٤٩، سەبارەت بەپارێزگاریی قوربانیانی ململانێ چەکدارییەکان بدرێت، بۆ جێبەجێکردنی لەسەر ئەو ململانێ چەکدارییانەی کە مۆرکی نێودەوڵەتی پێوە نییە، کە شەڕەکانی رزگاریخوازیی نیشتمانی دەچێتە چوارچێوەیەوە.

کاتێك بزووتنەوەکانی رزگاریخوازیی نیشتمانی، لەمافی بڕیاردانی چارەنووسەوە سەردەگرێت و، بەبزاوتی رەوا دادەنرێت و ئەو بزووتنەوانە لەلایەن یاسای نێودەوڵەتیی هاوچەرخەوە، پارێزگارییان لێدەکرێت، کۆنگرەی پێش خستنی یاسای مرۆڤایەتی-کە رێکەوتن لەسەر دوو پرۆتۆکۆڵی جنێڤی ساڵی ١٩٧٦ی لێکەوتەوە[٢٤٩]- گرنگییەکی گەورەی بەدۆخی یاسایی بۆ جەنگەکانی

---

[٢٤٨] بڕوانە: د.صلاح الدين عامر، "مقدمة لدراسة قانون النزاعات المسلحة"، دار الفكر العربي، ١٩٧٦، ل٨٠.

[٢٤٩] ئەو دوو پرۆتۆکۆڵەش بریتیین لە:

- پرۆتۆکۆڵی یەکەم، پاشکۆی رێکەوتنامەکانی جنێف لە ١٢ی ئابی ١٩٤٩ پەیوەندیدار، بە پارێزگاری قوربانیانی ململانێی چەکداریی.

- پرۆتۆکۆڵی دووەم، پاشکۆی رێکەوتنامەکانی جنێف لە ١٢ی ئابی ١٩٤٩، تایبەت بە پارێزگاری قوربانیانی ململانێی چەکداریی نا دەوڵەتی.

بە ئامادەبوونی نوێنەری ١٠٩ دەوڵەت، لە ١٠ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٧٧ لەشاری جنێفدا ئیمزا کرا.

رزگاریخوازیی نیشتمانیدا، ئەو کۆنگرە دبلۆماسییە کە بڕیاری لە هەردوو پرۆتۆکۆڵی یەکەمو دووەمی جنێڤ دا، جەنگەکانی رزگاریخوازی، بە جەنگی نێو دەوڵەتی دانا. بڕگەی چوارەم لەمادەی یەکەمی پرۆتۆکۆڵی یەکەم بڕیار دەدات، لەسەر ئەوەی کە بەشەڕی نێودەوڵەتی هەژمار بکرێت (ململانێ چەکدارییەکانی کە گەلان لەپێناوییدا تێدەکۆشن، دژی دەسەڵاتی داگیرکەرو داگیرکردنی بیانیو دژی رژێمە رەگەز پەرستەکان، بۆ پراکتیزەکردنی مافی دیاریکردنی چارەنووس، هەروەك ئەوەی لە بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکانداو راگەیاندنی پەیوەندیدار، بە پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی، تایبەت پەیوەندییەکانی هاوکاریو تەبایی، لەنێوان دەوڵەتاندا بەپێی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان[٢٥٠] تەرخان کرابوو. رێکخراوە رزگاریخوازەکان بەشدارییان کرد لە کۆنگرەی هاوبەشیکردنی کاریگەر، لەدانانی جەنگەکانی رزگاریخوازی نیشتمانی، لەچوارچێوەی جەنگە نێودەوڵەتیەکانداو، بەیاننامەی کۆتایی ئیمزاکردو، نوێنەرایەتی کردنی لەرۆڵی

---

[٢٥٠] مادەی یەکەمی پرۆتۆکۆڵی یەکەم، بە پشتگیریی ٧٠ دەنگو ٢١ دەنگی دژو ١٣ بێدەنگ دان، رەزامەندیی لەسەردرا.

[٢٥١] بڕگەی سێیەمی مادەی ٩٦ لە پرۆتۆکۆڵی یەکەم، بڕیاری لەسەر ئەمانەدا: ٣٠- بۆ ئەو دەسەڵاتە هەیە کە نوێنەری گەلەودەرگیرە لەگەڵ لایەنێکی‌تردا کەلایەنێکەلە ململانێیەکی چەکدارانەدا، لەو جۆرەی لەبڕگەی چوارەمی مادەی یەکەمدا ئاماژەی پێکراوە، بەڵێن بدات بە جێبەجێکردنی رێکەوتنامەکانو ئەم پاشکۆیەش (پرۆتۆکۆڵ) سەبارەت بەو ململانێیە، ئەویش لەرێگەی ئاراستەکردنی راگەیاندنێکی یەك لایەنە، بۆ ئەو شوێنەی رێکەوتنامەکان تیادا دەپارێزرێت. وەها راگەیاندنێك لەکاتی سپاردنیان سەبارەت بەو ململانێیە ئەم کاریگەریانەی خوارەوەی دەبێت:

ا. رێکەوتنامەکانو ئەم پاشکۆیە (پرۆتۆکۆڵ) سەبارەت بەدەسەڵاتە ناوبراوەکە، بەوەی کەلایەنێکە لەکێشەکەدا، دەکەونە بواری جێبەجێکردنەوە.

ب- دەسەڵاتی ناوبراو هەمان ئەو مافانە پراکتیزە دەکاتو پابەند دەبێت کەلایەنی ئەندام لەو رێکەوتنامەیەو ئەم پاشکۆیەدا پێوەی پابەند دەبێت.

ج. ئەم رێکەوتنامانە ئەم پاشکۆیە (پرۆتۆکۆڵ)، هەموو لایەنەکانی ململانێکە وەك یەك پابەند دەکات.

چاودێریی زیاتربوو لە کۆنگرەکەدا، گەیشتە ئەو لایەنانەی کەوا مۆریان کردووە[٢٥١].

کۆنگرەکە مەبەستی لەئازادکردن دیاریکرد، بەوەی کە لەدژی دەسەڵاتی داگیرکاریو داگیرکردنی بیانیو رژێمە رەگەزپەرستەکاندا بەرپا دەکرێت، لەپێناو پراکتیزەکردنی مافی بڕیاردانی چارەنووس، هەروەکو چۆن یاسای نێودەوڵەتی، جەختی لەسەر دەکاتەوە. لەم پێناسەیەوە دەردەکەوێت کە دابەشکەری هاوبەشی لە زۆربەی جەنگەکانی رزگاریخوازیدا (توخمی بێگانە)یە. لەبەرئەوە دەسەڵاتی داگیرکاریو داگیرکردنی بیانیو رژێمە رەگەز پەرستەکان توخمێکی بێگانە یان بیانی کۆیان دەکاتەوە، بەسیفەتی ئەوەی توخمێکی دەستێوەردەر، یان دەست درێژکەرە. لەوەشەوە دەبینرێت(توخمی بێگانە) دەست درێژی دەکاتە سەر مافەکانیو ئازادییەکانی گەلان بەرجەستە دەکات، هەرچەندە پاساوی رەواش هەبێت، بۆ وەسفکردنی ئەو بزووتنەوەیە کە بەرەنگاری دەبێتەوە، بەوەی بزووتنەوەیەکی رزگاریی نیشتمانییە، جەنگی ئاراستەکراویش لەدژی، بەوەی جەنگی نێودەوڵەتییەو، بۆ ئازادکردنی نیشتمانییە. بەڵام ئەو پشێوییانەی کە لەچوارچێوەی یەك دەوڵەتدا روودەدات، لەنێوان جەنگە نادەوڵەتییەکاندا دێتو دەچێتو دەکەوێتە ژێر بڕگەکانی پرۆتۆکۆڵی دووەمی جنێڤەوە، لەنێوان

---

[٢٥٢] مادەی یەکەم لە پرۆتۆکۆڵی دووەم، بەتەواوکەری مادەی یەکەمی پرۆتۆکۆڵی یەکەم دادەنرێت، لەرووی پێوەری جیاوازیی لەنێوان ئەوەی بەکێشەی چەکداریی نا نێودەوڵەتی دادەنرێت، کێشەی چەکداریی نا نێودەوڵەتی هەرکێشەیەك دەگرێتەوە کە ئەو مەرجانەی کێشەی نێودەوڵەتی نەیانگرێتەوە کە لەمادەی یەکەمی پرۆتۆکۆڵەکەدا هاتووەو دەوروبەری قەڵەمڕەوی یەکێك لەلایەنەکانی رێکەوتننامەکەی دابێت، لەنێوان هێزەکانیداو هێزە تەریکەکاندا، یان هەر تاقمێکی سەربازیی چەکدار کە لەژێر سەرکردایەتیەکدا بێت کە بەرپرسی بێت، لەبەشێك لەقەڵەمڕەوەکەی کە بتوانێت دەست بداتە کردەی سەربازی بەرودوو رێکوپێكو دەتوانێت پرۆتۆکۆڵی دووەم جێبەجێبکات. هەروەها لەمادەی یەکەمدا هاتووە کە پرۆتۆکۆڵی دووەم بەسەر حاڵەتی بشێوییو ئاژاوەی ناوخۆدا جێبەجێ ناکرێت، وەکو کاری توندوتیژیو ئەو کارانەی لەوەدەچن.

[٢٥٣] بڕوانە: ((النظرية المعاصرة للحياد)) د.عائشه راتب، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٩-٢٤٢.

[٢٥٤] بڕوانە مادەی ٤٣ لە پرۆتۆکۆڵی یەکەمی جنێف.

پشێوییە ناوخۆییەکاندا دەبێت و دەکەوێتە ناخی پسپۆریی یاسای ناوخۆی ئەو دەوڵەتەوە[٢٥٢].

لەم سۆنگەیەوە دەتاوانین بڵێین کە ململانێی نێوان هێزەکانی ڕێکخراوی رزگاریخوازیی فەلەستینی و ئیسرائیل- لە هەموو بەرەکانیدا- ململانێیەکی چەکداریی نێودەوڵەتییەو برگەکانی پرۆتۆکۆڵی یەکەمی جنێڤ دەیگرێتەوە. بەڵام ئەوەی لە لوبنان ڕوودەدات، لەنێوان تایەفەو خێڵە جیاجیاکاندا، بەگوێرەی پرۆتۆکۆڵی دووەمی جنێڤ ئەوە بە ململانێی نادەوڵەتی دادەنرێت.

ڕێکخراوی رزگاریخوازیی فەلەستین ئەو مانایەی لە ڕاگەیاندنی قاهیرە، سەبارەت بەقۆناغەکانی خەباتی فەلەستینی چەسپاند کە لە (٧)ی تشرینی دووەمی ١٩٨٥دا، دەرچوو کەتیایدا ڕێکخراوەکە ئیدانەی سەرجەم کردەکانی دەرەکی و هەموو شێوەکانی تیرۆری کرد[٢٥٣] لەبەرئەوە داڕێژەرانی پرۆتۆکۆڵی یەکەم، لەکاتی تاوتێکردنی بابەتی جەنگاوەران و دیلەکانی جەنگ، هەوڵیان دا یەکسانییەك لەنێوان ڕێکخراوەکانی رزگاریخوازیی نیشتمانی و هێزە چەکدارەکانی دەوڵەتاندا بخولقێنن و پێناسەیەکی گشتگیریان بۆ دانا[٢٥٤]. دواتر

---

[٢٥٥] ئەو تاوانانە لەمادەی ٥٣,٥٠ی ڕێکەوتننامەی یەکەم و مادەکانی ٥١,٤٤ی ڕێکەوتننامەی دووەم، مادەی ١٣٠ لەڕێکەوتننامەی سێیەم و مادەی ١٤٧ لەڕێکەوتننامەی چوارەمدا هاتوون.

[٢٥٦] لە مادەی یەکەم لە ڕێکەوتننامەی مونتفیدۆ (Montevido Convntion) ساڵی ١٩٣٣:

*internationale Law Should Possess the Following qualification: (a) apermarent population; (b) a defined territory; (c) government*

لەمەڕ دەقی ڕێکەوتننامەکە بڕوانە: LNTS, 1936,NO. 2802

[٢٥٧] د.جورج ئەبی سەعب پێی وایە کە هەر وتەیەکی پێچەوانە، گەڕانەوەیە بۆ بنەماکانی یاسای کۆنباوی نێودەوڵەتی، سەبارەت بەدان پێدانان و پەیوەندیی جەنگاوەران، لەم بارەوە بڕیار دەدات:

*on the assumption of Conventional Warfare: it disregards the Special nature of*

مادەی ٤٤ هاتە ئاراوەو بیرۆکەی دیلی جەنگ بەجۆرێ دیاریکرد کە گشتگیربێت. لەکۆتاییداو، لەژێر رۆشنایی برگەکانی یاسای مرۆڤایەتی نێودەوڵەتیدا، هەر کردەیەکی جەنگی کە رێکخراوەکانی رزگاریخوازیی نیشتمانی پێی هەستن، لەچوارچێوەی بریاردانی چارەنووسیان، لەرێگەی خەباتی چەکداری یاسای دژی داگیرکەری بیانیدا- لەدەرەوەی چوارچێوەی ئەو کردانەی کە چوار رێکەوتننامەکەی ساڵی ١٩٤٩و پرۆتۆکۆڵی یەکەمدا تاوانبار دەکرێت- ئەوە لەلایەن یاسای نێودەوڵەتییەوە، بەکارێکی رەواو یاسایی دادەنرێت، بەمەرجێ لەناو قەڵەمرەوە داگیرکراوەکەدا بێت و بەمەبەستی رزگارکردنی[255]. زۆربەی ئەو کردانەی کە رێکخراوەکانی ئازادیخوازی ئەنجامی دەدەن، لە دەرەوەی سنووری قەڵەمرەوەداگیرکراوەکەدایەو دەچێتە دەرەوەی چوارچێوەی رێکەوتننامەکانی جنێف و پرۆتۆکۆڵی یەکەم.

## دووەم- بزووتنەوەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانی، قەوارەی جەنگاوەران کە ئاکاری نێودەوڵەتییان هەیە:

کاتێك کە جەنگەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانی بەجەنگی نێودەوڵەتی دادەنرێت، ئەمەش مانای وایە کە جەنگێکە، لەنێوان دوو یەکەدایە کە کەسایەتیی یاسای نێودەوڵەتییان هەبێت: دەوڵەتێکی بەرپا (دەوڵەتی داگیرکەر، یان ئەوەی کە سستمی رەگەزیو رەگەزپەرستی پیادە بکات و)، دەوڵەتێك لەخولی پێکهاتندا، یان لەقۆناغی گەشەکردندا بێت (بزووتنەوەی رزگاریخوازیی نیشتمانی).

---

*guerrilla Warfare Whcih characterizes Was of nation* Abi-Saab, *oP. Cit, P. 97.*

(٢٥٨) براونلی لەم بارەیەوە بڕیار دەدات کە:

*iderate in*

*. Cit, p. 577.*

وێڕای ئەوەی کە ئەو دەوڵەتەی هێشتا لەقۆناغی پێکهاتندایە (The emergent State) یەکێك لەبنەماکانی دەوڵەتی خاوەن سەروەریی نییە، بە چوار توخمەکەیەوە، کە ئەویش توخمی ئەو ئیقلیمیەیە کە داوای مافی خۆی دەکات، بۆ دەست بەسەراگرتنی[٢٥٦]. بەڵام زۆربەی زانستەکان، دانی پێدا دەنێن، بەوەی کە قەوارەی نێودەوڵەتی بۆ دەوڵەتان[٢٥٧]. لەبارودۆخی وەکو شەڕی رزگاریخوازیی نیشتمانیدا، دەبینین کە دەست بەسەراگرتنی ئیقلیمێکی دیاریکراو، بەشێوەی چالاك رەنگە لە چاوتروکانێکدا رووبدات، کاتێ وڵاتی داگیرکەر ئەو کۆنترۆڵە لەدەست دەدات و، بۆ بزاڤی رزگاریخوازیی نیشتمانی ئەژمار دەکرێت. توخمی ناوچەیی لێرەدا، لە نێوان دوو هێزدا لەجوڵەدا دەبێت و بۆ بزاوتی رزگاریخوازیی نیشتمانی ئەژمار دەکرێت. هەروەکو چۆن بۆ دەوڵەتی داگیرکەر، یان دەسەڵاتی خۆسەپێن ئەژمار دەکرێت، هەردووکیان جیاوازییان هەیە لەسێ توخمەکەی تری دەوڵەتداو تەنیا لەتوخمی چوارەمدا هاوبەشن، کە ئەویش ئیقلیمە، قەرەبووکردنی ئەو کەمییە ئاشکرایە لەتوخمی ئیقلیمیدا، بزووتنەوەکانی رزگاریخوازیی نیشتمانی؛ کەشێوەی قەوارەیەکی رێکخراوەیی وەرگرتووە لەخەباتیدا،، لەپێناو بڕیاردان لەسەر چارەنووسی خۆی و بەدەسەڵاتی بەسەر گەلەکەی خۆی و چێژ وەرگرتن لەپشتگیریکردن و لایەنگریی جیادەکرێتەوە[٢٥٨]، کەواتە ئەو بزووتنەوە ئازادیخوازییە نیشتمانییانەی کەدانیان پیادانراوە، کاتێك لەپێناو دیاریکردنی چارەنووسدا خەبات دەکەن، بەقەوارەی جەنگاوەر کە سیفەتێکی نێودەوڵەتییان هەبێت، هەژمار دەکرێن.

لەسایەی ئەم بیرۆکە نوێیە و، مەودای یاسایی نێودەوڵەتیدا کە بزووتنەوەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانی گرتویانەتەبەر، توانرا بنەماکانی رێکەوتننامەکانی جنێڤی ساڵی ١٩٤٩ جێبەجێ بکرێت، بەسەر جەنگەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانیدا، ئەوەش لەرێگەی چوونە ریزەوەی حکومەتی کاتی جەزائیر، بۆ ناو

ئەو رێککەوتننامەیە لەساڵی ١٩٦٠[٢٥٩]دا. لەلایەکی ترەوە بەپیاچوونەوەی دەقی بڕیاری (٢)ی هاوبەش لەو رێککەوتننامانەدا، دەبینین رێگە بەجێبەجێکردنی بڕگەکانی دەدات، بەسەر دەوڵەتانی ئەندامی ئەو رێککەوتننامانە (High Contracting parties)، لەکاتی هەڵایسانی ململانێی چەکداری لەنێوانیاندا، یان لەپەیوەندیی هەر یەکێکیانداو هێزی(power) تر، نائەندام لەو رێککەوتننامەیەدا، جێبەجێکردنی بڕگەکانی لەململانێکاندا پەسەند دەکرێت و، زاراوەی هێز Power لێرەدا، بۆ هەر دەوڵەتێکی تری نائەندام لەرێککەوتننامەکەدا، یان هەر رێکخراوێك، یان بزووتنەوەیەکی ئازادیخوازیی نیشتمانی، لەحاڵەتی خەباتی چەکداریی، دژی هێزی داگیر کەر، یان دەسەڵاتی بیانی یان حکومەتە رەگەز پەرستەکان، بەوەی قەوارەیەکی (مادی)یە، سیفەتێکی یاسایی نێودەوڵەتی هەیە[٢٦٠].

جێگەی ئاماژە پێکردنەکە (داننان بەرەوابوونی بزاوتەکانی رزگاریخوازیی نیشتمانی، یان بەواتایەکی‌تر، بەرگریی چەکداری، دەبێ لەبەرتیشکی ئەو گەشەکردنەدا لێکبدرێتەوە کەئێستا بنەما یاساییە نێودەوڵەتییەکانی پێدارەت دەبێت، لەپێناو داننان بەمافی گەلان و ئیقلیمییەکان، لە بڕیاردان لەسەر چارەنووسدا، هەموو ئەم گەل و ئیقلیمانە رووبەڕووی داگیرکاریی راستەوخۆ بوونەوەو، نەیانتوانی لەناوی ببەن، بەهۆی غیابی قەوارەی ناوخۆیی تایبەت بەپارێزگاری و پاراستنی مافی ئەم گەلانە، لەژیان و لەمانەوەدا، ئەگەر ئەم قەوارەیە بەهەر شێوەیەك دەرکەوت و، رێکخراو توانی پشتگیریی میللی بەدەست بهێنێت، ئەوا گەل لەسایەیدا دەتوانێت پراکتیزی هێز بکات بەشێوازە جۆراوجۆرەکانییەوە، بۆ بەرگریی لەمافەکانی و گێڕانەوەی سامان و ئیقلیمەکانی و

---

(٢٥٩) *et*

*international des mristss Democrates, (Bruxelles, 1961), PP.186-201.*

(٢٦٠) بڕوانە مادەی ٩٦ لەپرۆتۆکۆڵی یەکەمی پاشکۆی رێککەوتننامەکانی جنێڤ کەتایبەتە بەپەیوەندییە پابەندکارییەکان، لەکاتی کارکردن بەپێی پاشکۆکە.

لەوەها حاڵەتگەلێکدا، ڕەوابوونی نێودەوڵەتی وێنەکانی بەرگریی چەکدارانە دادەپۆشێت[٢٦١].

---

[٢٦١] بڕوانە: (القانون الدولي العام)، د. حامد سلطان واخرين، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤٧-٣٤٨.

# بابەتی سێیەم

# چەمکە بنەڕەتییەکانی مافی دیاریکردنی چارەنووس

مافی دیاریکردنی چارەنووس، واتە مافی هەر گەلێکە کە بەویستی سەربەستی خۆی، ئەو سستەمی حکومڕانییە هەڵبژێرێت، کە لەگەڵیدا دەگونجێت و، بۆ ئەو هەرێمانەی کە مافی ئۆتۆنۆمییان نییە، یان ئەو هەرێمانەی لەژێر چاودێرییدان، بڕیاری ئایندەی سیاسیی خۆیان بدەن و، راپرسی لەگەڵ دانیشتوانی ئەو هەرێمانەدا بکرێت کە لە دەوڵەتێک جیادەبنەوەو دەچنە ناو دەوڵەتێکی ترەوەو، هەموو گەلێك مافی سەروەریی هەیە، بەسەر سامان و داهاتە سروشتییەکانیدا. سەرەڕای ئەوەی کە دیاریکردنی چارەنووس، بەیەکێك لەپرەنسیپە سەرەکییەکان هەژمار دەکرا، لەگەڵ ئەوەشدا جەختکردنی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەری، وەکو پرەنسیپێك بۆ چوونە ناو بازنەی یاسای نێودەوڵەتییەوە، تیشکی خرایەسەر[٢٦٢].

لەگرنگترین چەمکەکانی مافی دیاریکردنی چارەنووس کە بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان دیاری کردوون:

١. دانانی مافی دیاریکردنی چارەنووس، بەوەی کە بنەمای دیموکراسی لەپەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا بێت، لەبەرئەوەی پشت دەبەستێت بەو بنەمایە

---

[٢٦٢] بڕوانە:

*98R. C.A.D.I., 1956,III), P. 193;*

*7th. Ed., (London, 1972).P.57.*

کە دەبێت دەوڵەت و سنووری قەڵەمڕەوەکەی سستمی سیاسی و دەستوورییەکەی، لەسەر ویستی سەربەستی گەلەکەی دابڕێژرێت[٢٦٣].

٢. مافی دیاریکردنی چارەنووسی پرەنسیپێکی یاساییە، لەپرەنسیپە سەرەکییەکان کە ڕێکخستنی نێودەوڵەتیی هاوچەرخ پشتی پێدەبەستێت و، یەکێکە لەمافە بنەڕەتییەکانی گەلان و یەکەم مەرجی بنەڕەتییە، بۆ هەموو مافەکانی دیکەی مرۆڤ.

٣. مافی دیاریکردنی چارەنووس لە ڕەوابوونیدا، پشت بە بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان و بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتی و بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکان دەبەستێت کە نەتەوە یەکگرتوەکان دایڕشتوون و پراکتیزەکردنی چالاکانەی سەرجەم گەلانی جیاجیای جیهان، لەماوەی ٤٠ ساڵی تەمەنی نەتەوە یەکگرتووەکاندا.

٤. پراکتیزەکردنی مافی دیاریکردنی چارەنووس، لە چوارچێوەی ڕێکخستنی نێودەوڵەتی هاوچەرخ، بەیەکێك لەم دوو ڕێگە یاساییە ئەنجام دەدرێت کە هەردوکیان یاسایی و ڕەوان:

یەکەم- ئامرازە ئاشتییەکان وەکو ڕاپرسی و کاری نێودەوڵەتی بۆ کراوە، کە سەرپەرشتی کردن، لەسەر کردەکانی ڕاپرسی نەتەوە یەکگرتووەکان، دابینکەری سەلامەتی ڕێوشوێنی ئەنجامدانی و دروستیی ئەنجامەکانی بێت.

دووەم- بەکارهێنانی هێز، بەهۆی بزووتنەوەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانی، یان بەمانایەکی وردتر، مافی گەلان لەبەرەنگاربوونەوەی تاکەکەسی و بەکۆی چەکداری، بۆ بەرگریکردن لەمافە زەوتکراوەکانیان و کارکردن بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتیان، بەسەر داهات و قەڵەمڕەوەکەیاندا[٢٦٤].

٥. ملکەچ پێکردنی گەلان بۆ کۆیلەیەتی بیانی، یان دەسەڵاتی، یان داگیرکردنی، داننەنان بە مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ دادەنرێت و بەپێچەوانەی

---

[٢٦٣] بڕوانە: ((الاصول العامة للمنظمات الدولية))، د.عبدالعزيز محمد سرحان، القاهرة، ١٩٦٨، ل٨٠.

[٢٦٤] بڕوانە: ((القانون الدولي العام))، د.حامد سلطان وأخرون، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٥.

بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکانەو هەڕەشە لە کێشەی ئاشتی و هاوکاریی و، لەنێوان گەلانی جیهاندا دەکات. بۆ ئەو گەلانەش دەکەونە ژێر دەسەڵاتی بیانییەوە، یان هەر جۆرێکی دیکەی هاوشێوەی، مافی دیاریکردنی چارەنووسی دەرەکییان هەیە، بەمانای ئەوەی چێژ لەسەروەری و سەربەخۆیی، یان هەر بارودۆخێکی سیاسی نێودەوڵەتی دیکە وەربگرن کە بەویست و زانیاریی ئەو گەلانە کە سەربەخۆ دیاری دەکرێت.

٦. ئەو گەلانەی کە بەدەست رژێمە رەگەز پەرستییەکانەوە دەناڵێنن، مافی دیاریکردنی چارەنووسی ناوخۆیی و هەروەها مافی دیاریکردنی چارەنووسی دەرەکییان هەیە، بەمانای ئەوەی کە خۆی ئازاد بکات لە رژێمەکان، بە بەدیهێنانی دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی، یان جیابوونەوە لەو دەوڵەتە رەگەز پەرستییە.

٧. پێویستە لەسەر دەوڵەتانی دەسەڵاتدار بەسەر ئەو گەلانەدا، وەك ئەوەی لەپێشەوە باسمان کرد، رێز لەو مافەو جێبەجێکردنی بگرێت، پێویستە- بەشێوەیەکی تایبەتی- بەکارهێنانی هێز قەدەغە بکەن لەدژی ئەو گەلانە، بۆ بێبەریی کردنیان لەمافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان.

٨. پێویستە لەسەر دەوڵەتانی دیکە رێگە بەخۆیان نەدەن دەستێوەردانی پراکتیزەکردنی ئەو مافە بکەن و، مافی خۆیەتی کە پشتگیریی مادی و مەعنەوی ئەو گەلە تێکۆشەرو خەبات گێڕانە بکات، لەپێناو دیاریکردنی چارەنووسیاندا.

٩. جەنگەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانی، بەجەنگی رەواو عادیلانە دادەنرێت.

١٠. جەنگەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانی، جەنگی نێودەوڵەتین و هەموو ئەو بنەمایانەیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێن کەیاسای نێودەوڵەتی، سەبارت بەیاساکانی جەنگ بڕیاری لەسەر داون.

١١. بزووتنەوەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانی، بەقەوارەی جەنگاوەر دادەنرێن کەسیفەتی نێودەوڵەتییان هەبێت و، لەو دەوڵەتانەدا دادەنرێن کە هێشتا لەقۆناغی گەڵاڵە بووندان[٢٦٥].

---

(٢٦٥) بەم قەوارانە دەوترێت:

# بابەتی چوارەم
# هەوڵەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆ پشتگیریی خەباتی چەکداریی بزووتنەوەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانیو جیاکردنەوەیان، لەتیرۆری نێودەوڵەتی

نەتەوە یەکگرتووەکان، لەرێگەی کۆمەڵەی گشتییەوە، پشتگیریی کرد لە خەباتی گەلان، لەپێناو ئازادیخوازیو سەربەخۆیی، بەو ئەندازەیەی کەوا ئیدانەی کردە تیرۆرییە ئاراستەکراوەکانی لەدژی کەسانی مەدەنی بێتاوان کرد.

کۆمەڵەی گشتی سووربوو، لە روونکردنەوەی پێویستی تێکەڵ نەکردنی بەرەنگار بوونەوەی رەواو تیرۆر، هەر لەسەرەتای دەست کردنی بەتاوتوێکردنی ئەم بابەتە، هەروەها گرنگیی‌دا بەجیاکردنەوە لەنێوانیانداو، دڵنیابوون لەسەر خەباتی رەوای گەلانی ژێر دەستەی رژێمە داگیرکارییەکان یان رەگەزییەکان، یان هەر شێوەیەکی دیکەی دەسەڵاتی بیانی، ئەو مافەی کە نابێت لەدیاریکردنی چارەنووسدا دەستی تێبخرێت.

لێرەوە هەوڵدەدەین ئاماژە بەتێکۆشانەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بکەین، بۆ جیاکردنەوەی خەباتی چەکداریی بزووتنەوەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانی لەتیرۆری نێودەوڵەتی، لەرێگەی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتیو، لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار بەتیرۆرو، رێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکانەوە.

---

بڕوانە:- Armed Conflict

1977), P.P.30-31.

یەکەم- جیاوازیی نێوان خەباتی چەکداریی بزووتنەوەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانیی و تیرۆری نێودەوڵەتی، لەچوارچێوەی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکاندا:

کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، لەخولی بیست و حەوتەمی ساڵی ١٩٧٢دا، بابەتی تیرۆری نێودەوڵەتی لەخۆ گرتبوو، لەخشتەی کارەکانیاندا داینا. لەسەر پێشنیاری کۆمەڵەی دەوڵەتانی بێلایەن و، راسپاردەی لیژنەی شەشەم، کۆمەڵەی گشتی لە ١٨ ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٢دا، بڕیاری ژمارە ٣٠٣٤ی دەرکرد کە تیایدا نیگەرانیی و دڵەڕاوکێی، بەرامبەر بەزیادبوونی کردەی تیرۆری نێودەوڵەتی دەربڕی و، هانی دەوڵەتانیدا، بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو و ئاشتییانەن، بەمەبەستی لابردنی ئەو هۆکارە شاراوانەی، لەپشتی کردەی توندوتیژییەوەن. کۆمەڵەکە لە بڕیارەکەیدا جەختی کردەوە، لەسەر مافی هەموو گەلانی ژێردەستەی رژێمە داگیرکاریی و رەگەز پەرستییەکان و شێوەکانی تری دەسەڵاتی بیانی کەنابێت و بۆی نییە دەست بخاتە دیاریکردنی چارەنووس و سەربەخۆیی و، پشتگیریی خەباتە رەواکەیانی کرد، بەتایبەتی خەباتی بزووتنەوەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانی، بەپێی ئامانج و پرەنسیپەکانی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەو بڕیارانەی لەوێوە دەرچوون. هەروەها کۆمەڵەکە ئیدانەی کردەکانی سەرکوتکردن و تیرۆری کرد کە رژێمە رەگەز پەرست و بیانییەکان پەنای پێدەبەن، بۆ بێبەشکردنی گەلان لەمافی رەوای خۆیان، لە بڕیاردانی چارەنووس و سەربەخۆییداو، مافەکانی تری مرۆڤ وئازادییە بنەڕەتییەکانیان[٢٦٦].

هەروەها کۆمەڵەی گشتی، سەرلەنوێ لەبڕیاری ژمارە ١٠٢/٣١ی ١٥ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٦دا، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کەنابێت دەست بخرێتە مافی دیاریکردنی چارەنووس و سەربەخۆیی هەموو ئەو گەلانەی، لەژێر دەستی رژێمە داگیرکەرو رەگەز پەرستەکان و هەر جۆرێکی دیکەی دەسەڵاتی بیانیدان و،

---

[٢٦٦] بڕوانە: بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان، *A/8969*

پشتگیریی لەخەباتی رەوایان کردەوەکە لەپێناو ئازادکردنی نیشتمانیدا بەرپای دەکەن[٢٦٧].

هەروەها کۆمەڵەی گشتی لەبڕیاری ژمارە ١٤٧/٣٢ی ١٦ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٦دا، ئیدانەی بەردەوامبوونی کردەکانی سەرکوتکردن و تیرۆری کرد کە رژێمە داگیرکەرو رەگەز پەرست و بیانییەکان پێی هەڵدەستن کە مافی رەوای گەلانیان، لە دیاریکردنی چارەنووس و سەربەخۆیی و مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکاندا زەوتکردووە. هەروەها کۆمەڵەکە لەو بڕیارەیدا، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کەنابێت دەست بخرێتە مافی دیاریکردنی چارەنووس وسەربەخۆیی سەرجەم ئەو گەلانەی، لەژێر دەستی رژێمە داگیرکەرو رەگەز پەرستییەکان، یان هەرشێوەیەکی تری دەسەڵاتی بیانیدان، بەپێی ئامانجەکان و پرەنسیپەکانی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان و بڕیارە دەرچووەکانی لیژنەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لەو بارەیەوە، بڕیار لە رەوابوونی خەباتەکەیان دەدرێت، بەتایبەتی خەباتی بزووتنەوەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانی.

لەخولی سی ونۆهەمیندا، کۆمەڵەی گشتی جارێکیتر، لەبڕیاری ژمارە ١٥٩/٣٩ی تایبەت بەرازی نەبوون بەسیاسەتی تیرۆر، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کەنابێت دەست بخرێتە مافی ئەو گەلانەی کە خۆیان بڕیاری دیاریکردنی چارەنووس و رێگەی گەشەسەندن یان ئازادی دەدەن، هانی سەرجەم دەوڵەتان دەدات کە بەپێی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان، رێز لەسەروەریی دەوڵەتان و سەربەخۆیی سیاسی و مافی گەلان لەدیاریکردنی چارەنووس و، هەروەها مافی هەڵبژاردنی ئازادانەی سستمی کۆمەڵایەتی و سیاسی، بەبێ هیچ دەست تێوەردانێکی دەرەکی و، لەهەوڵدانیدا بۆ بەدیهێنانی گەشەکردنی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی[٢٦٨].

---

[٢٦٧] کۆمەڵەی گشتی بڕیارەکەی پەسەند کرد، لەرێگەی پشتگیریی (١٠٠) دەوڵەت و رازی نەبوونی ٩ دەوڵەت و دەنگ نەدانی ٢٧ دەوڵەت.

[٢٦٨] کۆمەڵەی گشتی ئەم بڕیارەیپەسەند کرد لە ١٧ی کانونی یەکەمی ١٩٨٤ بە دەنگدانێکی تۆمارکراو بەزۆرینەی ١١٧ دەنگ و دەنگ نەدانی ٣٠ دەوڵەت

لەخولی چل هەمینی کۆمەڵەی گشتیدا، لیژنەی شەشەم (یاسایی)وتووێژی لەسەر بەندی تایبەت بەتیرۆری نێودەوڵەتییەوە کردو، هەندێ لەشاندە بەشداربووەکان، داوای پێویستی جیاکردنەوەی کردە تیرۆرییەکانیان، لەخەباتی چەکداری بزووتنەوەکانی ئازادیخوازی نیشتمانی، لەپێناو رزگارکردنی خاکە داگیرکراوەکەی و پراکتیزەکردنی مافی بڕیاردانی کرد. کۆمەڵەی ناوبراو لەبڕیاری ژمارە ٤٠/٦١ی ٩ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٥دا، هانی سەرجەم دەوڵەتان و- بەتاک و بەکۆ- هەروەها دەزگاکانی نەتەوە یەکگرتووەکانی پەیوەندیدار بەکێشەی تیرۆرەوەدا، بۆ هاوبەشی کردن، لەکۆتایی هێنانی لەسەرخۆ، بەهۆیە شاراوەکانی پشتی تیرۆری نێودەوڵەتی و، پێدانی بایەخی تایبەتی بە هەموو ئەو حاڵەتانە، کە داگیرکەری و رەگەز پەرستی و حاڵەتەکانی پێشێلکاریی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان و ئەو حاڵەتانەش کە داگیرکەری بیانی تێدا نییە کە رەنگە تیرۆری نێودەوڵەتی لێبکەوێتەوەو ئاشتی و ئاسایشی جیهان، رووبەرووی مەترسی بکاتەوە[٢٦٩].

لەخولی چل و دووهەمیندا، بەندێکی تەواوکاری بەناونیشانی ((بەستنی کۆنگرەی نێودەوڵەتی بەسەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆ دیاریکردنی تیرۆرو جیاکردنەوەی لەخەباتی گەلان کە لەپێناو ئازادیخوازیی نیشتمانیدا پێی هەڵدەستن))[٢٧٠]، بۆ بەندی تایبەت بەتیرۆر زیاد کراو خرایە خشتەی کاری کۆمەڵەی گشتییەوە. کۆمەڵەی گشتی بڕیاری ژمارە ٤٢/١٥٩ی لە ٧ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٧دا پەسەندکرد کە تیایدا هانی سەرجەم دەوڵەتانی بەتاک دا، کە هاوکاریی یەکتری بکەن، بۆ هاوبەشی کردن، لەکۆتایی هێنان بەهۆکارە شاراوەکانی پشتی تیرۆری نێودەوڵەتی، بایەخی تایبەتی بەهەموو حاڵەتەکانی وەکو داگیرکردن و رەگەزپەرستی و پێشێلکارییەکانی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان و ئەو حاڵەتانەش بدەن کە دەسەڵاتی بیانی و داگیرکردنی بیانی تێدایە، کە رەنگە تیرۆری نێودەوڵەتی لێبکەوێتەوەو ئاشتی و ئاسایشی جیهان

---

[٢٦٩] کۆمەڵەی گشتی ئەم بڕیارەی، بەبێ دەنگدان و بەکۆی راکان پەسەند کرد.

[٢٧٠] دانانی ئەو بەندە تەواوکارییە لەسەر پێشنیاری سوریابوو. بڕوانە A/42/193

رووبەرووی مەترسی بکەنەوە(٢٧١). کۆمەڵەی گشتی جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە لەم بڕیارەدا شتێك نییە، خۆی لەقەرەی مافی دیاریکردنی چارەنووس و ئازادی و سەربەخۆیی بدات کە لە بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە سەرچاوە دەگرێت، بۆ ئەو گەلانەی کە بەزۆرەملێی لەومافەی کە لەجاڕنامەی پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی، تایبەت بە پەیوەندییەکانی دۆستانەو هاوکاری لەنێوان دەوڵەتاندا هاتووە، بەپێی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان، وئاماژەی پێکراوە بێبەشکراون، بەتایبەتی ئەو گەلانەی لەژێر دەستی رژێمە داگیرکەرو رەگەزپەرست و ژێر دەستیی بیانیدان و هەر شێوەیەکی تری داگیرکاری بێت، یان زیان بەمافی ئەو گەلانە بگەیەنرێت لە خەباتیاندا، بۆ وەدیهێنانی ئەو مەبەستەیان و داواکردنی پشتگیریی و بەدەستهێنانی، بەپێی پرەنسیپەکانی بەڵگەنامەکەو بەو جۆرەی، لەگەڵ جاڕنامەی ئاماژەپێکراودا رێکدەکەوێت(٢٧٢)لەخولی چل وچوارەمیندا، کۆمەڵەی گشتی بڕیاری ژمارە ٤٤/٢٩ی، لە رۆژی ٤ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٩دا، دەرکرد کە داوای لە سکرتێری گشتی کرد بەردەوام بێت لە داواکردنی رای دەوڵەتانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان، سەبارەت بە تیرۆری نێودەوڵەتی، بە هەموو لایەنەکانی و، سەبارەت بەرێگەو ئامرازەکانی بنبڕکردنیەوە، بە بەستنی کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتیشەوە، بەسەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتی و جیاکردنەوەی لەگەڵ خەباتی گەلان کە لەپێناو ئازادیخوازیی نیشتمانیدا بەرپای دەکەن و. لەخولی چل وشەشەمیندا، کۆمەڵەی ناوبراو بڕیاری ژمارە ٤٦/٥١ی لەرۆژی ٩ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٩١دا دەرکرد و تیایدا هەمان داوای لەسکرتێری گشتی دووبارە کردەوە، لەگەڵ جەخت کردنەوەی لەسەر مافی گەلان لە خەباتی رەوایاندا، بۆ دیاریکردنی چارەنووس و سەربەخۆیی و، لەداوای پشتگیریی و بەدەستهێنانی، بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستە.

---

(٢٧١) بڕگەی جێبەجێکاری ٨ لە بڕیاری ٤٢/١٥٩. بڕیارەکە سەری گرت بەرەزامەندیی ١٥٣ دەوڵەتو سەرپێچی (٢) دەوڵەت(ئەمریکاو ئیسرائیل)و دەنگنەدانی دەوڵەتێك (هیندۆراس).

(٢٧٢) بڕگەی جێبەجێکاری ١٤ لە بڕیارەکە.

## دووەم- جیاوازیکردن لەنێوان خەباتی چەکداریی بزووتنەوەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانیو تیرۆری نێودەوڵەتی، لەکارەکانی لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار بەتیرۆرەوە:

کۆمەڵەی گشتی لە بڕیاری ژمارە ٣٠٣٤ی ڕۆژی ١٨ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٢دا، بڕیاریدا بەپێکهێنانی لیژنەیەکی تایبەتی پەیوەندیدار بەتیرۆری نێو دەوڵەتییەوە، بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو تێبینیانەی کە دەوڵەتان، سەبارەت بەکۆتایی هێنانی ئەو دیاردەیە پێشکەشی دەکەنو، پاشان ئەوان ڕاپۆرتەکانیان پێشکەش بە کۆمەڵە بکەن، بە ئامۆژگارییەوە کە زەمینە بۆ هاوکاری بڕەخسێنێت، لەپێناو دەسبەجێ کۆتایی هێنان بەو کێشەیە. لیژنەکە لەساڵانی ١٩٧٣و١٩٧٧و١٩٧٩، لە بارەگای نەتەوە یەککگرتووەکاندا کۆبووەوە، لە خولەکانی بیستو هەشتەمو سیو دووهەمو سیو چوارهەمیدا ڕاپۆرتەکانی پێشکەش بە کۆمەڵەی گشتی کرد.

لەخولی سیو دووهەمیندا، لیژنەکە وتووێژی لەسەر لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری کرد کە ئەمینداریەتی گشتی نەتەوە یەککگرتووەکان ئامادەی کردبوو. تیایدا بۆچوونی دەوڵەتان، سەبارەت بەهۆیە شاراوەکانی پشتی دیاردەی تیرۆرەوە خرانەروو، وخۆی لەپێناسەی تیرۆرداو، پێشنیاری ڕێوشوێنی عەمەلی بۆ بنبڕکردنی کرد. لێکۆڵینەوەکە بڕیاری لەسەر ئەوەدا کە چەند دەوڵەتێك جەختیان، لەسەر پێویستی دوورخستنەوەی ئەو کارانەی کە بزووتنەوەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانی پێی هەڵدەستنو دان بەرەوابوونی خەباتەکەیاندا نراوە، بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان لەدیاریکردنی چارەنووسو سەربەخۆیی لەپێناسەی تیرۆردا، ئەگەر چی هەندێ لەولاتان بەرامبەر بەو دوورخستنەوەیە خۆیان گرت[٢٧٣].

---

[٢٧٣] لەو لێکۆڵینەوە شیکارییەی کە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەککگرتووەکان ئامادەی کرد، سەبارەت بە تیرۆر، بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ١٤٧/٣٢، بڕوانە:

*A/AC.160/4,29 February 1979.*

لەخولی سی وچوارەمینی سالی ١٩٧٩دا، لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار بەتیرۆر، سەبارەت بە تیرۆری نێودەوڵەتی و ئەو رێ‌وشوێنانەی کە دەتوانرێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی بیگرێتەبەر، وتوویژییان لەسەرکرا. لیژنەکە راپۆرتی خۆی پێشکەش بەکۆمەڵەی گشتی کرد کە راسپاردەو پێشنیارەکانی لەو دوو مەسەلەیەدا لە خۆ گرتبوو. ئەوەی پەیوەندیی بەهۆیەکانی تیرۆرەوە هەیە، لیژنەکە ئامارەی بۆ هۆیە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان کرد. لەنێو هۆیە سیاسییەکاندا، لیژنەکە ئامارەی بۆ داگیرکەرو رەگەز پەرستی و دوژمن و دەستێوەردان، لەکاروباری ناوخۆیی دەوڵەتانی ترو توندوتیژیی بەکۆمەڵ کرد کە بەهۆی دەرکردنی بەکۆمەڵی دانیشتوانەوەو داگیرکردن و دەسەڵاتی بیانییەوە روودەدەن.

لەنێو هۆیە کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەکانیشدا، لیژنەکە ئامارەی بۆ نەبوونی رەوایی لەسستمی ئابووریی نێودەوڵەتی و چەوساندنەوەی بێگانەو زەوتکردنی داهاتە سروشتییەکان کرد، لەلایەن بێگانەو نەبوونی دادوەری کۆمەڵایەتی و پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و هەژاری و برسێتی و نائومێدی[٢٧٤].

دەوڵەتانی بێلایەن لەسالی ١٩٧٩دا، سەبارەت بەهۆیە شاراوەکانی پشتی تیرۆری نێودەوڵەتییەوە، رەشنووسی کارێکیان پێشکەش بەلیژنەی تایبەت بە تیرۆرییان کردو تیایدا جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کەپێویستە دەست نەخرێتە ناو پسپۆریی لیژنەی مافەکان، لەبڕیاردانی چارەنووس و سەربەخۆیی بۆ هەمووگەلانی تری دەسەڵاتی بیانی، ئەویش بە لەبەرچاوگرتنی رەوایی خەباتەکەیان و، بەتایبەتی خەباتی بزووتنەوە ئازادیخوازییە نیشتمانییەکان، بەپێی بەمەبەست و پرەنسیپەکانی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان و بڕیارەکانی لەوبارەیەوە، لیژنەکانی سەربە نەتەوە یەکگرتووەکان. هەروەها لەرەشنووسەکەدا هاتووە کە خەباتی بزووتنەوە ئازادیخوازەکان، دەکەوێتە

---

[٢٧٤] راپۆرتی لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار بە تیرۆر سالی ١٩٧٩، بڕوانە A/34/37.

چوارچێوەی پسپۆریی ڕێکەوتنامەکانی جنێڤی ساڵی ١٩٤٩و دوو پرۆتۆکۆڵەکەی ساڵی ١٩٧٧ کە پاشکۆین و، نابێت بەکردەی تیرۆر لەقەڵەم بدرێت[٢٧٥].

سەبارەت بەگرتنەبەری ڕێوشوێنی گونجاو، بۆ بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر، لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار بەتیرۆر، ڕاسپێردرا بۆ گرتنەبەری ڕێوشوێنی کردە، بۆ هاوکاریکردن لەپێناو کۆتایی هێنانی دەسبەجێ بەسەر ئەو کێشەیەو ئێدانەی بەردەوام بوونی کردەکانی سەرکوتکردن و تیرۆری کرد، کە لەلایەن ڕژێمە داگیرکەرو ڕەگەز پەرست و بیانییەکانەوە جێ بەجێ دەکرێت کەمافی ڕەوای گەلانیان زەوتکردووە، لە دیاریکردنی چارەنووس و سەربەخۆیی و مافەکانی تری، وەکو مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان و، لیژنەکە ئاماژەی کرد بەوەی کە وەسف کردنی بەرەنگاریی ترس کە بەهۆی ڕێوشوێنی کپ کردنەوەی خواستەکانی گەلانەوە سەر هەڵدەدات، بەوەی کە تیرۆرو تەنیا بەوە ڕاڤە دەکرێت کە هەوڵێکە، بە مەبەستی بەرگریی لەو پەیوەندییە نێودەوڵەتی و کۆمەڵایەتییانە کە کاتیان بەسەرچووەو، بۆ کەمکردنەوەی پێگەی خەباتی ڕەوای گەلانی ستەم دیدە، لەپێناوی ئازادی و سەربەخۆیی و دژی هەموو شێوازەکانی ئەو پەیوەندییە بەرپایانە، بۆ دەست بەسەراگرتن و نکوڵی کردن لە مافەکان و لەمپەرخستنە بەردەم ئەم خەباتەیە[٢٧٦].

---

[٢٧٥] بڕوانە:

*A/AC. 160/ WG/ R I, 1979.*

[٢٧٦] بڕوانە: *A/34/37, Pare. 29.*

## سێیەم-جیاوازیکردن لەنێوان خەباتی چەکداریی بزووتنەوە ئازادیخوازە نیشتمانییەکان و تیرۆری نێودەوڵەتی لەرێکەوتنانە نێودەوڵەتییە تایبەتەکان بەتیرۆرەوە:

لەگەڵ ئەوەی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتی و کارەکانی لیژنەی تایبەت بە تیرۆرەوە کە جەخت لەسەر رەوابوونی خەباتی چەکداریی بزووتنەوە ئازادیخوازە نیشتمانییەکان دەکەن، لە رێکەوتنامە نێودەوڵەتییەکانیشدا، پشتگیریی لەو پرەنسیپە یاساییەو جیاوازیی لەگەڵ تیرۆری نێودەوڵەتی کراوە. رێکەوتنامەی نێودەوڵەتی بۆ بەرەنگاربوونەوەی بە بارمتەگرتن کە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٧ی کانونی یەکەمی ١٩٧٩دا، بڕیاری لەسەردا کە هەرکەسێك، کەسێکیتر بە بارمتە بگرێت و هەڕەشەی کوشتنی لێبکات، یان ئازارو ئەشکەنجەی بدات، یان بەردەوام بێت لە بەندکردنی، لەپێناو تەنگەتاوکردنی لایەنێکی سێیەم، جا ئەگەر دەوڵەت بێت یان رێکخراوی حکومی نێودەوڵەتی بێت، یان کەسێکی ئاسایی بێت، یان مەعنەوی، یان کۆمەڵە کەسێك بن، بەمەبەستی دەستەبەرکردنی کارێکی دیاریکراوی، وەکو مەرجێکی ئاشکرا یان نائاشکرا بۆ رزگارکردنی بارمتەگیراوەکە. تاوانی بە بارمتەگرتن وەکو لە رێکەوتنامەکەدا هاتووە[٢٧٧]، هەریەك لەمانەش دەگرێتەوە، ئەگەر کەسێك هەستێت بەدەستپێکردنی ئەنجامدانی کاری بەبارمتەگرتن، یان هاوبەشیکردن لەو کارەدا، بە تاوانباری بارمتەگرتن هەژمار دەکرێت، بەناوی ئەوەی بەشداریی لەئەنجامدان و دەست پێکردنی ئەو کارەدا کردووە[٢٧٨].

دوای ئەوەی رێکەوتننامەکە، هەرکارێك لەکارەکانی گرتن و بەندکردنی بارمتەگیراوەکان، یان دەستپێکردن یان هاوبەشیکردن لەئەنجامدانیدا،

---

[٢٧٧] مادەی ١/١ لە رێکەوتننامەکە.

[٢٧٨] مادەی لە رێکەوتننامەکە.

تاوانبارکردو بەکاری تیرۆری لەقەڵەم دا، جیاوازیی قایل بوو لەنێوان ئەو کردە تیرۆرییانەو خەباتی ڕەوای چەکدارانە کە بزاڤەکانی ڕزگاریخوازی نیشتمانی دەیگرنەبەر، لە ڕووبەڕووبوونەوەی هەر شێوەیەك لەشێوەکانی نۆرێنی دەسەڵاتی بێگانە یان داگیرکەر، یان ڕەگەزپەرستی لەپێناو دیاریکردنی چارەنووس و سەربەخۆیی، لەدەقی مادەی ١٢ی ڕێکەوتننامەکەدا هاتووە کە: بەو ئەندازەیەی ڕێکەوتننامەی جنێڤی ساڵی ١٩٤٩، بۆ پاراستنی قوربانیانی جەنگ، یان پرۆتۆکۆڵە سەربازییەکانی ئەو ڕێکەوتننامە بڵاوانەی کردەکانی بارمتەگرتن، هەروەها بەو ئەندازەیەی کە دەوڵەتی ئەندامی ڕێکەوتننامەکە پابەند دەبن، بەپێی ڕێکەوتننامە ئاماژە پێکراوەکان، بەدادگاییکردن، یان بەدەستەوەدانی بارمتەگرتن، بەڵام ئەو ڕێکەوتننامەیە بەسەر ئەو بارمتەگیراوانەدا جێبەجێ ناکرێت کە لەکاتی ململانێی چەکداریدا ئەنجام دەدرێت کە لەڕێکەوتننامەکەی جنێڤی ساڵی ١٩٤٩داو پرۆتۆکۆڵەکانیدا هاتووە، بەو ململانێ چەکدارییانەوە کە لەبڕگەی ٤ی مادەی یەکەمی پرۆتۆکۆڵی یەکەمی سەربارى ساڵی ١٩٧٧، هاتووە، کە گەلان خەبات لەدژی دەسەڵاتی داگیرکاری و داگیرکەری بیانی و ڕژێمە ڕەگەز پەرستییەکان دەکەن و، پراکتیزەکردنی ئەو مافە وەکو چۆن لە بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان و جاڕنامەی پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی، پەیوەست بە پەیوەندیی تەبایی و هاوکاری لەنێوان ئەو دەوڵەتانە، بەپێی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەرجەستە کراوە[٢٧٩].

---

[٢٧٩] سەبارەت بەدەقی ڕێکەوتنامەکە بڕوانە:

*Y.U.N., 1979, P. 1144:*

*GARes. 34/146/ Annx. 17 December, 1979.*

## چوارەم- تێگەیشتنمان لە خەباتی ڕەوای چەکداریی:

لەوەی پێشتر سەبارەت بە هەوڵ و کۆششی نەتەوە یەکگرتووەکان، لەپشتگیریی ئەو خەباتەدا کە بزووتنەوەکانی ئازادیخوازیی نیشتمانی درێژەی پێدەدەن و جیاکردنەوەی لەتیرۆری نێودەوڵەتی، ڕەوابوونی ڕەوشت و سیاسەتی خەباتی ئەو گەلانەمان بۆ روون دەبێتەوە کە لەدژی ڕژێمە داگیرکەر یان ڕەگەز پەرستەکان، یان هەرشێوەیەکی تری دەسەلاتی بیانی پیادەی دەکەن و، نابێت دەست بخرێتە مافی دیاریکردنی چارەنووس، بە هەموو ئەو ئامرازانەی لەبەردەستدایەو لەتوانادایە، بەهێزی چەکداریشەوە.

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا، پێویستە جەخت لەسەر تێگەیشتنی خەباتی ڕەوای چەکداری بکرێتەوە، ئەویش بە بەکارهێنانی ئەو هێزو توانایەی کە لە بڕگەکانی ڕێکەوتنامەی جنێڤی ساڵی ١٩٤٩و هەردوو پرۆتۆکۆڵی پاشکۆی سەربار، پەلنەهاوێژێت بۆ ئەو چالاکییانەی کە هەندێ گروپ فەلسەفەی خۆیان، لەسەر جێبەجێکردنی کردە تیرۆرییەکانی دژی ژنان و منالان و هاوولاتییانی بێتاوان و رفاندنی فڕۆکەو بەبارمتەگرتن دارشتووە.

چونکە ئەو توندوتیژییەی کە شێوەی کردەی تاوانباری وەردەگرێت و لەگەڵ رەوشی مرۆڤایەتیدا یەکناگرێتەوە، ناکرێت بەکاری سیاسی لەقەڵەم بدرێت و. هەروەها نابێت پاساوی بۆ بهێنرێتەوەو سیفەتی ڕەوابوونی بەسەردا جێبەجێ بکرێت، ئەگەر بەهۆی هەر پاڵنەرێکیشەوە ئەنجام بدرێت. لەبەر ئەوە مەبەستەکە پاساوێك نییە بۆ گرتنەبەری ئەو شێوازو ڕێگەیە، پێویستە ئیدانەی کردەی تاوان بکرێت و چاوپۆشی لە پاڵنەرەکانیشی بکرێت، وەکو چۆن پاڵنەری جوامێرانە نابێ ئاکاری ڕەوابوون ببەخشێت، بەهەندێ شێوازەکانی بەکارهێنانی توندوتیژیی تایبەت، کاتێ دژی بێتاوان ئاراستە دەکرێت.

چونکە ئەو کردەیە بەتیرۆر هەژمار ناکرێت و یاسای نێودەوڵەتیش سزای لەسەر دانانێت، ئەگەر پاڵنەری، بەرگری بێت لە مافە دیاریکراوەکانی تاکەکان و،

مافەکانی مرۆڤ و گەلان و، مافی دیاریکردنی چارەنووس و، مافی رزگارکردنی خاکە داگیرکراوەکان و بەرەنگاری و بەرپەرچدانەوەی داگیرکەر، لەبەر ئەوە ئەو کردانە خۆیان لەبەردەم چەند مافێکدا دەبیننەوە کە یاسای نێودەوڵەتی بۆ تاکەکان و بۆ دەوڵەتان بڕیاری لەسەرداوە، چونکە پەیوەست دەبێت بە بەکارهێنانی رەوای هێزەوە، بەپێی بڕگەکانی ئەو یاسا نێودەوڵەتییانەوە کە لەسەری رێکەوتوون[280].

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مافە رەهانییەو بەڵکو بەستراوە، بە بەکارهێنانی ئامانجە سەربازی، یان بەرژەوەندییە مادییەکانی دەوڵەتی کۆلۆنیالکراو، یان دەوڵەتی داگیرکەر، بەسەربازو کەرەسەو تفاقی سەربازییەوە، پێویستە لەناو خاکی داگیرکراودا، بێت بەئامانجی بەرەنگاریکردنی داگیرکەرو ئازادکردنی خاك و گەیشتن بەدیاریکردنی چارەنووس و، دەکرێت رووبەرووی بەرژەوەندییە مادییەکانی دەوڵەتی داگیرکەر ببێتەوە، ئەگەر سیاسەتی سەرکوتکردنی پیادەکرد، لەدژی ئەو گەلەی کە هەوڵی دیاریکردنی چارەنووسی دەدات، لەدەرەوەی هەرێمە داگیرکراوەکە، بەمەرجێ زیان بەبێ تاوان، یان ئەوکەسانەی کە مافی چاودێری و پاراستنی نێودەوڵەتییان هەیە نەگەیەنێت، یان ئازادییەکانیان رووبەرووی مەترسی نەکرێتەوە، بەپێی رێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان لەو بارەیەوە. پێویستە جەخت لەسەر ئەوەش بکرێتەوە کە دەرچوون لەو چوارچێوەیە، کاریگەریی سلبی هەیە لەسەر سۆزی رای گشتی جیهان بۆ بزووتنەوە ئازادیخوازە نیشتمانییەکان و، دەبێتە هۆی تێکدان و لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی ئەو رەوابوونە کە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا بەدەستی هێناوە.

لەبەر رۆشنایی ئەوەی لەپێشەوە باسکرا، دەتوانین بڵێین کە رفاندنی کەشتی ئیتالی(ئەشیل لۆرۆ) لەساڵی ١٩٨٥دا، بەکارێکی تیرۆری لەقەڵەم دەدرێت و پێویستە سزای ئەنجامدەرانی بدرێت و، کۆمەڵی نێودەوڵەتی بەگشتی ئیدانەی

---

[280] بڕوانە: ((حول تعريف الارهاب الدولي وتحديد مضمونه من واقع قواعد القانون الدولي وقرارات المنظمات الدولية))، د.عبدالعزيز محمد سرحان، گۆڤاری میسری تایبەت بەیاسای نێودەوڵەتی، ژمارە ٢٩ی ١٩٧٢، ل١٧٤و، هەروەها (الارهاب والقانون الدولي) د.اسماعيل الغزال، ١٩٩٠، ل٥٨-٦١.

ئەو کردەیەیان کردو کاریگەریی خراپی کردە سەر رای گشتی جیهان و سۆزیان بەلای کێشەی فەلەستیندا، هەروەها لەگەڵ ئەوەی کە رێکخراوی رزگاریخوازیی فەلەستینی لە راگەیاندنی قاهیرەدا، سەبارەت بەقۆناغەکانی تێکۆشانی فەلەستینی کە لە ٧ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٥دا دەرچوو، جەختی لەسەر کراوەو، تیایدا رێکخراوەکە چەندین پرەنسیپی راگەیاندو ئەو چوارچێوەیە رێك دەخات کە تیایدا هەڵدەسورێت و لەسەر گۆرەپانی نێودەوڵەتییدا پێوەی پابەند دەبێت، هەروەها چەند جیاوازییەکی ئاشکرای لەنێوان کردە تیرۆرییەکان و بەرەنگار بوونەوەی داگیرکەری بیانی لەخۆگرتووە. لەگرنگترین ئەو پرەنسیپانەش ئەمانەن[٢٨١].

١. ئیدانەکردنی سەرجەم کردەکانی تیرۆر، چ ئەوەی کە دەوڵەتانی تێوەدەگلێت، یان لەدژی تاك و تاقمە بێ تاوانەکان ئەنجام دەدرێت.

٢. جەخت کردن لەسەر بریاری ساڵی ١٩٧٤، بۆ ئیدانەکردنی هەموو کردەیەکی دەرەکی و سەرجەم شێوەکانی تیرۆرو سەرلەنوێ پابەندبوونی گشت گروپ و دەزگاو دامەزراوەکان بەو بریارەوەو، رێکخراوەکە لە بەرواری راگەیاندنی قاهیرەوە، لە بەرامبەر سەرپێچی کاراندا هەموو رێوشوێنێك دەگرێتەبەر.

٣. داوای لە کۆمەڵەی نێودەوڵەتی کرد کە ئیسرائیل پابەند بکات بەوەستاندنی سەرجەم کردە تیرۆرییەکان، لەناوخۆو دەرەوەدا.

٤. پابەندبوونی بەمافی گەلی فەلەستین، لەبەرپەچدانەوەی داگیرکاریی ئیسرائیلدا، بۆ خاکەکەی بە هەموو شێوەیەك، بە ئامانجی چەسپاندنی کشانەوە لەو خاکەدا.

٥. قایل بوون بەوەی کە کردە تیرۆرییەکانی کە لەدەرەوە روو دەدەن، کاریگەریی خراپی هەیە بۆ سەر کێشەی فەلەستین و وێنەی خەباتە رەواکەیان، لەپێناو ئازادیدا ناشرین و دزێو دەکات.

---

[٢٨١] بروانە: (النظرية المعاصرة للحياد)، د.عائشە راتب، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٩-٢٤٢.

٦. بڕوا بوونی چەسپاو بەوەی کە کۆتایی هێنان بەداگیرکردنو دانانی ئاستێك بۆ ئەو سیاسەتە، تەنیا ڕێگە چارەیە، بۆ سەقامگیریی ئاشتیو ئاسایش لەناوچەکەدا.

لەکۆتاییدا، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەین کە (هەتا ئەگەر لەکاتێکدا کە لەڕووی یاسایو ڕەوشتییەوە، بەکارهێنانی هێز پەسەند بکرێت، چەندین ئامراز هەیە، وەکو لەحاڵەتی هەر ململانێیەکی مرۆڤایەتیدا بێت، پێویستە بەکار نەهێنرێ. چونکە ڕەوابوونی کێشەکە پاساو نییە، بۆ پەنا بردنە بەر شێوەیەکی دەستنیشانکراو لەتوندو تیژی، بەتایبەتی دژی بێتاوانان)[٢٨٢].

---

[٢٨٢] بڕوانە:

A/c,6/418, Corr, l and Add.1.

# بەشی چوارەم

## هەوڵەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆ کۆتایی هێنان بە دیاردەی تیرۆری نێودەوڵەتی

سەرەتای دەستپێکردنی گرنگیدانی نەتەوە یەکگرتووەکان بەقەڵاچۆکردن و بنبڕکردنی تیرۆر، لە ئەنجامدانی بڵاوبوونەوەی شەپۆلی توندو تیژیی سیاسی بوو، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و، بڵاوبوونەوەی دیاردەی رفاندنی فڕۆکەو، دەستگیرکردن و بەندکردنی نێردراوانی دبلۆماسی لەسەرەتای حەفتاکاندا، کە بەرەو مەترسی دەچوو تیایدا ژیانی سەدان لەبێ تاوانانیشی دەخستە مەترسییەوە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا، پێشێلکردنی ئاشکراو زەقی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانیەتی و، مایەی نیگەرانیی جیهانی هاوچەرخیشە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە کردەکانی توندوتیژیی سیاسی، دەبێتە هۆی تێکدانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و، تێکچوون و لەبەریەك هەڵوەشانەوەی پشتگیریکردن، لە سەقامگیریی نێوان دەوڵەتان و، لەقبوونی ئاشتی جیهان، کە هەڕەشەیەکە بۆسەر بەرژەوەندیی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و ئاسایش و ئاشتی و لەسەرروویانەوە هۆیەکانی گواستنەوەی ئاسمانی و پەیوەندیی هاتوچۆی نێودەوڵەتی، نەتەوە یەکگرتووەکان چارەسەرێکی بۆ ئەو دیاردەیە رەچاوکرد و، هەوڵی‌دا بۆ گەیشتن بەپێناسەی تیرۆرو دانانی هەموو ئەو کردانەی تیرۆر لەوچوارچێوەیەداو لێکۆڵینە لەهۆیەکان و ئامرازەکانی، بەمەبەستی گەیشتنە چارەسەری گونجاو بۆ کێشەکە.

# بابەتی یەکەم
# ئیدانەکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ تیرۆری نێودەوڵەتیو هاندانی دەوڵەتان بۆ هاوکاریکردن بۆ بنبڕکردنی

نەتەوە یەکگرتووەکان، لەکۆتایی شەستەکانو سەرەتای حەفتاکاندا، چەند بڕیارێکی دارشت کە تیرۆری نێودەوڵەتیشی لەخۆ گرتبوو، تیایدا تیشکی خستبووە سەر کردەکانی زەوتکردنی فڕۆکەو گۆڕینی ڕەوتەکەیو هەڕەشەکردن لەسەرنشینەکانی کەلەو کاتەدا بڵاوبوو، داوای لەدەوڵەتانو ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە پەیوەندیدارەکان کرد کە چەندین ڕێوشوێن بگرنەبەر، بۆ بنبڕکردنی کردەکانی تیرۆرو سزادانی ئەنجامدەرانی.

لە ١٢ی کانونی یەکەمی ١٩٦٩دا، کۆمەڵەی گشتی بڕیارێکی دەرکردو تیایدا ئیدانەی گۆڕینی ڕەوتی فڕۆکە مەدەنییەکانی، بەزەبری هێز لەکاتی فڕیندا کردو، نیگەرانیو دڵەڕاوکێی خۆی، سەبارەت بەزیادبوونی دەست تێوەردانی نایاسای لە فڕینی فڕۆکە مەدەنییە نێودەوڵەتیەکاندا دەربڕی[٢٨٣]. کۆمەڵەی گشتی لە بڕیارەکەیدا، جەختی لەسەر پێویستیی گرتنەبەری ڕێوشوێنی کاریگەر کردەوە، لەدژی ئەو کردانە، بەتێڕوانین لەوەی کە ژیانی چەندین کەسی بێتاون لەگەشتیارانو کارمەندانی هێڵە ئاسمانییەکان، کە ڕووبەڕووی مەترسی دەبێتەوە. کۆمەڵەکە داوای لەدەوڵەتات کرد، جەخت لەسەر یاسا نیشتمانییەکانیان بکەنەوە کەسستمێکی گونجاوی لەخۆگرتبێ کە گرتنەبەری ڕێوشوێنی یاسایی کاریگەر دەستەبەر بکات، بۆ بنبڕکردنی شێوەکانی

[٢٨٣] بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە ٢٥٥١، خولی ٢٤ بۆ دەقی بڕیارەکە، بڕوانە *Y.UN, 1969, P.795*، ئەم بڕیارە لەکۆبوونەوەی ١٨٣١، بەرەزامەندیی ٧٧ دەوڵەتو سەرپێچی(٢) دەوڵەتو دەنگ نەدانی ١٧ دەوڵەت دەنگی لەسەردرا.

دەستێوەردانی نایاسایی دژی فڕۆکەی مەدەنی‌و، بەشێوەیەکی تایبەتی هانی دەوڵەتانی‌دا کە دادگایی سەرجەم ئەو تاوانبارانەبکەن کە کردەکانی لەو جۆرە، لەناو فڕۆکەدا ئەنجام دەدەن.

هەروەها کۆمەڵەی گشتی لەبڕیارەکەیدا، داوای کرد پێویستە پشتگیریی تەواوی هەوڵ‌و تێکۆشانی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بۆ فڕینی مەدەنی بکرێت‌و، داوای لە دەوڵەتان کرد کە بڕیار لەسەر ڕێکەوتنامەی تۆکیۆی ساڵی ١٩٦٣ بدەن‌و بچنە ریزییەوە.

ئەنجومەنی ئاسایش لە ٩ی ئەیلولی ساڵی ١٩٧٠دا، بڕیارێکی دەرکردو نیگەرانی‌و بێزاریی زۆری دەربڕی، سەبارەت بەو هەڕەشانەی کە ڕووبەڕووی ژیانی هاوولاتییانی بێ‌تاوان دەبێتەوە، بەهۆی رفاندنی فڕۆکەوەو، هەر لەوکاتەدا داوای لەسەرجەم ئەو لایەنانەکرد کە دەسبەجێ ئەو سەرنشین‌و ستافی فڕۆکانە ئازاد بکەن، بەبێ جیاوازی، ئەوانەی کە لەئەنجامی رفاندنی فڕۆکە، یان هەر دەستدرێژییەکی‌تر، لە گەشتی نێودەوڵەتیدا دەستگیر کراون. هەروەها بڕیارەکە داوای گرتنەبەری سەرجەم ڕێوشوێنی یاسایی کرد، بۆ نەهێشتنی رفاندنی فڕۆکە لە داهاتوودا، یان هەر دەستێوەردانێك لە گەشتی مەدەنیی ئاسمانی، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا[٢٨٤].

لە ٢٥ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٠دا، کۆمەڵەی گشتی بڕیارێکی، سەبارەت بەدەستێوەردان، لەگەشتی مەدەنی ئاسمانی یان گۆڕینی ڕەوتی فڕۆکە[٢٨٥] داڕشت. کەتیایدا کۆمەڵەکە جەختی لەسەر ڕۆڵی گرنگی فڕینی مەدەنی کردەوە، لە پاراستنی پەیوەندیی دۆستانەی نێودەوڵەتان‌و، ئەو

---

[٢٨٤] بڕیاری ژمارە ٢٨٦ی ساڵی ١٩٧٠، و لەکۆبوونەوەکەدا، بەبێ دەنگدان بڕیاری ١٥٥٢ی ئەنجومەنی ئاسایش دەرچوو. بۆ دەقی بڕیارەکە بڕوانە:

*Resolution 286 (1970), as proposed following Consultations among Council members , S/9933/ Rev. 1, meeting 1552, 9 September 1970.*

[٢٨٥] بڕیاری ژمارە ٢٦٤٥ی خولی (٢٥)ی کۆمەڵەی گشتی. ئەم بڕیارە بەرەزامەندیی ١٠٥ دەوڵەت‌و دەنگ نەدانی ٨ دەوڵەت دەرچوو. بۆ دەقی بڕیارەکە، بڕوانە: بەڵگەنامەی ژمارە، A/8176ی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان.

بەرژەوەندییەی دەگەڕێتەوە بۆ هەموو وڵاتان، لە ڕێکخستنی کاری ئەم کەناڵە گرنگەو دابینکردنی ئاسایش بۆی.

هەروەها کۆمەڵەکە لەبڕیارەکەیدا، بەبێ جیاوازی ئیدانەی کردەکانی گۆڕینی ڕەوتی فڕۆکە، یان هەر دەستێوەردانێك لەهۆیەکانی گواستنەوەی ئاسمانی کردو، داوای لە دەوڵەتان کرد کە سەرجەم ڕێوشوێنی گونجاو بگرنەبەر، بۆ بەرپەچدانەوەی هەر هەوڵدانێك، بۆ ئەنجامدانی تاوانی لەو جرەو قەدەغەکردن، یان بنبڕکردنی لە چوارچێوەی پسپۆرییەکەیدا لەسەرجەم قۆناغەکانداو، دەست گیرکردنی ئەنجامدەران و سزادانیان بە گوێرەی ئاستی مەترسیی ئەو تاوانانە. هەروەها کۆمەڵەکە ئیدانەی کردەی گرتن و بەندکردنی بارمتە گیراوەکانی کرد کە لەزەوتکردنی نایاسایی فڕۆکەوە سەرچاوە دەگرێت و، هانی ئەو دەوڵەتانەی دا کە لەئەنجامی گۆڕینی ڕەوتی فڕۆکە ڕفێنراوەکەوە گەیەنراوەتە قەڵەمڕەوەکانیان، پارێزگاریی لەسەرنشین و ستافی فڕۆکەکەو فڕۆکەکەش بکەن و، زەمینەیان بۆ برەخسێنرێت، بەزووترین کات درێژە بەگەشتەکەیان بدەن.

فڕۆکەکەو کەل وپەلەکان بگێڕدرێنەوە بۆ خاوەنەکانیان. هەروەها لە بڕیارەکەیدا، داوا لە دەوڵەتان کراوە کە ئەو ڕێوشوێنانە بگرنەبەر کە ڕێکەوتوون لەسەری، بۆ بنبڕکردنی ئەو کردانەی کە هەڕشە لە سەلامەتی و سستمی هێڵەکانی گواستنەوەی نێودەوڵەتی ئاسمانیی دەکات و هانی دان بۆ پشتگیریی تەواو، بۆ ئەو هەوڵ و تێکۆشانەی کە ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بۆ فڕینی مەدەنی دەیخاتەگەڕ، بۆ بەرەنگار بوونەوەی دەست تێوەردانی نایاسایی، لە گواستنەوەی ئاسمانی نێودەوڵەتیدا.

لە ۲۰ی حوزەیرانی ساڵی ۱۹۷۲دا، ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیارێکی دارشت و تیایدا بێزاری و نیگەرانی زۆری خۆی، بەرامبەر بەو هەڕەشانەی ڕووبەرووی ژیانی سەرنشینەکان و فڕۆکەوانەکان دەبێتەوە دەربڕی، لەئەنجامی زەوتکردنی نایاسایی فڕۆکەوە، یان هەر کارێکی دەستێوەردانی نایاسایی لەفڕینی ئاسمانیی مەدەنیدا(۲۸٦). ئەنجومەن لەبڕیارەکەیدا، جەختی لەسەر پێویستیی کۆتایی هێنان

---

(۲۸٦) بۆ دەقی بڕیارەکەی ئەنجومەنی ئاسایش، بڕوانە:

بەو کردە ئاراستەکراوانەی دژی سەلامەتی فڕینی نێودەوڵەتی کردو کە لەسەرجەم شوێنەکانی جیهاندا ئەنجام دەدرێت و، داوا لە دەوڵەتان کرا کە ڕێوشوێنی گونجاو بگرنە بەر، لەچوارچێوەی پسپۆڕیدا، بۆ بەرپەچدانەوەی ئەو کردانەو قەدەغەکردنیان و، گرتنەبەری ڕێوشوێنی کاریگەر، بەرامبەر ئەوانەی کە ئەو کردانە ئەنجام دەدەن. هەروەها ئەنجومەنەکە داوای لەسەرجەم دەوڵەتان کرد، هەوڵەکانیان بخەنە گەڕو پشتگیری و هاوکاریی یەك بکەن لەو بوارەدایە، ئەو پابەندبوونانەی کە لەبەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە، بۆدابین کردنی بەرزترین ئاستی گونجاو، بۆ ئاشتی و ئاسایش و دڵنیایی لەفڕینی مەدەنیی نێودەوڵەتیدا.

---

*Offical Records of the Security Council Twenty Seventh Year. .Supplement for April, May and June 1972, document S/1070.*

# بابەتی دووەم
# تیرۆری نێودەوڵەتی لەخشتەی کارەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکاندا

لەساڵی ۱۹۷۲ەوە، نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵمەتەکەی لە دژی تیرۆری نێودەوڵەتی چڕ کردەوەو لەقۆناغی ئیدانەکردنی تیرۆری ئاراستەکراو، دژی ئاسایش و سەلامەتی هۆیەکانیگواستنەوەی ئاسمانی، کارەکانی زەوتکردنی فڕۆکەو گۆڕینی ڕەوتەکەی و هەڕەشەکردن لەسەرنشینەکان، گوێزرایەوە بۆ قۆناغێکی قوڵ کە بەگشتگیری و فراوانی جیادەکرێتەوە، ئەوەش لەڕێگەی ئەوەی تیرۆر لەخۆدەگرێت بەشێوە جیاوازەکانییەوەو، ڕەچاوکردنی ئەو دۆخ و هۆکارانەی دەبنە هۆی ڕوودانی وەکو هەوڵێك بۆ گەیشتن بەپێناسەیەکی دیاریکراو بۆ کاری تیرۆرو ڕێکەوتن لەسەر شێوازەکان هاوکاریی نێودەوڵەتی بۆ بنبڕکردنی[٢٨٧].

---

[٢٨٧] چەندین بڕیار لە کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەرچوو کە ئیدانەی تیرۆری نێودەوڵەتی دەکەن و هانی وڵاتان دەدەن بۆ هاوکاریی، لەپێناو بنبڕکردن و سزادانی ئەنجامدەرانی. لەو بارەیەوە:

بڕیاری ١٠٢ خولی ٣١ کە لە ١٥ی کانونی یەکەمی ١٩٧٦دا دەرچوو.

بڕیاری ١٤٧ خولی ٣٢ کە لە ١٦ی کانونی یەکەمی ١٩٧٧دا دەرچوو.

بڕیاری ١٤٥ خولی ٤٣ کە لە ١٧ی کانونی یەکەمی ١٩٧٩دا دەرچوو.

بڕیاری ١٠٩ خولی ٣٦ کە لە ١٠ی کانونی یەکەمی ١٩٨١دا دەرچوو.

بڕیاری ١٣٠ خولی ٣٨ کە لە ١٩ی کانونی یەکەمی ١٩٨٣دا دەرچوو.

بڕیاری ١٥٩ خولی ٣٩ کە لە ١٧ی کانونی یەکەمی ١٩٨٤دا دەرچوو.

بڕیاری ٦١ خولی ٤٩ کە لە ٩ی کانونی یەکەمی ١٩٨٥دا دەرچوو.

بڕیاری ١٥٩ خولی ٤٢ کە لە ٧ی کانونی یەکەمی ١٩٨٧دا دەرچوو.

بڕیاری ٢٩ خولی ٤٤ کە لە ٤ی کانونی یەکەمی ١٩٨٩دا دەرچوو.

بڕیاری ٥١ خولی ٤٦ کە لە ٩ی کانونی یەکەمی ١٩٩١دا دەرچوو.

**هەوڵـەکانی نەتـەوە یـەکگرتووەکان، بـۆ بنـبڕکردنی تـیرۆری نێودەوڵـەتی، لەرێگەی کارەکانی لیژنەی شەشەم، لەخولە یەك لەدوایەکەکانی کۆمەڵەی گشتی:**

**یەکەم- خولی بیستو حەوتەم (١٩٧٢):**

لەهەشتی ئەیلولی ساڵی ١٩٧٢دا، سکرتێری گشـتی نەتـەوە یـەکگرتووەکان داوای کرد کە مەسەلەی (گرتنەبەری رێوشوێن، بۆ ئامانجی قەدەغەکردنی تیرۆرو شێوەکانی تری توندوتیژی کە ژیانی بێتاوانان رووبەرووی مەترسی دەکاتـەوە، یـان پێشـێلکردنی ئازادییـە بنەڕەتییـەکان) لەخشـتەی کارەکانیـاندا دابـنرێتو رەوانـەی لیژنـەی شەشـەم (یاسـایی) بکرێـت، بـۆ ئامـادەکردنی راپۆرتێـك لـەو بارەیـەوە[٢٨٨]. سـکرتێری گشـتی لەوتارەکـەیدا کـە لەبـەردەم لیژنـەی گشـتی کۆمەڵەی گشتی، لە ٢٠ی ئەیلولی ساڵی ١٩٧٢دا روونی کردەوە، کاتێك کە داوای دانانی ئەو مەسەلەیەی، لەخشتەی کارەکانی کۆمەڵە، لـەخولی بیستو حەوتـەمدا کرد، رووداوی کارە توندوتیژییە ئاراستەکراوەکانی دژی سـەرکردە نیشـتمانیو نـێردراوە دبلۆماسـییەکانو گەشـتیارانو دژی بـێ تـاوانی تـری رەچـاوکرد، ئـەو کردانەش بووە هۆی بڵاوبوونەوەیترسو دڵەڕاوکێ لەجیهاندا کە دەربازبوون لێی ئەستەمە[٢٨٩].

هـەروەها سـکرتێری گشـتی قەناعـەتی خـۆی دەربـڕی بـەوەی کێشـەی تـیرۆر کێشەیەکی زۆر ئاڵۆزەو، ژمارەیەك لە حکومەتەکان دووچاری ئەستەم بوونەتەوە، لـەدیاریکردنی هەڵوێستدا کە پێویستە بگیرێتەبـەر لـە رووبەرووبوەنـەوەیدا، هـەر لەبـەر ئـەوەش هەسـتیان کـرد کە ناچارن لەخشـتەی کارەکانی کۆمەڵـەی گشـتیدا داوای دانانی ئەو مەسەلەیە بکەن، بەتێڕوانینی ئەو نیگەرانیو دڵەڕاوکێ قوڵەی کە هـەمووان هەست بەمەترسیی ئەو دیاردەیـە دەکـەن، بـە تـێڕوانین لـەوەی کـە

---

[٢٨٨] بڕوانە: بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان ژمارە:

*A/87 and Add. 1 and Add. 1/Corr.1. Note of 8 SEPTEMBER 1972 by Secretary- General.*

[٢٨٩] بڕوانە: *UN Doc. A/8791/Add.1*

گۆڕەپانی ئەو چالاکییەو پاڵنەرەکانی، بەشێوەیەکی زۆر، مۆرکی نێودەوڵەتی بەدەست دەهێنێت و، لەبەرئەوەی کە پێشکەوتنی تەکنۆلۆژی، رەهەندێکی نوێی بەم دیاردە کۆنە بەخشی[٢٩٠].

لە ٢٣ی ئەیلولی سالی ١٩٧٢دا، دوای وتووێژی ئەو پێشنیارانەی کە جامایکاو عەرەبستانی سعودی[٢٩١]، پێشکەشیان کرد، راستکردنەوە لە دارشتنی مەسەلەکە کرا، بۆ ئەوەی بخرێتە نێو خشتەی کارەکان لەژێر بەندی (ئەو رێوشوێنانەی دەبنە هۆی قەدەغەکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی کە گیانی مرۆڤایەتی بێتاوان دەخاتە مەترسییەوە، یان لەناوی دەبات، یان هەڕەشە لەئازادییە بنەڕەتیەکان دەکات و، تاوتوێکردنی هۆکارە شاراوەکانی پشت شێوەکانی تیرۆرو کردەکانی توندوتیژی کە بەهۆی ناکامی و بێئومێدی و هەستکردنی بەبێ هیوابوون کەوا لە هەندێ کەس دەکات قوربانی بدەن بەگیانی مرۆڤەکان و گیانی خۆشییان، بەئومێدی ئەوەی گۆڕانکاری بنەڕەتی بخولقێنن[٢٩٢].

لەو وتووێژانەی کە لەخولی بیست و حەوتەمی کۆمەڵەی گشتیدا بەرێوەچوو، نوێنەرانی ٩٣ دەوڵەتی ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان لەوتەکانیاندا، ئاماژەیان بەبڵاوبونەوەی دیاردەی تیرۆری نێودەوڵەتی کرد. شاندە جیاوازەکان گوزارشتیان لە دڵەڕاوکێی دەوڵەتەکانیان کرد، بەرامبەر کردەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی کە بەشێوەیەکی بەرچاو، روو لە زیادبوونەو زیان بەگیانی بێتاوان دەگەیەنن، داوای هەوڵ و هاوکاریی کۆمەڵی نێودەوڵەتییان کرد، لەپێناوی گەیشتن بەرێگە چارە بۆ قەدەغەکردن و بنبڕکردنی کردەکانی تیرۆر، کە رووداوە خوێناوییەکانی خولی

---

[٢٩٠] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٢٩١] لەپێشنیارەکانی جامایکا، بڕوانە: *Doc. Of the G.A. A/L. 672*

لەپێشنیارەکانی عەرەبستانی سعودی، بڕوانە: *Doc. Of the G.A. A/L. 673*

[٢٩٢] بڕوانە:

*A/C. 6/418 and Corr. 1.2 and Add. 1. Study prepared by Secretariat in accordance with decision taken by Sixth Committe on 27 September 1972, meeting 1314.*

یارییەکانی ئۆڵۆمپیی میونخی ساڵی ١٩٧٢، لەلایەن هەندێ لەکەسانی سەر بە شۆڕشی فەلەستینی بوون بەهاندەری.

هەرچەندە سەرجەم نوێنەرانی دەوڵەتان تەبابوون، لەسەر ئیدانەکردنی تیرۆر، وەکو ئامرازێك لەئامرازەکانی توندوتیژیی سیاسی، کەچی لەو وتووێژانەدا، سەبارەت بە بیرۆکەی تیرۆرو ئامرازەکانی بنبڕکردنی، بە لەبەرچاوگرتنی جیاوازیی سیاسەتە نیشتمانییەکانی هەریەکێك لەو دەوڵەتانە، بۆچوونی جیاواز لەنێوانیاندا دەرکەوت.

دەکرێ وتووێژەکان بەسێ ئاراستەکردنی سەرەکیدا، بەم جۆرەی خوارەوە، چڕبکەینەوە[٢٩٣]:

١. بۆچوونێك کە بنبڕکردنی تیرۆرو سزادانی هەر جۆرێك لەجۆرەکانی بەکارهێنانی هێز، یان توندوتیژی بەشێوەی گشتی بەپێویست دەزانێتو، ئەم بۆچوونەش هەریەك لەولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو دەوڵەتانی ڕۆژئاوا ڕێبەرایەتی دەکەن.

٢. بۆچوونێك کە پشتگیریی ئیدانەکردنی کردە تیرۆرییەکان دەکاتو، بەپێویستی دەزانێت کە کۆتایی بەو هۆیانە بهێنن کە دەبنە هۆی بەکارهێنانی توندوتیژیو کردەکانی تیرۆرو، ولاتانی عەرەبیو دەوڵەتانی ئەفریقیاو ئاسیا ڕێبەرایەتی ئەم بۆچوونە دەکەن.

٣. بۆچوونی سێیەم جیاوازیی دەکات، لەنێوان توندوتیژی کە بەکار دەهێنرێت، وەکو ئامرازێك بۆ پراکتیزەکردنی مافی دیاریکردنی چارەنووسو ئازادبوون لە داگیرکەرو، کارەتاوانکارییەکانی تیرۆر کە دژی بێتاوان ئەنجام دەدرێت، یان کۆسپ دەخاتە بەردەم چالاکیی دبلۆماسی، یان کە نوێنەرانی دەوڵەت، یان ئەندامانی شاندە دبلۆماسییەکانو هۆیەکانی پەیوەندیی نێوانیان دەکەنە ئامانج، کە لە خزمەتی هیچ ئامانجێکی ڕەوادا نییە، بەڵکو زیانی

---

[٢٩٣] بڕوانە:

*A/C. 6/L. 867 and Corr. 2 Compilation of relevant Views expressed in Coures of general debated at General Assembly, Prepared by Secretariat.*

گیانیشی لێدەکەوێتەوە، ئەم بۆچوونەش یەکێتی سۆڤییەت و* بلۆکی رۆژهەلات سەرکردایەتی دەکەن.

لیژنەی شەشەم لە ٢٧ی ئەیلولی ساڵی ١٩٧٢دا، بڕیاری لێکۆڵینەوەیدا، لە مەسەلەی تیرۆر کە لەخشتەی کارەکانی کۆمەڵەدا دانرابوو، داوای لە سەرۆکەکەی کرد چەند راوێژێکی سەرەتایی، لەگەڵ شاندەکاندا ئەنجام بدات، بۆ زانینی چۆنیەتی تاوتوێکردنی ئەو مەسەلەیە، لەگەڵ پێشکەشکردنی راپۆرتێك، سەبارەت بەو راوێژکارییانە. هەروەها داوای لە سکرتاریەتی لیژنەکە کرد کە لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەل، سەبارەت بەکێشەی تیرۆرو بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بەسەرچاوەو و هۆکارە سەرەکییەکانیەوە هەیە ئەنجام بدات(٢٩٤).

لە ١٨ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٢دا، لەسەر راسپاردەی لیژنەی شەشەم، کۆمەڵەی گشتی بڕیارێکی، سەبارەت بە تیرۆر دەرکردو تیایدا دڵە راوکێی زۆری، بەرامبەر بە زیادبوونی کردەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی نیشان دا کە زیان بە گیانی بێ تاوانان دەگەیەنێت و، دانی نا بە پێویستیی هاوکاریی نێودەوڵەتی، بۆ گرتنەبەری رێوشوێنی کاریگەر، لە پێناوی قەدەغەکردنی ئەو کردانەداو، تاوتوێکردنی ئەو هۆیە شاراوانەی لە پشتییەوەن(٢٩٥). کۆمەڵەی گشتی، دەوڵەتانی ئەندامی راسپارد، لێکۆڵینەوە بکەن سەبارەت بە چارەسەری عادیلانەو دروست کە رێگە بە لابردن و نەهێشتنی هۆیەکانی کردەی توندو تیژیداو، جەختی لە مافی هەموو گەلان کردەوە کە دەکەونە ژێر دەسەڵاتی رژێمە داگیرکەرو

---

* بۆچوونی سێیەم، لەگەڵ هەرەسهێنانی جەمسەری رۆژهەلات و لەبەریەك هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤییەتدا، کۆتایی پێهات. (وەرگێڕ).

(٢٩٤) بڕوانە راپۆرتی لیژنەی شەشەم:

*A/ 8969. Report of sixth Committee; A/ C. 6/ L. 866 and corr. 1. Report of Chairman of Sixth Committee onhis Consultations With regard to question of internatonal terrorism, undertaken in pursuanee of decision taken by Committee on 27 September 1972.*

(٢٩٥)*Resolution 3034(XXVII), as recommended by sixth Committee, A/ 8969, and as amended by 14 powers A/L. 696.*

ڕەگەز پەرستییەکان، یان هەر شێوەیەکی تر لە شێوەکانی زاڵبوونی دەسەڵاتی بیانی، لە دیاریکردنی چارەنووس و سەربەخۆییدا، هەروەها جەختی لەسەر خەباتی ڕەوای ئەو بزووتنەوە ئازادیخوازە نیشتیمانییانە کردەوە، بە گوێرەی ئامانج و پرەنسیپەکانی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لەو بارەیەوە دەرچوون و کۆمەڵەکە ئیدانەی کارەکانی سەرکوتکردن و تیرۆری کرد، کە ڕژێمە ڕەگەزپەرستەکان و بیانییەکان، بۆبێ بەشکردنی گەلان لە مافی ڕەوای خۆیان، لە دیاریکردنی چارەنووس و، سەربەخۆیی و مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان پەنای بۆ دەبەن.

کۆمەڵە لە بڕیارەکەیدا داوای لە دەوڵەتانی ئەندام کرد کە بچنە ڕیزی ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکانەوە کە هەندێ لایەنی کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتی چارەسەر دەکات و، گرتنەبەری هەموو ڕێوشوێنێکی گونجاو، لەسەر ئاستی نیشتیمانی، بۆ دەسبەجێ کۆتایی هێنان بەو کێشەیە، لە بڕیارەکەدا داوای لە دەوڵەتانی ئەندام کرد پێشنیارو تێبینییە دیاریکراوەکان، سەبارەت بە چارەسەری ئەو کێشەیە پێشکەش بە سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بکەن، تا ۱۰ی نیسانی ساڵی ۱۹۷۳، هەروەها داوای کرد لێکۆڵنەوەیەکی شیکاری، دەربارەی ئەو تێبینیانەی کە لە دەوڵەتانەوە پێیان دەگات، ئامادەبکەن[٢٩٦].

هەروەها کۆمەڵەی گشتی بڕیاری پێکهێنانی لیژنەیەکی تایبەتی پەیوەندیدار بە تیرۆری نێودەوڵەتییەوەدا کە لە ٥٣ ئەندام پێک دێت و سەرۆکی کۆمەڵەی گشتی دەست نیشانیان دەکات، لەگەڵ ڕەچاوکردنی نوێنەرایەتی جوگرافیایی عادیلانەوە، بۆ تاوتوێکردنی ئەو تێبینییانەی وڵاتان پێشکەشی دەکەن، کە دواتر ڕاپۆرتی خۆی بەرز بکاتەوە، بۆ کۆمەڵەی گشتی، بەهاوپێچی ئەو ڕاسپاردانەوە

---

[٢٩٦] بۆ ئەو تێبینی و پێشنیارانەی وڵاتان پێشکەشیان کرد، بڕوانە:

*-UN General Assembly, A/ AC. 160/1, May 16, 1973, p. 34-37,44*

*-UN General Assembly, A/AC. 160/1/Add. 1, June 12,1973, pp.10,14,17,20,2,28*

کە زەمینە بۆ هاوکاریی نێودەوڵەتی خۆش دەکەن، لە پێناوی بنبڕکردنی خێرای کێشەکەدا.

**دووەم: خولی بیست و هەشتەم(١٩٧٣):**

لە دانیشتنی گشتی ٢١٣٢ کە لە ٢١ی ئەیلولی ١٩٧٣دا بەسترا، کۆمەڵەی گشتی لە خشتەی کارەکانی خولی بیست و هەشتەمیدا، بەندی ٩٤ی تایبەت بەو رێوشوێنانەی دەبنە هۆی قەدەغەکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی داناوو بڕیاردرا کە بدرێتە لیژنەی شەشەم، بۆ وتووێژکردن لەسەری و، لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەی بەندی ٩٤دا، لیژنەی شەشەم راپۆرتێکی لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار، بە تیرۆری نێودەوڵەتی خستەڕوو[٢٩٧]. لەبەر نەبوونی کاتی تەواو لیژنەی شەشەم، نەیتوانی بە تێرۆ تەسەلی باس لە مەسەلەی تیرۆری نێودەوڵەتی بکات و، لە ٧ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٣دا ئەو وتووێژە بۆ خولی بیست و نۆ دوابخرێت، بۆ ئەوەش راسپاردەیەکی بەرزکردەوە، بۆ کۆمەڵەی گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان[٢٩٨].

لە ١٢ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٣دا، بڕیاریدا کۆمەڵەی گشتی بە کۆی دەنگ رازی بوو، لەسەر داواکەی لیژنەی شەشەم، بە دواخستنی وتووێژی بەندی تیرۆری نێودەوڵەتی بۆخولی بیست و نۆهەم، هەروەها لەسەر داوای لیژنەی شەشەم، وتووێژی بەندی تیرۆری نێودەوڵەتی، لە هەردوو خولی بیست و نۆهەم و سێهەمدا دواخرا[٢٩٩].

---

[٢٩٧] بڕوانە:

*GAOR, 28th Session, Suppl. No. 28(A/9028), Report of Ad Hoc. Committee on International Terrorism, 1973*

[٢٩٨] بڕوانە: بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکانی ژمارە: *A/9410,/0 December, 1973:*

[٢٩٩] بڕوانە: بەڵگەنامە رسمییەکانی کۆمەڵەی گشتی، خولی ٢٩، بڕگەی ٩١، بەڵگەنامەی ژمارە (A/9947)، بڕگەی (٥).

**سێیەم: خولی سی و یەکەم(١٩٧٦):**

لە ١٥ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٦دا، لەسەر داوای لیژنەی شەشەم، کۆمەڵەی گشتی، سەبارەت بە تیرۆر بڕیارێکی وەرگرت، لە ژێر ناونیشانی(ئەو ڕێوشوێنانەی دەبنە هۆی قەدەغەکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی کە گیانی مرۆڤایەتی ڕووبەڕووی مەترسی دەکاتەوە، یان لە ناویان دەبات، یان هەڕەشە لە ئازادییە بنەڕەتییەکانیان دەکاتو، لێکۆڵینەوە لە هۆیە شاراوەکانی پشتی شێوەکانی تیرۆرو کردەکانی توندو تیژی کە لە نائومێدیو بێ هیوا بوونو هەست کردن بە ناکامی سەرهەڵدەداتو گەشەدەکات کە هەندێ کەس والێدەکات قوربانی بە گیانی مرۆڤایەتی بدەن، تەنانەت بە گیانی خۆشیان، بە مەبەستی ئەوەی گۆڕانی بنەڕەتی ئەنجام بدەن[٣٠٠].

لەو بڕیارەدا کۆمەڵەی گشتی نیگەرانیی زۆری خۆی، بەرامبەر بەزیادبوونی تیرۆری نێودەوڵەتی ڕاگەیاند، هانی دەوڵەتانیدا بۆ بەردەوامبوون لە لێکۆڵینەوە، بە مەبەستی چارەسەری گونجاوو دروست بۆ نەهێشتنی هۆیە شاراوەکانی پشتی کردەکانی توندو تیژییەوە. هەروەها کۆمەڵەکە سەر لە نوێ، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، نابێت دەست بخرێتە ناو مافی دیاریکردنی چارەنووسو سەربەخۆیی سەرجەم ئەو گەلانەی دەکەونە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمەوە داگیرکەرو ڕەگەزپەرستەکان، یان هەر شێوەیەکی دیکەی دەسەڵاتی بیانی بێتو، جەختی لەسەر خەباتی ڕەواکردەوە، بە تایبەتی خەباتی بزووتنەوە ئازادیخوازە نیشتیمانییەکان.

بە گوێرەی ئامانجو پرەنسیپەکانی بەڵگەنامەو ئەو بڕیارانەی پەیوەندییان بەو مەسەلەیەوە هەیەو، لە لیژنەکانی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە دەرچوون. بڕیارەکە ئیدانەی کردەکانی سەرکوتکردنو تیرۆری کرد کە ڕژێمە داگیرکەرو ڕەگەز

---

[٣٠٠] بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە٣١/١٢٠ کە لە دانیشتنی گشتی ژمارە ٩٩، لە ١٥ی کانونی یەکەمی ١٩٧٦دا دەرچووە، لەسەر داوای ڕاپۆرتی لیژنەی شەشەم(*A/31/429*)، بەپێی برگەی ژمارە ١١٣ لە خشتەی کاری کۆمەڵەی گشتی کۆمەڵەی گشتی بڕیارەکەی پەسەندکرد، بە پشتگیریی (١٠٠) دەوڵەتو سەرپێچی(٩) دەوڵەتو دەنگ نەدانی(٢٧) دەوڵەت.

پەرستو بیانییەکان پیادەی دەکەن، بۆ زەوتکردنی مافی رەوا، لە دیاریکردنی چارەنووس و سەربەخۆیی و مافەکانی و مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانی. بڕیارەکە داوای لە دەوڵەتان کرد بچنە ریزی ئەو رێکەوتننامە نێودەوڵەتییانەوە کە تایبەتن بە لایەنە جیاوازەکانی کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتی و، گرتنەبەری هەموو رێو شوێنێکی گونجاو، لەسەر ئاستی نشتیمانی، بۆ دەسبەجێ کۆتایی هێنان بەو کێشەیە. هەروەها بڕیارەکە داوای لە لیژنەی تایبەت، بە مەسەلەی تیرۆری نێودەوڵەتی کرد کە بەردەوام بێت لە کارەکانیدا، بە پێی ئەو دەسەڵاتەی، بە گوێرەی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ٣٠٣٤ {د- ٢٧} لە رۆژی ١٨ی دیسەمبەری ساڵی ١٩٧٢دا، پێی بەخشرابوو.

**چوارەم- خولی سی و دووهەم (١٩٧٧):**

لیژنەی شەشەم، لە ماوەی ٢٥ بۆ ٣٠ تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٧دا، دەربارەی بەندی پەیوەندیدار بە تیرۆری نێودەوڵەتییەوە وتووێژی کرد. لیژنەکە پرۆژەی بڕیارێکی سەبارەت بە تیرۆر پێشنیازکردو رەزامەندی لەسەر نیشاندراو خرایە بەردەم کۆمەڵەی گشتی، بۆ بڕیاردان لەسەری[٣٠١]. و کۆمەڵەی گشتی بڕیارەکەی پەسندکردو تیایدا نیگەرانی و دڵەڕاوکێ قووڵی، لەبەرامبەر زیادبوونی کردەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی راگەیاندو، هانی دەوڵەتانی دا بۆ بەردەوامبوون لەسەر لێکۆڵینەوە بۆ گەیشتن بە چارەسەری گونجاو و دروست، لە پێناوی نەهێشتنی هۆیە شاراوەکانی پشتی کردەکانی توندوتیژی. کۆمەڵەکە داوای لە لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار، بە مەسەلەی تیرۆرەوە کرد، بۆ بەردەوامبوون لە کارەکانی لێکۆڵینەوەی هۆیەکانی تیرۆرو رێوشوێن و پراکتیکی هەوڵی بنبڕکردنی بدرێت. هەروەها کۆمەڵەکە بڕیاریدا، بەندی تایبەت بە تیرۆری لە خشتەی کاتیی کارەکانی خولی سی و چوارەمدا دابنێت[٣٠٢].

---

[٣٠١] بڕوانە: *A/C.6/32/L. 13*

[٣٠٢] بڕیاری ژمارە ٣٢/ ١٤٧ی کۆمەڵەی گشتی، کە لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٧دا دەرچوو.

**پێنجەم- خولی سی و چوارەم (١٩٧٩):**

لیژنەی شەشەم، لە ماوەی نێوان ٢٦ی ئەیلول، بۆ ٤ی تشرینی یەکەمو، لە ٣و ٤ی ئەیلولی ساڵی١٩٧٩ دا چاوی بەبەندی تایبەت بە تیرۆردا خشاند[٣٠٣]. لە دانیشتنی ٥٩ کە لە ٤ی ئەیلولی ساڵی ١٩٧٩دا بەسترا، لیژنەی شەشەم پڕۆژەی بڕیارێکیان پەسەندکرد کە تیایدا، بە تەواوی ئیدانەی سەرجەم کردەکانی تیرۆری نێودەوڵەتییان کرد کە ژیانی مرۆڤایەتی رووبەڕووی مەترسی دەکاتەوە، یان لەناویان دەبات، یان هەڕەشە لە ئازادییە بنەڕەتییەکانیان دەکاتو، ئیدانەی بەردەوامبوونی کردەکانی سەرکوتکردنو تیرۆی کرد کە رژێمە داگیرکەرو رەگەزپەرستو بیانییەکان ئەنجامی دەدەنو، مافی رەوای گەلان، لە دیاریکرردنی چارەنووسو سەربەخۆییو مافەکانی تری مرۆڤو ئازادییە بنەڕەتییەکان زەوت دەکەن. هەروەها بڕیارەکە داوای لە دەوڵەتان کرد، بچنە ریزی رێکەوتننامە نێودەوڵەتییە پەیوەندیدارەکان، بە قەڵاچۆکردنی لایەنە جیاوازەکانی دیاردەی تیرۆری نێودەوڵەتیو داوای لە حکومەتەکان کرد کە تێبینیو پێشنیارە دیاریکراوەکانی خۆیان پێش کەش بکەن، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە پێویستی بە ستنی رێکەوتننامەکە، یان رێکەوتننامە نێودەوڵەتییە سەربارەکان، دەربارەی تیرۆری نێودەوڵەتییەوە، هەیە. بڕیارەکە سەرجەم دەوڵەتانی هان دا، بۆ هاوکاریکردنی پتەوتری یەکتری، بەتایبەتی لە رێگەی ئاڵوگۆڕکردنی زانیارییەکان، بۆ قەدەغەکردنو بنبڕکردنی تیرۆری نێودەوڵەتیو، بەستنی پەیماننامە تایبەتەکان، یان دانانی پەیماننامەی دوو قۆڵی کە دەوڵەتان لە نێوان خۆیاندا، بڕیاری لەسەر دەدەن بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بەبەستەوەدانو دادگایکردنی تیرۆریستانی نێودەوڵەتییەوە هەیە. هەروەها بڕیارەکە، لە پێناو هاوبەشیکردن، بۆ کۆتایی هێنان بە هۆیە شاراوەکانی پشت دیاردەی تیرۆری نێودەوڵەتییەوە، داوای لە کۆمەڵەی گشتیو ئەنجومەنی ئاسایش کرد، بایەخی تایبەتی بەسەرجەم حاڵەتەکان بدەن، بە شێوەیەکی گشتی، داگیرکەرانو رەگەزپەرستو داگیرکەری بیانی، کە هانی تیرۆری نێودەوڵەتی دەدەنو ئاشتیو

---

[٣٠٣] سەبارەت بە لێکستە چڕەکانی ئەو دانیشتنانە، بڕوانە: *A/C.6/34/ SR.4, 6,10,57,59.*

ئاسایشی نێودەوڵەتی رووبەڕووی مەترسی دەکەنەوە، ئەوەش بە مەبەستی جێبەجێکردنی ئەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە برگەکانی بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە هەیە، بە بەشی حەوتەمیشەوە. هەروەها بڕیارەکە داوایەکی سکرتێری گشتی لەخۆگرتووە، بۆ ئامادەکردنی راپۆرتێکی تێروتەسەل، لەوەی کە یاسادانانی نشتمانی لە برگەکانی کە پەیوەندییان بە قەلاچۆکردنی تیرۆری نێودەوڵەتییەوە هەیە، لەسەر بنەمای ئەو پرۆژە جیاوازانەی کە لەلایەن دەوڵەتانی ئەندامەوە پێشکەش بە لیژنەکە دەکرێتو، هەروەها بە پێی پێویستی چاودێریی جێبەجێکردنی ئەو راسپاردانە، بکات کە لە راپۆرتی لیژنەی تایبەت، بە تیرۆری نێودەوڵەتیدا هاتووەو، بەوەی کە راپۆرتەکەی، لە خولی سیو شەشەمدا پێشکەش بە کۆمەڵەی گشتی بکات.

کۆمەڵەی گشتی پێشوازیی لەو ئەنجامانە کرد کە لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار بە تیرۆری نێودەوڵەتی، لە خولی ساڵی ١٩٧٩دا[٣٠٤] بە دەستی هێناو ئەو راسپاردانەی پەسەندکرد کە لیژنەی شەشەم، دەربارەی رێوشوێنی پراکتیکی، بۆ هاوکاریکردن لە پێناوی کۆتایی هێنانی دەسبەجێ بەسەر کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتی پێشکەشی کرابوونو، پرۆژەی بڕیاری ئاماژەپێکراوی سەرەوەی پەسەندکردو بە بڕیاری ژمارە ١٤٥/٣٤ [٣٠٥]دەرچوو.

**شەشەم: خولی سیو شەشەم(١٩٨١):**

کۆمەڵەی گشتی لە راپۆرتی سکرتێری گشتی[٣٠٦] ئاگادارکرایەوەو، سەر لە نوێ پشتگیریی لەو راسپاردانە کرد کە لە لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار بە تیرۆری

---

[٣٠٤] لە راپۆرتی لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار بەتیرۆر، بڕوانە:

*GAOR, 34th Session, Suppl. No. 37(A/34/37). Report of Ad Hoc committee on International Terrorism, 1979.*

[٣٠٥] بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ٣٤/ ١٤٥، کە لە ١٧ی کانونی یەکەمی ١٩٧٩دا دەرچوو. ئەم بڕیارە بەرەزامەندی ١١٨ دەوڵەتو دەنگ نەدانی ٢ دەوڵەت پەسەندکرا.

[٣٠٦] راوێژکاری یاسایی نەتەوەیەکگرتووەکان، راپۆرتی سکرتێری گشتی پێشکەش کرد بە لیژنەی شەشەم لە دانیشتنی ٦٣دا کە لە ١ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٦دا بەسترا.

نێودەوڵـەتی پێشکەشـی کۆمەڵـەی گشـتی کردبـوو، سـەبارەت بەڕێوشـوێنی پراکتیکی بۆ هاوکاریکردن، لە پێناو کۆتایی هێنانی دەسبەجێی کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتی. کۆمەڵەی گشتی بڕیـارێکی پەسـەندکردو تیـایدا داوای لەسـەرجەم دەوڵەتان کـرد ئـەو ڕاسـپاردانەی لیژنـەی تایبـەتی پێشکەشـی کـردوە، ڕەچـاوو جێبـەجێ بکرێـت و، داوای لـە سـکرتێری گشـتی کـرد کـە بـەدوادا چوونـی جێبەجێکاریـەکانی ئـەو ڕاسـپاردانە بکـات و لـە خـولی سـی و هەشـتەمدا[٣٠٧] ڕاپۆرتێك پێشکەش بە کۆمەڵەی گشتی بکات.

**حەوتەم- خولی سی و هەشتەم(١٩٨٣):**

کۆمەڵەی گشتی ئاگادارکرایەوە، لەڕاپۆرتی سکرتێری گشتی و[٣٠٨]، سەر لە نوێ پشتگیریی لەو ڕاسپاردانەکرد کە پێشکەش بـە کۆمەڵـەی گشـتی کرابـووو تایبەت بوو بە گرتنەبەری ڕێوشوێنی پرۆسـەی هاوکاریکردن، لـە پێنـاو کۆتـایی هێنـانی دەسبەجێی کێشـەی تـیرۆری نێودەوڵـەتی. و کۆمەڵـەی گشـتی بڕیـارێکی دەرکردو تیایدا، داوای لە سەرجەم وڵاتان کرد، ڕەچاوی ئەو ڕاسپاردانە بکەن کە لیژنـەی تایبـەتی پـەیوەندیدار بە تـیرۆری نێودەوڵـەتی پێشکەشـی کـردووەو جـێ بەجێشـی بکـات و، داوای لـە سـکرتێری گشـتی کـرد کـە بـە گوێـرەی پێویسـت، ڕەچاوی جێبەجێکردنی ئەو ڕاسپاردانە بکات و لە خولی داهاتووشدا، ڕاپۆرتێك

---

. بڕوانە: A/36/425 و، لیژنەی شەشەم لە دانیشتنی ٦٢-٧٠ کە لە ماوەی ١-٤ی کانوونی یەکەم بەسترا، بڕگەی تایبەت بە تیرۆری تاوتوێکرد. سەبارەت بە لێکستە چڕەکانی ئەم دانیشتنانە، بڕوانە:
*A/c, 6/36/ sR. 63-70.*

[٣٠٧] بڕیـاری کۆمەڵـەی گشـتی ژمـارە ٣٦/١٠٩ی ١٠ی کـانونی یەکـەمی ١٩٨١، کـە بـە کـۆی دەنـگ پەسـەندکراو، لیژنـەی شەشـەم پـرۆژەی ئـەم بڕیـارەی، لە دانیشـتنی ٧٠دا پەسـەندکرد کە لـە ٤ی کـانونی یەکـەمی ١٩٨١ بـە کـۆی دەنـگ بڕیـاری لەسـەردراو، لەگـەڵ ڕاسـپاردەیەك بـۆ پەسـەندکردنی، ڕەوانـەی کۆمەڵەی گشتی کرا. بڕوانە : *A/C.6/36/L.30/rev. 1*

[٣٠٨] سەبارەت بە بڕیاری سکرتێری گشتی. بڕوانە: *A/38/355, ABB. 1/3*

پێشکەش بە کۆمەڵی گشتی بکات، لەگەڵ دانانی ئەو بڕگەیەدا، لە خشتەی کاری کاتی لە چلەمین خولی کۆمەڵەکەدا[٣٠٩].

**هەشتەم- خولی سی و نۆیەم(١٩٨٤):**

لە خولی سی و نۆیەمدا کۆمەڵەی گشتی، لایەنێکی دیکەی لە لایەنەکانی تیرۆریی نێودەوڵەتی لە خۆگرت کە ئەویش تیرۆری دەوڵەت بوو. لە لیژنەی یەکەمدا، جێگری یەکەمی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و وەزیری دەرەوەی یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستەکانی سۆڤییەت کە، داوای کرد کە بڕگەیەکی تەواوکاری، بەناونیشانی(مۆڵەت نەدان بە سیاسەتی تیرۆر، یان هەر کارێکی دیکە کە لە دەوڵەتەوە دەردەچێت، بەمەبەستی تێکدان و لەبەر یەك هەڵوەشاندنەوەی سستمی کۆمەلاّیەتی- سیاسی دەوڵەتانی دیکەی سەربەخۆ، دابنرێت لە خشتەی کارەکانی خولی سی و نۆیەمی کۆمەڵەی گشتی[٣١٠] (٢٧)دا، کە لە ٩ی تشرینی یکەمی ساڵی ١٩٨٤دا، بەسترا کۆمەڵەکە بڕیاری دانانی ئەو بڕگەیەی دا کە لە خشتەی کارەکانیانداو درا بە لیژنەی یەکەم. لیژنەی یەکەم لە دانیشتنی(٦٢/٥٧)دا، کە لە ماوەی ٤-٧ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٤ بەسترا[٣١١]، ئەو بڕگەیەی تاوتوێکردو لیژنەکە چەندین پرۆژە بڕیارێکی خستەڕووو پاشان لە یەکدراو گشتێندرا لە یەك دەقداو، لیژنەکە لە دانیشتنی ٦٢ کە لە ٧ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٤دا، بەسترا بڕیاری لێدراو، لەگەڵ راسپاردەکاندا رەوانەی لیژنەی گشتی کرا، بۆ بڕیار لێدانی. و کۆمەڵەی گشتی لە

---

[٣٠٩] بڕوانە: بڕیاری ژمارە ٣٨/ ١٣٠ی ١٩ی کانونی یەکەمی ١٩٨٣ی کۆمەڵەی گشتی. ئەم بڕیارەش بەبێ دەنگدان پەسەندکرا.

[٣١٠] نامەی ٢٧ی ئەیلولی ١٩٨٤ کە ئاراستەی سکرتێری گشتی کرا. بڕوانە. *A/39/44.*

[٣١١] بڕوانە: *A/c.i/39/pv. 57-62*

١٧ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٤[٣١٢]، بڕیاری لەسەر پرۆژەکەداو بوو بە بڕیاری ١٥٩/٣٩ی ١٧ی کانونی یەکەمی ١٩٨٤[٣١٣].

کۆمەڵەی گشتی لە بڕیارەکەیدا، نیگەرانیو بێزاریی زۆربەی خۆی دەربڕی، چونکە پەیڕەوی کردنی سیاسەتی تیرۆر کە لە دەوڵەتەوە دەردەچێت، تادێت لە پەیوەندیی نێودەوڵەتاندا، روو لە زیادبوونە، هەر وەك ئەوەی کە کردەی سەربازیو کردەکانی تری دژی سەروەرییو دەوڵەتانو سەرەبخۆیی سیاسییان دژی دیاریکردنی چارەنووسی گەلان ئەنجام دەدرێتو، کۆمەڵەکە جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە نابێت دەست بخرێتە کاروباری ئەو گەلانەی هەوڵی دیاریکردنی چارەنووسی خۆیانو دەست نیشانکردنی رێگەکانی برەودان بە ئازادی دەدەن. و بە تەواوی ئیدانەی سیاسەتو پیادەکردنی تیرۆری، لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان دەوڵەتان کرد، وەکو ئاکارێك بۆ مامەڵکردن لەگەڵ دەوڵەتانو گەلانی تردا.

**نۆیەم- خولی چلەمین (١٩٨٥):**

لیژنەی شەشەم لە دانیشتنی هەژدەهەمدا، کە لە ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٥[٣١٤] بەسترا، وتووێژی لەسەر بڕگەی تایبەتی بە تیرۆری نێودەوڵەتییەوە کرد. و وتووێژەکان بەخستنەڕووی راپۆرتێکی سکرتێری گشتی دەستی پێکرد،

---

[٣١٢] دووەم پرۆژەی پوختەکراو کە لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە پێشکەشکرا، لە دانیشتنی ٦١ کە لە کانونی یەکەمی ١٩٨٤ بەسترا، بڕوانە : A/c./39/L.2 /Rev. 2.

[٣١٣] کۆمەڵە ئەم بڕیارەی لە دانیشتنی گشتیی ١٠٢دا، بە دەنگدان پەسەندکرد، بەزۆرینەی ١١٧دەنگ لەبەرامبەر ٣٠ دەوڵەت کە دەنگیان نەدا.

[٣١٤] وتووێژەکانی لیژنەی شەشەم لەسەر بڕگەی تیرۆر هاوکات بوو، لەگەڵ وتووێژی کۆمەڵەی گشتی ئەنجومەنی ئاسایش، سەبارەت بە دەست درێژی ئیسرائیل بۆ سەر بارەگای رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستین لە تونسو، رفاندنی کەشتیی ئیتاڵی(ئەشیل لۆرۆ) و رێگەگرتن بە فڕۆکەی میسری، لەلایەن فڕۆکەکانی ئەمریکاوە کە رفێنەرانی فڕۆکەکەی هەڵگرتبوو، ئەویش وایکرد کە گفتوگۆکانی لیژنەی شەشەم لەسەر ئەم بڕگەیە ببێت بە کوڕێکی سیاسی، بۆ ئیدانەکردنی ئەم کردانەو بە کاری تیرۆر دابنرێتو نوێنەرانی وڵاتانی ئەندام یەکتر تاوانبار بکەن.

بەوەی کە بەڵگەنامەی سەرەکییە لەو بڕگەیەدا[٣١٥]. راپۆرتەکەی سکرتێری گشتی چەندین نامەی حکومەتەکانی لەخۆگرتبوو[٣١٦]. و هەروەها ئەو نامانەی کە لە رێکخراوە حکومییە نێودەوڵەتیەکانیشەوە، پێشکەش بە کۆمەڵەی گشتی کرابوو[٣١٧].

هەروەها راپۆرتەکە رێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکانی پەیوەندیدار بە لایەنە جیاوازەکانی کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتی و هەڵوێستی دەوڵەتان، لە پەسەندکردنیان یان چوونە ریزی، تا پێنجی ئابی ١٩٨٥[٣١٨] لەخۆگرتبوو دەتوانرێت ئەو بۆچوونانەی کە لە وتووێژە گشتییەکانی بڕگەی تیرۆردا هاتووە، بەم شێوەیە کورت بکرێتەوە:-

١-سەرجەم شاندەکان، بەرامبەر بەزیادبوونی کردەکانی تیرۆر، لەم ساڵانەی دواییدا، نیگەرانی زۆریان دەرببڕی، تیرۆریان بە کارێکی مەترسیدار دانا کە هەڕشە لە ئاشتی و ئاسایشی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەکات.

٢-شاندەکان داوایان لە دەوڵەتان و حکومەتەکان کرد کە بچنە ریزی رێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکانی پەیوەندیدار، بە بنبڕکردنی تیرۆرو هەر رێکەوتنامەیەکی نێودەوڵەتی کە پەیوەندیی پێوە هەیەو پابەندبن بە بڕگەکانیانەوە.

---

[٣١٥] سەبارەت بە راپۆرتی سکرتێری گشتی ، بڕوانە: *A/90/995 and Add. 1,2*

[٣١٦] سەبارەت بەو نامانەی گەیشتنە دەستی سکرتێری گشتی لەلایەن وڵاتانی ئەندامەوە، بڕوانە: *A/40/603- s/17438; A/40/339-s/17293; A/40/474; A/40/269*

[٣١٧] ئەم رێکخراوانە بریتین لە: ئاژانسی نێودەوڵەتیی وزەی ئەتۆم(IAEA)، رێکخراوی فڕکەوانیی مەدەنی(ICAO)، یەکێتی پۆستی جیهانی(upu)، رێکخراوی وڵاتانی ئەمریکا (OAS)و، ئەنجومەنی ئەورووپا.

[٣١٨] پێویستە ئاماژە بەوە بکەین لە ١٨ی کانونی یەکەمی ١٩٨٥دا، ئەنجومەنی ئاسایش، بە کۆی دەنگ بڕیاری ژمارە ٥٧٩ی دەرکرد، سەبارەت بە ئیدانەکردنی هەموو کردەکانی بە بارمتەگرتن و داوای بەردانی خێرای هەموو بە بارمتە گیراوە دەست بەسەرکراوو رفێنراوەکانی کرد. بڕوانە:
*S/17/686,/8 December 1985; Y. U. N., 1985, p. 1170.*

٣-ئیدانەی تیرۆری دەوڵەتی کردو بە توندترین شێوەکانی تیرۆری مەترسی دار، لەسەر ئاسایش و ئاشتی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی داناو داوای گرتنەبەری رێوشوێنی بەرپەچدانەوەی دژی ئەو دەوڵەتانە کرد کە تیرۆر دەکەن و هاوکاری و پشتگیریی دەکەن.

٤-زۆربەی شاندەکان لە بەیاننامەکانیدا، جەختیان لەسەر پێویستی لێکۆڵینەوەی هۆیە شاراوەکانی پشتی کردەکانی تیرۆرو توندوتیژی جەختیان لەسەر زانینی هۆیەکان کردو کە چارەسەرکردنیشی باشترین رێگەی نموونەییە بۆ کۆتایی هێنان بە تیرۆر.

٥-جەختی لەسەر پێویستی جیاکردنەوەی کارە تیرۆرییەکان لە خەباتی چەکداریی بزووتنەوە ئازادیخوازە نیشتمانییەکان، لە پێناو رزگارکردنی خاکە داگیرکراوەکەو پراکتیزەکردنی مافی دیاریکردنی چارەنووسدا.

٦-عیراق پێشنیازی دارشتنی پرەنسیپی یاسایی تایبەتی بە مەسەلەی تیرۆری نێودەوڵەتی کرد، لە چوارچێوەی سیاسیی پەسەندکراو لەلایەن سەرجەم لایەنەکانەوە، زۆربەی دەوڵەتانی عەرەبی پشتگیریی ئەو پێشنیازەیان کرد.

٧-هەندێ لە شاندەکان داوای ئیمزاکردنی رێکەوتننامەکانیان کرد، بۆ پاراستنی ئاسایشی کەشتیوانی، بەتایبەت وتووێژکردن لەسەر ئەم بەندە، دوای ئەو هەڵمەتە هات کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دژی رفێنەرانی کەشتی ئەشیل لۆرۆی ئیتاڵی ئەنجامیدا.

٨-جەخت لەسەر گەیشتن بە پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ تیرۆری نێودەوڵەتی و دیاریکردنی چوارچێوەکەی، بەرەچاوکردنی جیاوازیی یاسا نیشتیمانییەکانی نێوان دەوڵەتان کرا.

هەریەك لە کوباو کۆڵمبیاو ژمارەیەك لە دەوڵەتانی رۆژئاوا، چەند پرۆژە بریارێکیان پێشکەش بە لیژنەی شەشەم کرد، کە هەر سێ پرۆژەکە لە یەکدران و

پێشکەش بە سەرۆکی لیژنەی شەشەم کرا[٣١٩]. لە دانیشتنی(٥٥)مدا کە لە ٦ی کانونی یەکەمی ١٩٨٥دا بەسترا، کە دوا دانیشتنی لیژنەکە بوو، بڕیار لەسەر پرۆژەی بڕیارەکە درابوو، لەگەڵ راسپاردەی رەوانە کردنی، بۆ کۆمەڵەی گشتی بۆ بڕیاردان لەسەری، کۆمەڵەی گشتی بەبێ دەنگ دان، لە رۆژی دووشەممە رێکەوتی ٨ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٥ بڕیاری لەسەردرا[٣٢٠].

کۆمەڵەی گشتی لە بڕیارەکەیدا، ئیدانەی سەرجەم کردەکانی تیرۆری کرد، بەوەی کە کاری تاوانبارییە، لەهەر شوێنێکو لەلایەن هەر کەسێکەوە ئەنجام بدرێت، بەوەشەوە کە هەڕەشە لە پەیوەندیی دۆستانەی نێوان دەوڵەت دەکاتو زیان بە ئاسایشی دەگەیەنێ. کۆمەڵەکە داوای لەسەرجەم دەوڵەتان کرد کە لەسەر ئاستی نیشتمانی، رێوشوێنی گونجاو بگرنەبەر، لە پێناو دەستبەجێ کۆتایی هێنان بە کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتی، بەراستکردنەوەی بنەما یاسا ناوخۆییەکانی دەوڵەتانیشەوە، تا لەگەڵ رێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکاندا یەکانگیربن، پابەند بن بە بڕیارە نێودەوڵەتییەکانو ئامادەکردنو رێکخستنی هەر کردەیەکی لەو جۆرە لەسەر خاکەکەیان قەدەغە بکەن کە بە مەبەستی ئاراستەکردن، لە دژی هەر دەوڵەتێکی تر ئەنجامبدرێت. هەروەها کۆمەڵەی گشتی لە بڕیارەکەیدا، هانی سەرجەم دەوڵەتانیدا، هاوکاریی تەواوی یەکتربکەن، بەتایبەتی لەرێگەی ئاڵوگۆڕکردنی ئەو زانیارییانەی پەیوەندییان بە قەدەغەکردنو بنبڕکردنی تیرۆرەوە هەیەو، گرتنو دادگایکردن، یان بەدەستەوەدانی ئەنجامدەرانی ئەو کردانە، ئیمزاکردنی پەیماننامە تایبەتییەکان یان تێهەڵکێش کردنی بڕگەی تایبەت، لەناو پەیماننامە دوو قۆڵییە پەیوەندیدارەکان، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە بەدەستەوەدانو دادگایکردنی

---

[٣١٩] بڕوانە: *A/C. 6/40/L. 31* دەنگدان ئەنجامدرا لەسەر پرۆژەی بڕیارەکە لە لیژنەی شەشەمداو، ١١٨ دەوڵەت دەنگیان بۆ داو تەنیا کوبا سەرپێچی لە بڕیارەکە کردو دوو دەوڵەتیش دەنگیان بە بڕیارەکە نەدا.

[٣٢٠] بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە ٤٠/٦١ کە لە کانونی یەکەمی ١٩٨٥دا دەرچووو، ئەم بڕیارەش بەبێ دەنگ پەسەندکرا.

تیرۆریستانەوە هەیە، بڕیارەکە هانی سەرجەم دەوڵەتان- بەتاک‌و بە کۆ- و هەروەها دەزگا پەیوەندیدارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانی بەم کێشەیەوەدا، بۆ وردە وردە هاوبەشیکردن، بۆ کۆتایی هێنان بە هۆیە شاراوەکانی پشت تیرۆری نێودەوڵەتی، ئەویش بە بایەخدانی تایبەتی بە سەرجەم حاڵەتەکان، بە داگیرکەرو رەگەزپەرستی‌و حاڵەتەکانی تری پێشێل کردنی مافەکانی مرۆڤ‌و ئازادییە بنەڕەتییەکان‌و، ئەو حاڵەتانەشی کە داگیرکەری بیانی دەستی تێدا هەیە کە رەنگە تیرۆری نێودەوڵەتی لێبکەوێتەوەو ئاشتی‌و ئارامی نێودەوڵەتی رووبەڕووی مەترسی بکاتەوە. کۆمەڵەکە داوای لەسەرجەم دەوڵەتان کرد، رەچاوی راسپاردەکانی لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار بە تیرۆری نێودەوڵەتی بکەن‌و جێبەجێشی بکەن، کە لە خولی سی‌و چوارەمدا، گەیەنرابووە کۆمەڵەکەو، داوای لەسەرجەم دەوڵەتان کرد، رێوشوێنی گونجاو بگرنەبەر، کە رێکخراوی فرینی مەدەنی نێودەوڵەتی رایسپاردبوو، کە لە رێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکاندا هاتووە لەو بارەیەوە، بۆ قەدەغەکردنی هێرشە تیرۆرییەکان دژی گواستنەوەی ئاسمانی مەدەنی‌و سەرجەم شێوەکانی گواستنەوەی گشتی. هەروەها کۆمەڵەکە داوای لە رێکخراوی دەریایی نێودەوڵەتی کرد، لێکۆڵینەوە لە کێشەی تیرۆر، لەسەر کەشتی یان دژی بە ئەنجام بگەیەنرێت‌و، داوای گرتنەبەری راسپاردەکانی رێوشوێنی گونجاوی کرد. و هەروەها کۆمەڵەکە داوای لە سکرتێری گشتی کرد، بە گوێرەی پێویست چاودێریی جێبەجێ کردنی راسپاردەکانی بکات کە لە بڕیارەکەدا هاتووەو، لە خولی چل‌و دووەمیندا، لە راپۆرتێکدا پێشکەش بە کۆمەڵەی بکەن.

**دەیەم- خولی چل‌و دووەمین(١٩٨٧):**

دانانی بڕگەیەك بە ناونیشانی(ئەو رێوشوێنانەی دەبنە هۆی قەدەغەکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی کە ژیانی مرۆڤایەتی رووبەڕووی مەترسی دەکاتەوە، یان لە ناوی دەبات، یان هەڕەشە لە ئازادییە بنەڕەتییەکانی دەکات‌و، لێکۆڵینەوە لە هۆیە شاراوەکانی پشت شێوەکانی تیرۆرو کارە توندوتیژییەکانی بکرێت کە لە ئەنجامی نا ئومێد بوون‌و هەستکردن بە ناکامی سەرهەڵدەدات، کە هەندێ کەس

والیدەکات قوربانی بە ژیانی مۆڤایەتی بدەن، تەنانەت بە گیانی خۆشیان، کە بەو شێوەیە هەوڵی ڕوودانی گۆڕانکاریی بنەڕەتی دەدەن، لە خشتەی کارەکاتیەکانی خولی چل‌و دووەمینی کۆمەڵەی گشتی بە پێی برگەی ١٥ی ژمارە ٤٠/٦١ لە بڕیاری کۆمەڵەکە لە ٩ی دیسەمبەری ساڵی ١٩٨٥ [٣٢١].

نێردراوی کۆماری عەرەبی سوریا داوای کرد، لە چوارچێوەی برگەی ئاماژە پێکراودا، لە خشتەی کارە کاتییەکاندا، بڕگەی تەواوکاری بە ناونیشانی(بەستنی کۆنگرەیەکی، نێودەوڵەتی، لە ژێر سەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، بۆ دیاریکردنی تیرۆرو جیاکردنەوەی خەباتی گەلان، لە پێناوی ڕزگارکردنی تیرۆرو جیاکردنەوەی خەباتی گەلان، لە پێناوی ڕزگارکردنی نیشتمانیدا) [٣٢٢].
نووسینگەی سکرتێری گشتی لە دانیشتنی سێیەمیدا کە لە ١٧ی ئەیلولی ١٩٨٧دا بەسترا، بڕیاری دانانی بڕگەی تەواوکاری پێشنیارکراوی داو بە لقی(ب) لە بڕگەی بنەڕەتیی دانا، کۆمەڵەی ڕاسپارد تاوەکو کۆمەڵە ئەو بەندە دوای ڕاستکردنەوەکە لە خشتەی کارەکانیدا دابنێت، لەسەر ڕاسپاردنی نووسینگە، کۆمەڵەی گشتی لە دانیشتنی گشتی(٣) یەمدا کە لە ١٨ی ئەیلولی ١٩٨٧ بڕیاری‌دا لە خشتەی کارەکانیدا، بڕگەی بنەڕەتی، لەگەڵ بڕگە لاوەکیەکاندا، بەم شێوەیە دابنێت:

أ-ڕاپۆرتی سکرتێری گشتی

---

[٣٢١] لە نامەی ١١ی ئەیلولی ١٩٨٧دا کە ئاراستەی سکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان کرابوو، نوێنەری هەمیشەیی کوێت لە نەتەوەیەکگرتووەکان، ڕاپۆرتێکی هاوپێچ کرد سەبارەت بە خولی توێژینەوەی نێودەوڵەتی تایبەت بە دیاردەی تیرۆر لە جیهانی سەردەمداو کاردانەوەی لەسەر ئاسایشی تاک‌و سەقامگیربوونی سیاسی‌و ئاشتی نێودەوڵەتی، کە لە جنێف لە ماوەی ٢٢-٢٥ی کانونی دووەمی ١٩٨٧دا بەسترا، لە ژێر چاودێریی ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی، ونوێنەری هەمیشەیی دەوڵەتی کوێت داوای کرد نامەو پاشکۆکەی دابەش بکرێت، بەوەی کە یەکێکە لە بەڵگەنامەکانی کۆمەڵەی گشتی لە چوارچێوەی برگەی ١٢٨ی خشتەی کارە کاتییەکان. سەبارەت بە دەقی ڕاپۆرتەکە، بڕوانە: *A/42/564,/6 September 1987.*

[٣٢٢] بڕوانە: *A/42/193*. و یەمەنی دیموکراتی‌و جەزائیرو کوێت(بە نوێنەرایەتی وڵاتانی عەرەبەوە) ئەو پێشنیارەیان پەسەندکرد. بڕوانە: *A/42/193/ Add. 1-3*

ب-بەستنی کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی، لەژێر سەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، بۆ دیاریکردنی تیرۆرو جیاکردنەوەی لەگەڵ خەباتی گەلان، لە پێناوی رزگارکردنی نیشتمانیدا.

کۆمەڵەی گشتی بڕیاریدا بڕگەی تایبەتی بە تیرۆر، وەکو لە پێشەوە پێشنیار کراوە، رەوانە بکرێت بۆ لیژنەی شەشەم، بەمەرجێ یەکەمجار بڕگەی لاوەکی(ب) لە دانیشتنی گشتیدا بخرێتە روو، بەرلەوەی لیژنەی چاوی پیدابخشێنێت[٣٢٣].

ئەوەشی کە پەیوەندیی بە بڕگەی سەرەکییەوە هەیە، راپۆرتی سکرتێری گشتی خرابووە بەردەم لیژنەکەو[٣٢٤]، چەند نامەیەکی پەیوەندیدار بەمەسەلەکەوە، لەلایەن نوێنەرانی هەژدە دەوڵەتی ئەندام لە نەتەوەیەکگرتووەکان پێشکەشکرا[٣٢٥].

---

[٣٢٣] لە دانیشتنی گشتی(٤٤)ی کۆمەڵەکە لە ٢٠ی تشرینی یەکەمدا بەسترا، نوێنەری لیبیا لە نەتەوەیەکگرتووەکان(السید/ الزروق) بڕگەی (ب)ی خستەڕوو.

[٣٢٤] راپۆرتی سکرتێری گشتی سەبارەت بە تیرۆری نێودەوڵەتی کرا بەسێ بەشەوە، بەشی یەکەم ئەو بڕگانە دەخاتە روو کە پەیوەندییان بە بڕیاری ٦١/٤٠وە هەیە کە لە ٩ی کانونی یەکەمی ١٩٨٥ لە کۆمەڵەی گشتیەوە دەرچوو، بەشی دووەم ئەو وەڵامانە لە خۆ دەگرێت کە وڵاتان دایانەوە لەسەر یاداشتنامە زارەکییەکەی سکرتێری گشتی لە ١٨ی نیسانی ١٩٦٨ کە داوا لە حکومەتەکان دەکات کە راوبۆچوونی خۆیانی پێشکەش بکەن، سەبارەت بەجێبەجێکردنی بڕیاری ٦١/٤٠ وەکو سەرەتایەك بۆ ئامادەکردنی ئەو راپۆرتەی لە بڕگەی ١٤ی ئەو بڕیارە داوای لێکرابوو. و بەشی سێهەم ئەو وەڵامانە لە خۆ دەگرێت کە لەلایەن رێکخراوە نێودەوڵەتیو رێکخراوە حکومییە نێودەوڵەتییەکانەوە پێی گەیشتبوو، لە داوای راوێژکاری یاسایی سکرتێری گشتی لە ١٢ی شوباتی ساڵی ١٩٨٦ کە داوای کردبوو زانیاری پەیوەندیدار کە بە گونجاوی دەزانن بنێرن، تا تێهەڵکێشی راپۆرتەکەی سکرتێری گشتی بکرێتو ئەو راپۆرتەش کە هاوپێچەو حاڵەتی مۆرکردن یان پەسەندکردنی پێنج رێکەوتنامە نێودەوڵەتییەکە دەردەخات کە تایبەتن بە کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتی، یان حاڵەتی چوونە ریزی ئەو رێکەوتننامەوە. سەبارەت بە راپۆرتی سکرتێری گشتی، بڕوانە:

*A/42/519, Add. L, Corr. l*

[٣٢٥] ئەو وڵاتانە بریتین لە: کۆماری عەرەبی سوریا(دوونامەی جیاوان)، کوێت(سی نامەی جیاوان)، میسر، بەلجیکا، سۆرینام، لیبیا، ئیتالیا، ساموا، یەمەنی دیموکراتی، جەزائیر، کەنەدا، زیمبابۆی، ئوردن،

لیژنەی شەشەم لە دانیشتنی ٢٨-٤٨یدا، کە لە ماوەی ٢١ بۆ ٢٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٧[٣٢٦] بەندی ١٢٦ی پەیوەندیدار بە تیرۆری نێودەوڵەتییان تاوتوێکردو چەندین پرۆژە بڕیار لە یەکدراو، لەیەك دەقدا گشتێندراو لیژنەکە لە دانیشتنی ٦٠دا کە لە ١ی کانونی یەکەمی ١٩٨٧دا بەسترا، بڕیاری گوێزرانەوەی راسپاردەکانی‌دا، بۆ کۆمەڵەی گشتی بۆ بڕیار لەسەردانی[٣٢٧]. و کۆمەڵەی گشتی لەو بارەیەوە لە ٧ی کانونی یەکەمی ١٩٨٧دا بڕیاری لەسەردا[٣٢٨].

کۆمەڵەی گشتی لە بڕیارەکەیدا، ئیدانەی سەرجەم کارەکان و ئاکارەکانی تیرۆری کرد، بەوەی کە کاری تاوانن، لە هەر شوێنێك بێت، یان هەر کەسێك ئەنجامی دابێت، بەوەشەوە کە هەڕشە لە پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان دەکات و هەڕشەیە بۆ سەر ئاسایشیان[٣٢٩]، داوا لەسەرجەم دەوڵەتان کرا پابەند بن، بەو خاڵانەی یاسای نێودەوڵەتی دەیسەپێنێت بەسەریاندا بۆ رێگەگرتن لە رێکخستنی کارە تیرۆرییەکان، لە دەوڵەتانی تردا، یان هاندان بۆی، یان یارمەتیدانی بۆ ئەنجامدانی، یان بەشداریکردن تیایدا، یان چاوپۆشین لەو

---

ئەفریقیای باشوور(هەر ولاتە نامەیەکی جیاوان)، یەکێتی بولگاریا، پۆڵەندا، چیکوسلوڤاکیا، ئەڵمانیای رۆژهەلات، رۆمانیا، مەجەر(یەك نامە لەلایەن هەر حەوت ولاتەکە پێکەوە). بڕوانە:

*A/42/832, 3December 1987:*

[٣٢٦] لە لێکستە چڕەکانی دانیشتنەکاندا، تاوتوێکردنی بابەتی تیرۆر کە لە بڕگەی ١٢٦ی خشتەی کارەکانی نەتەوەیەکگرتووەکاندا هاتووە، بڕوانە: *A/C. 6/42/SR. 38-34* ئەم بەڵگەنامانە راوبۆچوونی ئەو نوێنەرانە لەخۆدەگرن کە سەبارەت بەم بڕگەیەوە، لە لیژنەی شەشەمدا وتاریان خوێندەوە.

[٣٢٧] لە دەقی پرۆژەی بڕیارەکەدا، بڕوانە *A/C.6/42/L* لیژنەکە بە زۆرینەی ١٢٨ دەنگ لەبەرامبەر ١دەنگ داو دەنگنەدانی ئەندامێك، بڕیاری لەسەر پرۆژەکەدا.

[٣٢٨] بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ١٥٩/٤٢ کە لە ٧ی کانونی یەکەمی ١٩٨٧دا دەرچووو، بڕیارەکە لە دانیشتنی گشتی ژمارە ٩٤ پەسەندکرابە رەزامەندیی ١٥٣ دەوڵەت و سەرپێچی دوو دەوڵەت(ئەمریکا و ئیسرائیل)و دەنگ نەدانی دەوڵەتێك (هندوراس). بڕوانە: *A/42/832*

[٣٢٩] بڕگەی جێبەجێ کاریی ١ لە بڕیارەکە.

چالاکییانەی لەناو خاکەکەیدا، بەمەبەستی ئەنجامدانی کاری لەو جۆرە ڕێکدەخرێت [٣٣٠].

کۆمەڵەی گشتی هانی دەوڵەتانیدا کە بایەخ بەو پابەندبوونانە بدەن کە یاسای نێودەوڵەتی بڕیاری لەسەرداوەو ڕێوشوێنی کاراو یەکلاکەرەوە بگرنەبەر، لە پێناوی دەسبەجێ کۆتایی هێنان بە تیرۆری نێودەوڵەتی- بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستە- بەم جۆرە [٣٣١]:

أ-قەدەغەکردنی ئامادەکاریو ڕێکخستنی کارە تیرۆرییەکان کە لە ناو خاکەکەی یان دەروەیدا هەوڵی بۆ دەدرێتو قەدەغەکردنی کردەکانی وێرانکاری کە لە دژی دەوڵەتانی ترو هاوڵاتییەکانی ئاراستە دەکرێت.

ب-دابینکردنی(مسۆگەرکردنی) گرتن یان دادگایکردن یان بەدەستەوەدانی ئەنجامدەرانی کردە تیرۆرییەکان.

ج-هەوڵدان بۆ بڕیاردانی دوو قۆڵی یان ئیقلیمی یان چەند لایەنە، لەسەر ڕێکەوتننامە تایبەتەکان لەو بارەیەوە.

د-هاوکاریکردنی نێوانیان لە ئاڵوگۆڕکردنی زانیاریی پەیوەندیدار، بە مەسەلەی قەدەغەکردنی تیرۆرو بنبڕکردنی.

ه-گونجاندنی نێوان بنەما یاساییە ناوخۆییەکانو ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان، سەبارەت بەو مەسەلەیە، بە تایبەت ئەوانەی کە ئەندامی ڕێکەوتننامەکانن.

کۆمەڵەی گشتی هانی سەرجەم دەوڵەتانیدا، بۆ هاوکاریکردنی دەوڵەتان بۆ هاوبەشیکردن، لە پێناوی وردە وردە کۆتایی هێنان بە هۆیە شاراوەکانی پشتی تیرۆری نێودەوڵەتیو، بایەخ بەسەرجەم حاڵەتەکانی بدەن، بەداگیرکەرو ڕەگەزپەرستیو هەموو ئەو حاڵەتانەی کە بە زەقی مافەکانی مرۆڤو ئازادییە بنەڕەتییەکان پێشێل دەکەنو، حاڵەتەکانی باڵادەستبوونە بێگانەو داگیرکەریی

[٣٣٠] بڕگەی جێبەجێ کاریی ٤ لە بڕیارەکە.

[٣٣١] بڕگەی جێبەجێ کاریی ٥ لە بڕیارەکە.

بیانی، کە رەنگە تیرۆری نێودەوڵەتی لێبکەوێتەوەو ئاشتی و ئارامیی نێودەوڵەتی رووبەڕووی مەترسی بکاتەوە[٣٣٢].

کۆمەڵەی گشتی پێشوازیی لەو هەوڵ و تێکۆشانانە کرد، کە رێکخراوی فڕۆکەوانی نێودەوڵەتیی مەدەنی، لە پێناو بە هێزکردنی پەسەندکردنی گشتیی رێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکانی ئاسایشی ئاسمانی و بۆ ئەو کارەی ئەنجامی دەدات، بۆ گەیشتن بە رێکەوتننامەی نوێ، بۆ بنبڕکردنی کاری توندوتیژیی ناڕەوا لەو فڕۆکەخانانەی کە خزمەت بە فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتی دەکەن، هەروەها پێشوازیی کرد لەو کارەی کە رێکخراوی دەریایی نێودەوڵەتی ئەنجامی دەدات، سەبارەت بە کێشەی تیرۆر لەناو کەشتی یان دژی و، داڕشتنی رێکەوتنامەی نوێ، لەو بوارەدا[٣٣٣].

هەروەها کۆمەڵەی گشتی داوای لە دەزگا پسپۆڕەکان و رێکخراوە حکومییە نێو دەوڵەتییەکانی تر کرد کە پەیوەندییان بەو مەسەلەیەوە هەیە، کە هەموویان، لە سنووری پسپۆڕیی خۆیاندا، چاو بەو رێوشوێنانەدا بخشێنن کە دەتوانرێت بگیرێتەبەر، بۆ بنبڕکردن و کۆتایی هێنان بە تیرۆر، داوای لە دەوڵەتانی ئەندام کرد کە بۆچوونەکانی خۆیان، سەبارەت بە کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتی بخەنەڕوو، بە تایبەت ئەوەی پەیوەندیی بە پێشنیارە پێشکەشکراوەکەی خولی چل و دووەم، بۆ بەستنی کۆنگرەی نێودەوڵەتی، بەسەرپەرشتی نەتەوەیەکگرتووەکان، بۆ پێناسەی تیرۆر جیاکردنەوەی لە خەباتی گەلان کە لە پێناوی رزگارکردنی نیشتیمانیدا پێی هەڵدەستن[٣٣٤].

کۆمەڵەی گشتی جەختی لەوە کردەوە کە لەوە کردەوە کە لەو بڕیارەدا، نابێت بەهەر رێگەیەك بێت، زیان بە مافی دیاریکردنی چارەنووس و ئازادی و سەربەخۆیی بگەیەنێت، کە لە بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە وەرگیراوە، بۆ ئەو گەلانەی بەشێوەیەکی زۆرەملێ، لەو مافە بێبەشکراوان کە لە جاڕنامەی

---

[٣٣٢] بڕگەی جێبەجێ کاریی(٨) لە رێکەوتننامەکە.

[٣٣٣] بڕگە جێبەجێ کارییەکانی ٩و ١٠ی بڕیارەکە.

[٣٣٤] بڕگە جێبەجێ کارییەکانی ١١و ١٢ی بڕیارەکە.

پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتیی، تایبەت بە پەیوەندیی دۆستانەو هاوکاریی نێوان دەوڵەتان، بە پێی بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان ئاماژەی بۆکراوە، بەتایبەتی ئەو گەلانەی لەژێر دەسەلاتی رژێمە داگیرکەرو رەگەزپەرستەکان و داگیرکەری بیانی، یان هەر شێوەیەکی تری دەسەلاتی داگیرکاریی و، یان دەست بخاتە مافی ئەو گەلانەی کە خەبات دەکەن، لە پێناو بەدیهێنانی ئەو مەبەستەو پشتگیریکردنی بۆ دەستەبەرکردنی، بە پێی بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتوودکان و لەگەڵ ئەوەش کە لە جارنامەی پێشتردا باسمانکرد[٣٣٥].

کۆمەڵەکە داوای لە سکرتێری گشتی کرد، کە بە گوێرەی پێویست بە دواداچوونی هەبێت، لەسەر جێبەجێ کردنی بریارەکەو، لە خولی چل و چوارەمدا راپۆرتێك پێشکەش بە کۆمەڵەی گشتی بکات و، بریاری دا برگەی تیرۆر، لە خشتەی کارە کاتییەکانی ئەو خولەدا دابنێت[٣٣٦].

**یانزەهەم- خولی چل و چوارەهەم(١٩٨٩):**

وتووێژکردنی برگەی پەیوەندیدار بە تیرۆرەوە، لە چوارچێوەی لیژنەی شەشەم، لە ماوەی نێوان ١٢-١٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٩دا دەستی پێکردو، تیایدا لیژنەکە راپۆرتی سکرتێری گشتی، لەوبارەیەوە خستەرووکە وەلامە هاتووەکانی هەندێ لە حکومەتەکان و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی لە خۆگرتبوو[٣٣٧]. نوێنەری دەوڵەتانی ئەندامی لیژنەکە، لە بەیاننامەکانیاندا، هەڵوێستی حکومەتەکانیان لە مەسەلەی تیرۆردا خستەروو.

لە وتووێژە چروپرەکان کە لە لیژنەی شەشەمدا ئەنجام درا یەك دەنگی لە نێوان سەرجەم دەوڵەتاندا بۆ ئیدانەکردنی تیرۆرو بەرەنگاربوونەوەی بەدی کرا. هەروەها رێکەوتن لەسەر پێویستی هاوکاریی نێودەوڵەتی، بۆ کۆتایی هێنان بەو دیاردەیەو ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری، لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە. هەروەها لەو مامەڵانەی کە لە لیژنەکەدا کرا، روون بووەوە کە رازیبوونی تەواو، لە نێوان

---

[٣٣٥] برگە جێبەجێ کاریەکانی ١٤ی بریارەکە.

[٣٣٦] برگە جێبەجێکاریەکانی ١٣و ١٥ لە بریارەکە.

[٣٣٧] لە دەقی راپۆرتی سکرتێری گشتی، بروانە: *A/44/456 and Add. 1*

ئـەندامانی لیژنەکـەدا، بـۆ چوونـە ریـزی دەوڵـەتانی ئـەندام لـە کۆمەڵگـەی نێودەوڵەتی، بۆ رێکەوتننامـە نێودەوڵەتییـەکان لـەو بـارەوەو، گونجـاندنی یاسـا نیشتیمانییەکان لەگەڵ یاسـا نێودەوڵەتییـەکاندا، لـە پێنـاو کۆتـایی هێنـان بـەو دیاردەیە.

و زۆربـەی دەوڵـەتان داوایـان کـرد، لـە هۆیـە شـاراوەکانی پشـتی تـیرۆر بکۆڵرێتـەوە، بەمەبەسـتی چارەسـەکردنی و، دادگـایکردنی تیرۆریسـتان، یـان بەدەسـتەوەدانی تاوانبـاران بـەو دەوڵەتانـەی کـە بوونەتـە قوربـانی کـردە تیرۆریستییەکانیان، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە دەوڵەتان ئامارژەیان، بۆ پێویستی بەسـتنی رێکەوتننامـەی دوو قۆڵـی یـان ئیقلیمـی یـان نێودەوڵـەتی، بـۆ بەدەستەوەدانی تاوانباران کرد.

بەڵام رووەکانی جیـاوازیی نێـوان ئـەندامانی لیژنـەی شەشـەم، سـەبارەت بە مەسـەلەی تـیرۆر، خـۆی لـە مـەودای گرنگیـی بەسـتنی کۆنگـرەی نێودەوڵـەتی پێشـنیارکراو، بـۆ جیـاوازیکردن لـە نێـوان تـیرۆرو خـەباتی گـەلان، لـە پێنـاو رزگـارکردنی نیشـتیمانیدا دەبینێتـەوە تیبینـی دەکرێـت کـە دەوڵـەتانی عـەرەبی تێکەڵنەکردنی نێوان دیاردەی تیرۆرو خەباتی چەکداریی پەیوەندیدار، بە مافی دیـاریکردنی چـارەنووس کـە بزووتنـەوەکانی ئـازادیخوازی نیشـتیمانی پیـادەی دەکـەن بە پێویست دەزانـن. و پشتگیریی لە بەستنی کۆنگرەی نێودەوڵەتی، بـۆ جیاکردنـەوەی نێوانیـان دەکـەن. بـەڵام کۆمەڵـەی دەوڵـەتانی رۆژئـاوا بەرهەڵسـتی بەستنی کۆنگرەیەکی لەو جۆرەیان کردو پێیان وایە هیچ گرنگییـەکی نییە. و بە تەواوی گومانیان لـەوە هەیە کە سوودی هـەبێت. لە نێوان ئەو دوو کۆمەڵەیەدا، کۆمەڵەی دەوڵەتانی سۆشیالیستی هەیە. رازین بە بەستنی ئەو کۆنگرەیە، بەڵام بە مەرجی بوونی رێکەوتننامەیەکی پێش وەخت، لە نێوان سەرجەم دەوڵەتان لەو بارەیەوەو، دانـانی خشتەی کارەکـانی کۆنگـرە کـە بـە کـۆی دەنـگ دا بڕیێژرێـت. زۆربـەی دەوڵـەتانی ئـەفریقاو ئـەمریکای لاتـین هـاوڕابوون، لەگـەڵ کۆمەڵـەی دەوڵەتانی سۆشیالیستی سەبارەت بەو بۆچوونە.

لە کاتی وتووێژەکانی لیژنەی شەشەمدا، چەند دەوڵەتێك پرۆژەی بڕیاری پەیوەندیدار، بە برگەی ١٣٩ی پێشکەشکرد کە تایبەت بوو بە برگەی(١٣٩) کە خرابووە بەردەمی لیژنەکەو تایبەت بوو بە تیرۆر[٣٣٨]. لە دانیشتنی چل و حەوتەمی لیژنەکەدا کە لە ٢٧ی تشرینی دووەمی ١٩٨٩دا بەسترا، سەرۆك پێشنیاری دواخستنی بڕیاردانی لەسەر پرۆژە بڕیارە پێشکەشکراوەکان کرد، بۆ پێدانی دەرفەت، بۆ بەردەوامبوونی راوێژکردنی زیاتر، بە ئامانجی گەیشتن بە هەماهەنگی بیروراکان، سەبارەت بە دەرکردنی پرۆژە بڕیارێکی یەکگرتوو. لە دانیشتنی چل و هەشتەمی لیژنەی شەشەم کە لە رۆژی(١)ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٩دا بەسترا، سەرۆکی لیژنەی شەشەم پرۆژە بڕیارێکی پێشکەشکرد کە خاڵە هاوبەشەکانی نێوان هەرسێ پرۆژە پێشکەشکراوەکەی لە خۆگرتبوو[٣٣٩]. لیژنەکە بڕیاری لەسەر ئەو پرۆژەیەدا کە لەلایەن سەرۆکەوە پێشکەش کرابوو، بە راسپاردەکانەوە رەوانەی کۆمەڵەی گشتی کرد بۆ بڕیاردان لەسەری[٣٤٠]. لە دانیشتنی حەفتاو دووەمی کۆمەڵەی گشتی، کە لە ٤ی کانونی یەکەمی ١٩٨٩دا بەسترا، کۆمەڵەی گشتی بڕیاری لەسەر پرۆژە بڕیارەکەدا بەبێ دەنگدان، بوو بە بڕیاری ژمارە٤٤/٢٩[٣٤١].

کۆمەڵەی گشتی لە بڕیارەکەیدا، ئیدانەی تەواوی سەرجەم کردەو ئاکارەکانی تیرۆرکرد، بەوەی کردەی تاوانکارییێن لە هەر شوێنێك ئەنجامبدرێن و، هەر کەسێکیش ئەنجامی دابێت، بەوانەشەوە کە کار دەکەنە سەر پەیوەندیی

---

[٣٣٨] لیژنەی شەشەم سێ پرۆژەی پێشکەشکرد:

١. پرۆژەی پێشکەشکراو لەلایەن دەوڵەتانی رۆژئاوا (A/c.6/44/L.2)

٢. پرۆژەی پێشکەشکراو لەلایەن دەوڵەتانی سۆشیالیستیەوە (A/c.6/44/L.3)

٣. پرۆژەی بڕیاری پێشکەشکراو لەلایەن یوگسلاڤیاوە، لە جیاتی دەوڵەتانی بێلایەن. (A/c.6/44/L.3)

[٣٣٩] سەبارەت بەدەقی پرۆژە بڕیارەکە، بروانە: A/c.6/44/L.22

[٣٤٠] سەبارەت بە راپۆرتی لیژنەی شەشەم بۆ کۆمەڵەی گشتی، بروانە: A/44/762

[٣٤١] سەبارەت بە دەقی بڕیارەکە، بروانە: بەڵگەنامە رەسمییەکانی کۆمەڵەی گشتی، خولی ٤٤(١٩٨٩)، پاشکۆی ژمارە(٤٩)، بروانە: A/44/49، لاپەرە ٣٦٩.

دۆستانەی نێوان دەوڵەتانو هەڕشە لە ئاسایش دەکەن پاساویان بۆ ناهێنرێتەوەو، داوای لەسەرجەم دەوڵەتان کرد کە پابەندبن بەو بڕیارانەی کە یاسای نێودەوڵەتی سەپاندویەتی، بۆ قەدەغەکردنی ڕێکخستنی چالاکییە تیرۆرییەکان لە دەوڵەتانی تردا، یان هاندان بۆی، یان یارمەتیدان بۆ ئەنجامدانی، یان بەشداریکردن تیایدا، یان چاوپۆشین لەو چالاکییانەی لەناو خاکەکەیاندا، بەمەبەستی ئەنجامدانی ئەو کارانەی لەو جۆرە ئەنجام دەدرێن. هەروەها سەرجەم دەوڵەتانی هاندا کە بە ئەمەك بن، بەرامبەر بەو پابەندبوونانەی کە یاسای نێودەوڵەتی سەپاندوویەتی، بۆ گرتنبەری ڕێوشوێنی کاراو یەکلاکەرەوە، لە پێناو کۆتایی هێنانی یەکجارەکی تیرۆری نێودەوڵەتی و، قەدەغەکردنی هەستان بە کردە تیرۆریی و وێرانکارییەکانی ئاراستەکراو دژی دەوڵەتانی ترو هاوڵاتییەکانیان، مسۆگەر کردنی دەستگیرکردن و قەڵاچۆکردن و بەدەستەوەدانی ئەنجامدەرانی ئەو کارانە، هەروەها کۆمەڵەی گشتی داوای لە سەرجەم دەوڵەتان کرد، کە هەوڵ بدەن بۆ بڕیاردان لەسەر ڕێکەوتننامەکانی تایبەت بەم مەبەستە، لەسەر بنەمای دوو قۆڵی و ئیقلیمی و چەند لایەنەو هاوکاریکردنی نێوانیان بۆ ئاڵوگۆڕکردنی زانیاریی پەیوەندیدار، لەبارەی قەدەغەکردنی تیرۆرو بنبڕکردنی و، گرتنەبەری هەموو هەنگاوێکی پێویست، بۆ جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بەو مەسەلەیەوە.، هەروەها هانی هەموو ئەو دەوڵەتانەیدا کە ئەندامی ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان نین، بچنەریزی ڕێکەوتننامەکانەوەو، داوای ئازادکردنی دەسبەجێی هەموو بارمتەگیراوو ڕفێنراوەکانی کرد، لە هەر کوێیەك بن و، پێشوازیی لەو هەوڵ و تێکۆشانانە کرد کە ڕێکخراوی فڕینی مەدەنیی نێودەوڵەتی، بە مەبەستی پتەکردنی پەسەندکردنی گشتیی ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکانی ئاسایشی ئاسمانی و پابەندبوون پێیانەوە، بە بەستنی پرۆتۆکۆڵی تایبەت بە نەهێشتنی کاری توندوتیژیی نێودەوڵەتی، هەروەها پێشوازیی لە بڕیاری ڕێکخراوی دەریایی نێودەوڵەتی، بۆ ڕێکەوتننامەی سەرکوتکردنی کارە نایاسایییە ئاراستەکراوەکان، دژی سەلامەتی

کەشتیوانە دەریاییەکان و[342]، پرۆتۆکۆڵی پەیوەندیدار بە بنبڕکردنی کارە نایاساییە ئاراستەکراو دژی لەنگەرگەکانی کەناری ئۆقیانووسەکان کرد[343]. و هانی ڕێکخراوی فڕینی مەدەنیی نێودەوڵەتی‌دا، بۆ چڕکردنی کارەکانی لە پێناوی گەیشتن بە سستمێکی نێودەوڵەتی، بۆ دانانی نیشانە لەسەر مادەکانی تەقینەوەی تایبەت بە فڕۆکە، بەمەبەستی دۆزینەوەیان.

کۆمەڵەی گشتی داوای لە سکرتێری گشتی کرد درێژە بە داواکردنی ڕاو بۆچوونی دەوڵەتانی ئەندام بدات، لەبارەی تیرۆری نێودەوڵەتی بە هەموو لایەنەکانیەوەو ڕێگەکان و ئامرازەکانی بنبڕکردنی، بە بەستنی کۆنگرەی نێودەوڵەتیشەوە، لە ژێر سەرپەرشتی نەتەوە یەککگرتووەکان، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتی.

**دوانزەیەم: خولی چل و شەشەمین (١٩٩١):**

لیژنەی شەشەم دەستی کرد بەوتووێژکردنی برگەی ١٢٥ی پەیوەندیدار بە تیرۆرەوە، لە دانیشتنی ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١، کە(لافلاش هاور) ی ڕاوێژکاری یاسایی، ڕاپۆرتی سکرتێری گشتی پێشکەشکرد[344]. و ئاماژەی بۆ گرنگی بەستنی کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی کرد، بەسەرپەرشتی نەتەوەیەککگرتووەکان، بۆ دیاریکردنی تایبەتمەندییەکانی تیرۆرو جیاکردنەوەی لە خەباتی گەلان، لەپێناو ڕزگاری و چارەسەرکردنی هۆیە شاراوەکانی پشت دیاردەی تیرۆر نێودەوڵەتی، هەروەها خستنەڕووی بیروبۆچوونەکانی حکومەتەکان و ئەو وەڵامانەی کە لە ئەمینداریەتی گشتیی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان پێگەیشتووەو، جەختی لەسەر دڵەراوکێ و نیگەرانیی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی لەو کێشەیەو پێویستی گرتنەبەری ئەو ڕێوشوێنانەی کرد کە ڕێگە

---

[342] ئەو ڕێکەوتننامەیە لە ڕۆما ئیمزاکرا لە ١٠ی مارتی ١٩٨٨، لە ژێر چاودێریی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی، بڕوانە: *SVA/ CONF/ Rev. 1*

[343] ئەو پرۆتۆکۆڵە لە ڕۆمادا ئیمزاکرا لە ١٠ی مارتی ١٩٨٨ لەژێر چاودێریی ڕێکخراوی دەریایی نێودەوڵەتی، بڕوانە: *SUA/ CONF/15/Rev.2*

[344] سەبارەت بە ڕاپۆرتی سکرتێری گشتی، بڕوانە: *a/46/346 AND Add. 1,2*

دەگرن، لەوەی تاوانباران تاوانەکانیان ئەنجام بدەنو دادگاییان بکەنو ئەمەش کورتەی گرنگترین بەیاننامەی ژمارەیەك لە دەوڵەتانەیە لەو بارەیەوە:

**١-هۆڵەندا( لەجیاتی یەکێتی ئەوروپا )**

نوێنەری هۆڵەندا پابەندبوونی ئەندامانی کۆمەڵەی ئەوروپای دەربڕی، بۆ بڕیارە پەیوەندیدارەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان، بۆ ئیدانەکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی کە هەڕەشە لە سەقامگیریی ئاشتیو ئاسایشی جیهان دەکاتو، داوای ئازادکردنی بارمتەگیراوو کۆتایی هێنان بە دیاردەی تیرۆری کرد. هەروەها جەختی لەسەر ئامادەیی هەژدە دەوڵەتەکە کرد، بۆ جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانەی کە بۆ رووبەڕووبوونەوەی تیرۆر گیراوەتەبەر. و نوێنەری هۆڵەندا هانی رێکخراوەکانی فڕینی مەدەنیی نێودەوڵەتیدا، بۆ گرتنەبەری ئەو رێوشوێنانەی کە پێشتر لەسەری رێکەوتوون. هەروەها ئەو پێشنیارانەی نرخاند کە داوای بەستنی کۆنگرەی نێودەوڵەتی دەکەن بۆ ئیدانەکردنی تیرۆر، بەمەرجێ لەو چوارچێوەیەدا تیرۆرو مافی دیاریکردنی چارەنووس لە یەکتر جیابکرێتەوە.

**٢-ئەرجەنتین:**

نوێنەری ئەرجەنتین ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە لە خولی چلو چوارەمی کۆمەڵەی گشتیدا، رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان ئیدانەی هەموو شێوەکانی تیرۆری نێودەوڵەتییان کرد. و هەروەها ئاماژەی بۆ ئەوەش کرد کە هێشتا دەردی تیرۆر هەڕەشە لە ئاسایشو سەقامگیری دەکاتو، ئەوەی بەم دواییە لە کەنەدا رووی‌دا، کاتێ کە عیراق دەوڵەتی کوێتی داگیرکرد، باشترین نموونەیەتی.

**٣-لیبیا:**

نوێنەری لیبیا ئاماژەی، بۆ یەکخستنی هەوڵەکانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی کرد لەو کاتەوەی پیادەکردنی تیرۆر دەستی پێکردو روو لە زیادبوونو بەرفراوان بوون بووە، بە هەموو شێوازەکانیەوە، بە تایبەتی تیرۆری دەوڵەتو تیرۆری تاك، کە هەڕەشە لە ئاسایشو ئاشتیو سەقامگیریی نێودەڵەتی لەق دەکات کە سەرجەم دەوڵەتان جەختی لەسەر دەکەن هەوڵی چەسپاندنی دەدەن لە رێگەی

بانگەشەکانەوە، بۆ پەرەپێدانی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان و پتەکردنی ڕۆڵی و بەدیهێنانی ئاوات و ئامانجی گەلان و، گەیشتن بەمەبەستەکانیان، لەپێناو کۆتایی هێنان بەدیوەزمەی تیرۆر کە بۆتە هۆی نا ئارامیی جیهان و هەڕشە لە سستمە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابورییەکان و ژیانی بێ تاوانان لە هەموو شوێن و کاتێکدا دەکات.

هەروەها نوێنەرەکەی لیبیا ئاماژەی بۆ جیاوازیی گەروەی نێوان تیرۆر کە لە ئەنجامی نیازی تاوانکاری و شەڕەنگێزی و ئاکاری شەڕخوازی پیادە دەکرێت، چ ڕاستەوخۆ لەلایەن دەوڵەتەوە ئەنجام بدرێت، یان بە ناڕاستەوخۆ پشتگیریی لەو لایەنانە بکات کە لەبری خۆی پراکتیزەی دەکات، بەمەبەستی نۆرێن و کۆنترۆڵکردن، لەگەڵ خەباتی ڕەوای چەکداری کە گەلان و بزووتنەوە ئازادیخوازە نیشتیمانییەکان پێی هەڵدەستن، بۆ دیاریکردنی چارەنووس و ڕزگاربوون لە نۆرێن بە هەموو شێوە جیاوازەکانیەوە، بۆ دەستبەرکردنی مافی ڕەوای نیشتیمانی لەسەربەخۆیداو، درێژەی بەوتەکەیدا و گوتی: ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە کە ئێمە ئەمرۆ ڕووبەڕووی تیرۆرێك دەبینەوە کە دەوڵەتانێك دژی دەوڵەتێکی تر پەیرەویی دەکەن و، بەمەبەستی سەپاندنی نۆرێنی خۆیان بەسەریداو لەقبوونی سەقامگیری و سەلامەتی و سەربەخۆیی سیاسی ڕووبەڕووی مەترسی دەکاتەوەو، شێواندنی پلانەکانی فراژوبوون و، دارمانی ئابووری و ژێرخانی بنەڕەتی و، برسی کردنی گەلەکەی و زیان گەیاندن بە یەکپارچەیی نیشتمانی و وێرانکردنی دەزگا زانستی و شارستانییەکانی، بە بیانووی دروستکراوەوە کە نە لۆژیك و نە یاسا و نە ویژدانی مرۆڤایەتی پاساوی بۆ ناهێننەوە، گوایە ئاسایش و ئاشتی نێودەوڵەتی دەپارێزن. هەروەها نوێنەری لیبیا لە وتەکەیدا، ئاماژەی بەو تیرۆرە کرد کە بەسەر گەلی فەلەستین و لەسەر گەلانی ترەوەیە، کە گەلی فەلەستین ڕۆژانە ڕووبەڕووی هەموو جۆرەکانی ئەشکەنجەو کوشتن دەبنەوە بە دڕندەترین شێوەو، ئاوارەبوون و تیرۆرکردنی سەرکردەکانیان، بەمەبەستی دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەیان لە خاکە داگیرکراوەکان. هەروەها گوتی کە وڵاتەکەی ئیدانەی تیرۆر دەکات و داوا لە

کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەکات بەرەنگاریی ببنەوەو ڕێگەی لێبگرن و گەلی فەلەستین بتوانێ مافە بنەڕەتی و ڕەوا نیشتمانییەکانی دەستەبەر بکات، هەروەها ئیدانەی هەموو جۆرە کارێکی تیرۆریستییانە دەکات.

٤-کوێت:

نوێنەری دەوڵەتی کوێت لە بەیاننامەکەیدا، ڕوونی کردەوە کە دیاردەی تەنراوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان کرمۆڵ دەکات و، توندوتیژی و بێسەرو بەرەیی و هەستی ڕق و دوژمنایەتی، لە نێوان دەوڵەتان و گەلانی جیهاندا بڵاودەکاتەوەو، وڵاتەکەی گرنگییەکی تایبەتی بەو کێشەیە دەدات، لە ڕێگەی ئەزموونە خۆیەتییە تاڵ و پڕ لە ئازارەکانی کە ڕووبەڕووی کۆمەڵگەی بێ وەی و بچووکی وەکو کوێت بووەوە.

ئەو ئەزموونانەش جۆراوجۆربوون، وەکو ڕووداوی تیرۆرکردنی دبلۆماسییەکانی لەدەرەوەو، تەقاندنەوەو وێرانکردنی دەزگا نیشتمانییەکان و، هەوڵدان بۆ تیرۆرکردنی ئەمیری کوێت، بەم دواییەش داگیرکردنی کوێت، لەلایەن عیراقەوە. نوێنەرەکەی کوێت لە وتەکەیدا گوتی، داگیرکردنی کوێت لەلایەن ڕژێمی عیراقەوەو وێرانکردن و کاولکردنی دەوڵەتی کوێت و تواناکانی و، کوشتن و ئاوارەکردنی گەلەکەی و، دواخستنی ئازادکردنی دیلە کوێتییەکان، هەموو ئەمانە جەخت لەسەر پێویستی کاری جدی دەکەنەوە، بۆ کۆتایی هێنان بەو دیاردەیە، لەلایەن کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییەوەو، ئەویش بە بەرپەچدانەوەی ڕژێمە هاوشێوەکانی ڕژێمی عیراق کە لەسەر تیرۆرو زوڵم و کوشتن و تۆقاندن دامەزراوە، نەك تەنها لە دژی دەوڵەتانی دراوسێی، بەڵکو لە دژی گەلەکەشی پیادەی کردووەو گەلەکەی کردۆتە قوربانی یەکەمی کارە تیرۆرییەکانی و جەختی لەسەر ئەوە کرد کە ئەوە تەنها بە هاوکاریی نێودەوڵەتی و، مل نەدان بەکارە تیرۆرییەکان و، مانەوەو جێگیریی لەسەر داب و نەریتی بەرپەچدانەوەی تیرۆرو تیرۆریستان بەدی دێت.

نوێنەرەکەی کوێت ڕوونی کردەوە کە تیرۆریزمی عیراق، داهاتی سروشتی وێرانکردو ژینگەی وڵاتی کوێتی ئالودەکردو زیانی بەو ناوچەیە گەیاندو ئەویش بە تاوانی سووتاندن و تەقاندنەوەی بیرە نەوتەکانی کوێت. و ئیدانەکردنی کوێتی

لە دژی تیرۆر راگەیاند کە ئاسایشی دەوڵەتان و سەلامەتی گیانی مرۆڤی بێ تاوان رووبەڕووی مەترسی دەکاتەوەو، داوای پێویستی جیاکردنەوەی کردە تیرۆرییەکانی لە خەباتی مافی گەلان، لەپێناو کێشە رەواکەیان و رزگارکردنی خاکەکەیان کردو، خەباتی گەلی فەلەستینی لە خاکی عەرەبی داگیرکراودا، بە نموونە هێنایەوە. و هەروەها جەختی لەسەر بیرۆکەی بەستنی کۆنگرە کردەوە، بۆ پێناسەکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی و جیاوازیی لەگەڵ خەباتی گەلان، لە پێناوی رزگارکردنی خاکەکەیداو، داوای دانانی رێگە چارەی بنەڕەتی، بۆ گەیشتن بە چارەسەرکردنی دیاردەی تیرۆرکرد. و نوێنەری کوێت چەندین پێشنیاری، بۆ کۆتایی هێنان بە دیاردەی تیرۆر پێشکەشکرد، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

أ-ئیدانەکردنی تیرۆری رەسمیی رێکخراو، لەلایەن دەوڵەت بە هەموو شێوەکانیەوە، بەوەش کە مافەکانی مرۆڤ بەزەقی پێشێل دەکات و هەڕەشە لە ئاسایش و سەقامگیریکۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەکات.

ب-سووربوون لەسەر بوونی ستراتیژێك بۆ قەلاچۆکردنی تیرۆر.

ج-دابڕین و گۆشەگیرکردنی ئەو دەوڵەتانەی کە تیرۆری لێوە دەردەچێت، یان دالدەی تیرۆریستان دەدات.

د-قەدەغەکردنی هەستان بە ئامادەکردن و رێکخستنی کردە تیرۆرییەکان.

ه-قەدەغەکردنی وێرانکاریی و تێکدان کە ئاراستەی دەوڵەت و هاوولاتییان دەکرێت.

و-مسۆگەرکردنی دەستگیرکردن و دادگاییکردن، یان بە دەستەوەدانی ئەنجامدەرانی کارە تیرۆرییەکان.

ز-هاوکاریکردنی نێوان دەوڵەتان، لەبواری ئالوگۆڕی زانیاریی پەیوەندیدار، بە قەدەغەکردنی تیرۆرو بنبڕکردنی.

ح-سازش نەکردن یان مل نەدان، بۆ داواکاری تیرۆریستان.

ط-چوونە ریزی دەوڵەتان بۆ رێکەوتننامە دوو قۆڵی یان ئیقلیمی، یان نێودەوڵەتییەکان، بۆ بنبڕکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی.

**ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا:**

نێردراوی ئەمریکا باسی لە گرنگترین ئەو وتووێژانەکرد کە لەلایەن ئامادەبوانەوە، لەمەڕ ئەم بڕگەیە خرایەڕووو، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە سەرجەم بەشداربووان ئیدانەی تیرۆرییان کردو ئامادەیی خۆیان دەربڕی، بۆ هاوکاریکردن، لە پێناو کۆتایی هێنان بەو دیاردەیە. و نێردراوەکەی ئەمریکا گوتی ئەو رۆژانە بەسەرچوو کە کەمینە لە شاندەکان کار بۆ ئەوە بکەن کە مەرجی دیاریکراو دابنێن، بەر لە ئیدانەکردنی شێوە جیاوازەکانی تیرۆر، بەوەی کردەی تاوانکارییە. نێردراوەکەی ئەمریکا رایگەیاند کە تەباییەکی نێودەوڵەتی لە هەڵوێستی شاندەکاندا هەیە، بەرامبەر بە ئیدانەکردنی تیرۆرو، ژمارەی رێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان، لە بواری بنبڕکردنی تیرۆردا، لەوانەش:

أ-رێکەوتننامەکانی نەهێشتنی دەستتێوەردانی نایاسایی لە خزمەتگوزارییەکانی فڕینی مەدەنیی نێودەوڵەتیدا.

ب-رێکەوتننامەکانی پاراستنی دبلۆماسییەکان و ئەو کەسانەی مافی پاراستنی نێودەوڵەتییان هەیە.

ج-رێکەوتنامەی بەرەنگاربوونەوەی بە بارمتەگرتن.

د-رێکەوتننامەی قەدەغەکردنی کردە تیرۆرییەکان لە ئوقیانووسەکاندا، هەروەها گوتی تەوەری سەرەکیی ئەو رێکەوتننامانە، بریتییە لە پارێزگاری نەکردنی تیرۆریستان و، ئاماژەی بۆ ئەوەش کرد کە لیژنەی بەڵگەنامەکە، کار بۆ دیاریکردنی پەیوەندیی نێوان رێکخراوە ئیقلیمییەکان و نەتەوەیەکگرتووەکان دەکات و، ئەم هاوکارییەش، لەبواری بنبڕکردنی تیرۆردا گەشە دەکات. و گوتی کە ولاتەکەی بڕوای وایە کە پێویستە مەسەلەی تیرۆر بە چەکی ئەتۆمی و کیمیایی و بایۆلۆژیی، لە داهاتوودا تاوتوێ بکرێت. و سوپاسی یەکێتی سۆڤیەتی کرد، لەوەی کە ئەم بابەتەی خستە بەردەم کۆمەڵەی گشتی. بەلام سەبارەت بەو پێشنیارە تایبەتە، بۆ بەستنی کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی بە چاودێریی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ تاوتوێکردنی پێناسەی تیرۆرو بنبڕکردنی جیاکردنەوەی لە خەباتی چەکداریی، لە پێناوی دیاریکردنی مافی چارەنووس، ئەوا ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تەبایە، لەگەڵ ئەو ولاتانەی کە پێیان وایە، ئەو کۆنگرەیە بەر لە

بەدیهێنانی کۆدەنگییەك لە مەسەلەی پێناسەی تیرۆردا نەبەسترێت، چونکە تا ئێستا وتوویژەکان نەیان توانیوە کۆ دەنگییەك لەو بارەوە بەدەست بهێنن.

**٦-یەکێتی سۆڤیەت:**

یەکێتی سۆڤیەت تیرۆری ئیدانەکرد، بە هەموو شێوازەکانیەوەو هەموو ئەو هۆکارانەی لە پێشتییەوەن و، داوای لە وڵاتان کرد، هیچ جۆرە یارمەتییەك پێشکەش بە تیرۆریستان نەکەن و رۆڵی رێکخراوی فرۆکەوانیی مەدەنیی بەرز نرخاند، سەبارەت بە قەدەغەکردنی بەکارهێنانی مادەی پلاستیکی تەقینەوەو دانانی نیشانە لەسەریان. هەروەها گوتی کە پێویستە هاوکاریی هاوبەشی نێوان وڵاتان و نەتەوەیەکگرتووەکان، بۆ نەهێشتنی دیاردەی تیرۆر پتەو بکرێت.

لەدانیشتنی بیست و شەشەمی لیژنەی شەشەم کە لە ٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١دا بەسترا، بەبێ دەنگدان پرۆژەی بریارێك پەسەندکرا[٣٤٥] تایبەت بوو بە"ئەو ریوشوێنانەی دەبنە هۆی نەهێشتنی تیرۆری نێودەوڵەتی، کە گیانی مرۆڤی بێ تاوان دەخاتە مەترسییەوە، یان لەناوی دەبات، یان هەرشە لە ئازادییە بنەرەتییەکانی دەکات و، تاوتوێکردنی ئەو هۆکارانەی لە پشتی شێوازەکانی تیرۆرو کارە توندوتیژەکانەوەن کە دەرهاویشتەی بێ ئومێدیوهەستکردن بە بێزاریین و هەندێ لە خەڵکی دەبن بە قوربانی و، تەنانەت گیانی خۆشیان لەدەست دەدەن، بە هەوڵی ئەوەی گۆرانکاریی بنەرەتی بەدیبهێنن" و هاوپێچ لەگەڵ راسپاردنەکانی رەوانەی کۆمەڵەی گشتی کرا، بۆ ئەوەی بریاری لەسەر بدرێت[٣٤٦]. و لە دانیشتنی شەشەم و حەوتەمی کۆمەڵەی گشتیدا، کە لە(٩)ی کانونی یەکەمی ١٩٩١دا بەسترا، بەبێ دەنگدان پرۆژەی راسپاردبوو، بوو بە بریاری ٥١/٤٦.

کۆمەڵەی گشتی لە بریارەکەیدا، بێزاریی خۆی دەربری، بەهۆی بەردەوامبوونی کارە تیرۆرییە نێودەوڵەتییەکانەوە، بە هەموو شێوازەکانی لەسەر ئاستی جیهان، بەو کردانەشەوە کە وڵاتان بەشداریی لە ئەنجامدانیان دەکەن،

---

[٣٤٥] سەبارەت بە پرۆژەی بریارەکە، بروانە: *A/c.6/46/L.4*

[٣٤٦] بروانە: *A/46/654*

راستەخۆ یان ناڕاستەوخۆو، تیایاندا ژیان و گیانی کەسانی بێ تاوان دەکەوێتە مەترسییەوە، یان لەناودەچن کە کاریگەریی زیانباری لەسەر پەیوەندیی نێودەوڵەتی هەیەو، رەنگە ئاسایشی ئیقلیمی ولاتان و ئارامییان بشێوێنێت. و کۆمەڵەکە پەیوەندیی نێوان کۆمەڵە تیرۆرییەکان و بازرگانانی ماددە بێهۆشکەرەکان و، ولاتانی وە ئاگاهێنایەوەو[٣٤٧]، باوەڕی بە گرنگیی گەشەپێدان و چاککردنی هاوکاریی نێودەوڵەتی، لەنێوان دەوڵەتاندا، بەشێوەی دوو قۆڵی یان ئیقلیمی یان چەند لایەنە هەیە، کە دەبێتە هۆی بنبڕکردنی کارەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی و ئەو هۆکارانەی لە پیشتیانەوەن. و کۆمەڵە لە بڕیارەکەیدا ئەوەی سەلماند کە دەکرێ چالاکیی خەباتکردن دژی تیرۆر فراوان بکرێت، لەرێگەی دانانی پێناسەیەك بۆ تیرۆری نێودەوڵەتی کە بەشێوەیەکی گشتی پەسەند بکرێت.

کۆمەڵەی گشتی لە بڕیارەکەیدا، بە تەواوی هەموو کردەو شێوازەکانی تیرۆری ئیدانەکرد، بەوەی کردەی تاوانکارین و لە هەر شوێنێك و لەلایەن و هەر کەسێکەوە ئەنجام بدرێت، پاساو نادرێتەوە، بەوانەشەوە کە هەڕەشە لە پەیوەندیی دۆستانەی نێوان ولاتان دەکەن و ئاسایشیان دەخەنە مەترسییەوە. و داوای لە هەموو ولاتان کرد پابەندبن بەو خالانەی کە یاسای نێودەوڵەتی دەیسەپێنێت بەسەریاندا، بەوەی کاری تیرۆر لە ولاتانی تردا رێکنەخەن، یان هانی نەدەن، یان یارمەتی ئەنجامدانی نەدەن و تیایدا بەشداریی نەکەن و چاوپۆشیی لەو چالاکییانە نەکەن کە لە خاکەکانیاندا رێکدەخرێن، بەمەبەستی ئەنجامدانیان یان هاندانیان. هەروەها هانی هەموو ولاتانی دا، بۆ ئەوەی رێوشوێنی کاریگەرو یەکلاکەرەوە بگرنەبەر، لە پێناوی بنبڕکردنی خێراو یەکجارەکی تیرۆری نێودەوڵەتی و، هەستن بە توێژینەوە لەو بارەوە، بەم شێوەیە[٣٤٨]:

---

[٣٤٧] سەبارەت بە پوەندیی لە نێوان تیرۆرو بازرگانی مادە بێهۆشکەرەکاندا، بڕوانە:

*International Terrorism organized by Ankara University Pres, 1984.*

[٣٤٨] برگەی جێبەجێکاریی ٤ لە بڕیارەکە.

أ-ڕێگەنەدان بە ئامادەکردن و ڕێکخستنی ئەو کارانەی کە دەخوازێت لەناو خاکەکەی، یان لەدەرەوەدا ئەنجام بدرێت، لە کاری تیرۆریستانەو وێرانکاری کە دژی وڵاتانی ترو هاووڵاتیانیان ئەنجام دەردێن.

ب-دابینکردنی دەستگیرکردن و دادگاییکردن و بەدەستەوەدانی ئەنجامدەرانی کارە تیرۆرییەکان.

ج-هەوڵدان بۆ بەستنی ڕێکەوتنامە تایبەتەکان، بۆ ئەم مەبەستە، بەشێوەی دوو قۆڵی و ئیقلیمی و چەند لایەنەوە.

د-هاوکاریی لە نێوانیایدا، لە گۆڕینەوەی زانیاریی پەیوەندیدار، سەبارەت بە ڕێگەگرتن لە تیرۆرو بنبڕکردنی.

ه-گرتنەبەری خێرای هەموو هەنگاوە پێویستەکان، بۆ جێبەجێکردنی ڕێکەوتنامە نێودەوڵەتییەکان، سەبارەت بەم بابەتە کە دەوڵەتان تیایدا دەبن بە ئەندام، بە گونجاندنی نێوان یاسا ناوخۆییەکان و ئەم ڕێکەوتنامانە.

کۆمەڵەی گشتی لە بڕیارەکەیدا، بە توندی داوای بەردانی خێراو بێ وەیی هەموو بە بارمتە گیراوەکان و ڕفێنەران کرد، لە هەر شوێنێك بن و لەلایەن هەر کەسێکەوە بە بارمتەگیرابن و، داوای لە هەموو وڵاتان کرد کە نۆرێنی سیاسی خۆیان بە کارببەن، بە پێی بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان و پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی بۆ بەدیهێنانی و ڕێگەگرتن لە ئەنجامدانی بە بارمتەگرتن و ڕفاندن. هەروەها نیگەرانیی خۆی دەردەبڕی، لەمەڕ زۆربوون و مەترسیی پەیوەندیی نێوان تاقمە تیرۆریستەکان و بازرگانانی مادده بێهۆشکەرەکان و چەکدارە نیمچە سەربازییەکانیان، کە پەنا دەبنە بەر هەموو جۆرە توندو تیژییەك و، بەمەش هەڕشە لە سستمی دەستوریی وڵاتان دەکەن و مافە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ پێشێل دەکەن. و داوای لە سکرتێری گشتی کرد کە بە پێی پێویست، لەمەڕ جێبەجێ کردنی ئەم بڕیاردانە بەدواداچوونی هەبێت و، لەم بارەوە ڕاپۆرتێك پێشکەش بە کۆمەڵەی گشتی بکات، لە خولی چل و هەشتەمیدا. و بڕیاریدا لە خشتەی کاتیی کارەکانیدا، لە خولی چل و هەشتەمدا، بڕگەیەك بەم ناونیشانە دابنێت(ئەو ڕێوشوێنانەی بۆ بنبڕکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی پێویستن).

# لێکۆڵینەوەی سێهەم

## لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار بە تیرۆری نێودەوڵەتی

بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، ژمارە ٣٠٣٤ی ١٨ی کانونی یەکەمی ١٩٧٢ لیژنەیەکی تایبەت، سەبارەت بە تیرۆری نێودەوڵەتی دامەزرا، بۆ تاوتوێکردنی ئەو تێبینییانەی دەوڵەتان پێشکەشی دەکەن، بەمەرجێك راپۆرتێك پێشکەش بە کۆمەڵەی گشتی بکەن، لەگەڵ ئەو راسپاردانەی دەبنەن هۆی رەخساندنی رێگەکانی هاوکاریی نێودەوڵەتی، لەپێناوی بنبڕکردنی خێرای ئەم کێشەیە[٣٤٩].

ئەو لیژنە تایبەتە لەبارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان لەماوەی نێوان ١٦ی حوزەیران تا ١١ی تەمموزی ١٩٧٣دا کۆبوونەوەو. لیژنەکە لەکۆبوونەوەی حەڤدەیەمی کە لە ١٣ی تەممووزدا بەسترا، بڕیاری پێکهێنانی سێ لیژنەی بچووکتری دا، یەکەمیان تایبەت بە پێناسەکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی و، دووەمیان تاوتوێی ئەو هۆکارانە بکات کە لەپشتی بلاوبوونەوەی دیاردەی تیرۆری نێودەوڵەتییەوەن و، سێهەم راسپێردرا، تا ئەو رێوشوێنانە تاوتوێ بکات کە پێویستن، بۆ رێگەگرتن و بنبڕکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی و. لیژنە تایبەتەکە

---

[٣٤٩] لیژنە تایبەتەکە لەسی و پێنج ئەندام پێکهات کە سەرۆکی کۆمەڵەی گشتی دایمەزراند، بەرەچاوکردنی دابەشکردنی عادیلانەی جوگرافی، بەپێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە ٣٠٣٤ کە لە ١٨ی کانونی یەکەمی ١٩٧٢دا دەرچوو. ئەندامانی لیژنەکە بریتیبوون لە: یەکێتی سۆڤیەت، نۆرگوای، ئێران، ئیتالیا، بەربادوس، پەنەما، تورکیا، چیکۆسلۆڤاکیا، تونس، جەزائیر، کۆماری ئۆکرانیای سۆشیالیستی سۆڤیەتی، تەنزانیا، سوریا، زائیر، زامبیا، سوید، گینیا، فەرەنسا، فەنزویلا، کەنەدا، کۆنگۆ، بەریتانیا، مۆریتانیا، نەمسا، نەیجیریا، نیکاراگوا، هایتی، هیند، مەجەر، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، یابان،یەمەنی دیموکراتی، یۆگسلاڤیا، یۆنان.

لەخولی بیست و هەشتەمدا، راپۆرتی خۆی پێشکەش بە کۆمەڵەی گشتی کرد[350]. بەهۆی کەمیی ماوە، کۆمەڵەی گشتی بەبێ دەنگدان بڕیاری‌دا تاوتوێکردنی راپۆرتەکە دوابخات بۆ خولی بیست و نۆهەمو[351] لە ١٥ی کانونی یەکەمی ١٩٧٦دا، کۆمەڵەی گشتی بڕیاری‌دا لیژنەی تایبەت بەتیرۆر بانگهێشت بکات، بۆ درێژەدان بەکارەکانی، بەپێی ئەو دەسەڵاتەی لەبڕیاری ژمارە ٣٠٣٤ی ١٨ی کانونی یەکەم ١٩٧٢ی کۆمەڵەی گشتی پێی درا[352].

لیژنە تایبەتەکە دەست بەکاربوو، لە نەتەوە یەکگرتووەکان لەماوەی نێوان ١٤-١٥ی مارتی ١٩٧٧، بۆ تاوتوێکردنی گرنگترین خاڵەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی، وەکو هەنگاوی یەکەمی بۆ پێشکەشکردنی راپۆرتەکەی بۆ کۆمەڵەی گشتی و. لەخولی‌سی‌ودووەمدا، لیژنەکە توێژینەوەیەکی تاوتوێ کرد کە ئەمانەتی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ئامادەی کردبوو، کە سەبارەت بەو هۆکارانەی لەپشتی دیاردەی تیرۆرەوەن[353] راو بۆچوونی دەوڵەتانی دەخستەڕوو. توێژینەوەکە خۆی لەقەرەی پێناسەکردنی تیرۆردا، لەگەل روونکردنەوەی ئەوەی کە تیرۆر سیفەتی نێودەوڵەتی وەردەگرێت، کاتێ ئامادەکاریی بۆ دەکرێت و رێکدەخرێت و دەست پێدەکات لە وڵاتێکی دیاریکراودا، بۆ ئەوەی لەوڵاتێکی‌تر روربدات، یان کاتێ ئەنجامدەرانی کارە تیرۆرییەکان لەوڵاتێکی تردا بن، جگە لەو وڵاتەی ئەو کردانەی تیادا روو دەدات، لەگەڵ پێشنیارکردنی رێوشوێنی کردەی بنبڕکردنی تیرۆر. بەڵام بەهۆی رێکنەکەوتنی لایەنە بەشداربووەکان لەکاری لیژنەکەدا، لەسەر چەند بیرۆکەیەکی دیاریکراو هاوبەش سەبارەت بەتیرۆر، سەرەڕای ئەو پێناسەیەی لەسەری رێکەوتوون بۆ مانای تیرۆرو ئەو دۆخ و

---

(٣٥٠) سەبارەت بەراپۆرتی لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار بە تیرۆرەوە، بڕوانە: بەڵگەنامە رەسمییەکانی کۆمەڵەی گشتی، خولی (٢٨) (١٩٧٣)، پاشکۆی ژمارە (٢٨) *(A/9028)*.

(٣٥١) بڕوانە: بەڵگەنامە رەسمییەکانی کۆمەڵەی گشتی، خولی ٢٩، پاشکۆی ٣١ *(A/9631)*، لاپەرە ٣٦٠.

(٣٥٢) بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە ٣١/١٠٢ کە لە ١٥ی کانونی یەکەمی ١٩٧٦دا دەرچووە.

(٣٥٣) بڕوانە: ئەو توێژینەوەیەی کە سکرتاریەتی گشتی سەبارەت بەتیرۆر ئامادەی کردووە.

هەڵسوڕاوییانە، کۆمەڵەی گشتی لە ١٦ی کانونی یەکەمی ١٩٧٧دا بڕیاریدا، بانگهێشتی لیژنە تایبەتەکە بکات، بۆ درێژەدان بەکارەکانیو، داوای لەسکرتێری گشتی کرد کە توێژینەوەیەکی شیتەڵکاری لەمەڕ تێبینییەکانی وڵاتان ڕەوانەی لیژنەکە بکات، داوای لە لیژنەکە کرد تاوتوێی ئەو تێبینیانە بکاتو ڕاپۆرتەکەی بنێرێت بۆ کۆمەڵەی گشتی لە خولی سیوچوارەمیدا، هاوپێچ لەگەڵ ڕاسپاردەکانی، سەبارەت بە ئەگەری بەرپاکردنی هاوکاریی، بۆ بنبڕکردنی ئەو کێشەیە[٣٥٤].

لەخولی سیوچوارەمی ساڵی ١٩٧٩دا، لیژنە تایبەتەکە هۆکارەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی تاوتوێ کردو، ئەو ڕێوشوێنانەی پێویستن، بۆ بەرەنگار بوونەوەی، ڕاپۆرتی خۆی پێشکەش بە کۆمەڵەی گشتی کرد، لەگەڵ ئەو ڕاسپاردەو پێشنیارانەی لەو مەسەلەیەدا[٣٥٥] بەگونجاوی دەزانن. سەبارەت بە هۆکارەکانی تیرۆر، لیژنەکە لە ڕاپۆرتەکەیدا، ئاماژە بە داگیرکاریو ڕەگەز پەرستیو دەستدرێژیو دەست تێوەردان، لەکاروباری ناوخۆی وڵاتانو توندوتیژیی بە کۆمەڵ کە بەهۆی دەرکردنی بەکۆمەڵیدانیشتوانەوە دەبێتو، داگیرکاریی بێگانەو کۆنترۆڵی بێگانە لەسەر سامانی سروشتی وڵاتە تازە پێگەیشتوەکانو نەبوونی عەدالەتی کۆمەڵایەتیو پێشێلکردنی مافی مرۆڤو برسێتیو هەژاریو ..هتد.

بەڵام سەبارەت بەڕێوشوێنە پێویستەکانی بنبڕکردنی تیرۆر، لیژنەکە داوای ڕێوشوێنی کردەییو هاوکاری کرد، لەپێناوی بنبڕکردنی خێرای کێشەی تیرۆر، بەهەرچی زووتری چوونی دەوڵەتان، بۆ ناو ڕێکەوتنامە نێودەوڵەتییەکان کەهەندێ لایەنی کێشەی تیرۆر چارەسەر دەکەنو، بەستنی پەیماننامەی دووقۆڵی

---

[٣٥٤] بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە ١٤٧/٣٢ کە لە ١٦ی کانونی یەکەمی ١٩٧٧دا دەرچووە، هەروەها بڕوانە:

*UN GAOR, Thirty- Second Session, Suppl. No. 37 (A/32/37), 1977 PP.1-5.*

[٣٥٥] لە ڕاپۆرتی لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار بەتیرۆر، بڕوانە: بەڵگەنامە ڕەسمییەکانی کۆمەڵەی گشتی، خولی ٣٤ (١٩٧٩). پاشکۆی ژمارە ٣٧ (*A/34/37*).

کەبڕگەی تایبەت بەدەستەوەدان یان دادگایی کردنی تیرۆریستە نێودەوڵەتییەکان لەخۆ دەگرێت.

کۆمەڵەی گشتیی پێشوازیی لەو ئاکامانەکرد کەلیژنە تایبەتە پەیوەندایدارەکە بەتیرۆری نێودەوڵەتییەوە، لەخولی ساڵی ١٩٧٩دا بەدەستی هێنا، ئەو راسپاردانەی رەچاو کرد کەلیژنەکە، سەبارەت بەرێوشوێنی عەمەلی بۆ هاوکاریی نێودەوڵەتیی پێشکەشی کرد، بۆ بنبڕکردنی خێرای کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتی و، داوای لەو وڵاتانەکرد کەهێشتا بەو کارە هەڵنەستاون، بچنەوە بەچوونە ریزی ئەو رێککەوتننامە نێودەوڵەتییانەی تایبەتن، بەلایەنەکانی کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتییەوەو، داوای لەسکرتێری گشتی کرد، لەمەڕ جێبەجێکردنی ئەم راسپاردانە، بەدواداچوونی هەبێت[٣٥٦].

لەخوارەوە، باس لەهەوڵەکانی لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار بەتیرۆری نێودەوڵەتی دەکەین، لەرێگەی ئەو ئاکامانەی لیژنەی بچووکەکان پێی گەیشتوون کەدانران بۆ پێناسەکردنی تیرۆرو تاوتوێکردنی ئەو هۆکارانەی لەپشتی ئەم دیاردەیەوەن و ئەو رێوشوێنە پێویستانە، بۆ رێگەگرتن و بنبڕکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی.

## یەکەم- لیژنەی تایبەت بە پێناسەکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی:

ئەم لیژنەیە لەماوەی ١-٢ی ئابی ١٩٧٣دا، کۆبووەوەو ئەو پێشنیارانەیان تاوتوێکرد کەوڵاتانی بێ لایەن و فەرنسا و یۆنان و هایتی و ئێران و نەیجیریا و فەنزویلاوە پێشکەشکرا[٣٥٧]و. هەندێ لەئەندامانی لیژنەکە (فەرەنساو جەزائیر) بەپێویستیانزانی کەتوێژینەوەیەکی قووڵ بکرێت، بۆ دیاردەکە کە دەکرێ لەرێگەیەوە بگەن بەپێناسەیەك بۆ تیرۆری نێودەوڵەتی، بەڵام هەندێ لایەنی‌تر

---

[٣٥٦] بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە ١٤٥/٣٤ کەلە ١٧ی کانونی یەکەمی ١٩٧٩دا دەرچووە.

[٣٥٧] بڕوانە:

*Report of Ad Hoc Committee on Internaional Terrorism, UN GAOR, Twenty-Eighth Session, Suppl. No.28(A/9028), NewYork,1973,P.11.*

(کەنەداو ویلایەتە یەکگرتووەکان) پێیان وابوو کەپێناسەکردنی دیاریکراوی تیرۆر پێویست نییەو، باشتروایە شێوازێکی عەمەلی دابنرێت، بۆ دیاریکردنی کردە تیرۆرییە هەرە ترسناکەکان، وەکو هەنگاوێك بۆ بەستنی چەند ڕێکەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی، بۆ ڕێگە گرتن و بنبڕکردنی ئەم کردانە، بەو جۆرەی کە بەکار هێنرا، لە ئامادەکردنی ڕێکەوتنامە تایبەتەکان بەفڕۆکەوانی مەدەنی.

هەندێ لە ئەندامانی لیژنەکە پێیان وابوو کە لەم چوارچێوەیەداو پێناسەی ئەو مەرجانە پێویستە هەبن، بۆ ئەوەی کاری تیرۆر ببێت بە نێودەوڵەتی، ، هەندێ پێیان وابوو کە کاری توندوتیژی کە هۆکاری سیاسی یان ئابووری یان کۆمەڵایەتییان لەوپشتەوەیە، لەلایەن هەندێ کەس لەناو دەوڵەتێکدا، کە ناکرێ بەکاری تیرۆری نێودەوڵەتی دابنرێت، چونکە دەچێتە قاڵبی کاروباری ناوخۆیی دەوڵەتی پەیوەندیدارەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێ پێیان وابوو کە کاری تیرۆری ناوخۆ گەلێ جار ئاسەواری نێودەوڵەتییان لێدەکەوێتەوە، بۆیە ئەوە دەکەوێتە ناو چوارچێوەی ئەو ڕێوشوێنە نێودەوڵەتییانەی تایبەتن بە بنبڕکردنی ئەم دیاردەیە.

لیژنەکە بابەتی هاندەری ئەنجامدانی کردەکانی تیرۆری تاوتوێکردو. هەندێ پێیان وابوو، ئەو تیرۆرەی کە هاندەری کەسی لەپشتەوەیە، یان ئەوەی ئەنجام دەدرێت، بەمەبەستی بەدەستهێنانی سوودێکی کەسی بخرێتە چوارچێوەی ئەو کارانەی کە دەبێ قەڵاچۆبکرێن، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی‌دا. لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێ پێیان وابوو کە ئەم جۆرەکارانە، ناکەونە ناو چوارچێوەی ئەو کارانەوە کە دیاری کراون بۆ لیژنەکە، چونکە ئەو تاوانانە کە یاسای گشتی لەناو ڕێسا ناوخۆییەکاندا، سزای بۆ دیاری کردووە، کاری لیژنەکە سنووردار دەکات، بۆ پێناسەکردنی ئەو کارە تیرۆرییانەی هاندەری سیاسییان لەپشتەوەیە.

هەندێ لەئەندامانی لیژنەکە، ئاماژەیان بەوە کرد کە هەر پێناسەیەك کە لەچوارچێوەی لیژنەکەدا پێی بگەن، دەبێ زیان بەمافی گەلان، کە دیاریکردنی چارەنووس نەگەیەنێت و، هەروەها دەبێ جیاوازیی هەبێت، لەنێوان ئەو خەباتەی کە بزاوتە ڕزگاریخوازە نیشتمانییەکان ئەنجامی دەدەن و لەنێوان تیرۆری

نێودەوڵەتیدا، کاری خەباتی ئەو بزاوتانە بە تیرۆریزم لەقەڵەم نەدرێت و، جەختکردنی لەسەر مافەکانیان، بۆ بەکارهێنانی ئەو شێوازانەی بۆیان رەخساوە- بەهێزی چەکداریشەوە- بۆ گەیشتن بە دیاریکردنی چارەنووس و رزگارکردنی خاکە داگیرکراوەکەیان.

سەبارەت بەو تیرۆرەی کە دەوڵەتان پراکتیزەی دەکەن، هەندێ پێیان وابوو کاری توندوتیژی کە بەفراوانی لەلایەن دەوڵەتانەوە ئەنجام دەدرێت دژی گەلەکەیان، بەمەبەستی کۆنترۆڵ کردنیان، یان دەستتێوەردان لەکاروباری ناوخۆیان و، بەکارهێنانی هێزی چەکدار بۆ تۆڵەسەندنەوە، یان بەرگریی خۆپاراستن کە دەوڵەتێك پێی هەڵدەستێت دژی ئاسایشی دەوڵەتێکیترو، ناردنی گروپە تیرۆریستەکان بۆ قەڵەمڕەوی وڵاتێکیتر، بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی ترس و دڵەڕاوکێ لەنێوان هاوولاتییانداو رووخاندنی دەسەڵاتە سیاسییەکان، دەبێ هەموویان بچنە قاڵبی پێناسەکردنی تیرۆرەوە، لەبەر ئەوەی ترسناك و گەورەترن، لەهەر شێوازێکی تری تیرۆرو، هەندێکیتر پێیان وابوو کە پێویستە لیژنەکە، هەوڵەکانی چڕبکاتەوە، سەبارەت بەکارەکانی توندوتیژی کە دژی تاکەکان یان تاقمێك لەتاکەکان ئەنجام دەدرێت، کە نابێ دەستتێوەردانی نێودەوڵەتی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، بچێتە چوارچێوەیەوە.

ئەم تاقمە پێیان وابوو کە جاڕنامەی تایبەت بە پەیوەندیی دۆستانەی نێوان دەوڵەتان، زۆربەی لایەنەکانی توندوتیژیی نێوان دەوڵەتان دەگرێتەوەو، پرەنسیپی قەدەغەکردنی پەنابردنەبەر بەکارهێنانی هێزو، پرەنسیپی یەکسانی لەمافی نێوان گەلان و، جێبەجێکردنی پابەندبوونەکان، بەرێکوپێکی رێگەی پێدەگرن و، چیتر گونجاو نییە جارێکیتر گەڕانەوە، بۆ تاوتوێکردنی ئەم مەسەلانە هەروەها ئەم ئاراستەکردنە رایانگەیاند کە ئەو کارانەی ئەنجام دەدرێن، لەلایەن هێزە چەکدارەکانەوە، لەکاتی کردە سەربازییەکاندا، دەکەوێتە ژێر کاریگەریی چەندین بنەمای نێودەوڵەتییەوەو، هەروەها لە چوارچێوەی مافی مرۆڤ دا، تاوتوێ دەکرێت لەکاتی کێشە چەکدارییەکانداو پێویست ناکات بخرێتە چوارچێوەی کارە تیرۆرییەکانەوە.

## دووەم- لیژنەی تایبەت بەتاوتوێکردنی ئەوهۆکارانەی، لە پشت تیرۆری نێودەوڵەتییەوەن:

ئەم لیژنەیە لەماوەی ٣-٦ی ئابی ١٩٧٣دا کۆبووەوە[٣٥٨] لیژنەکە هەموو لایەنە جۆراوجۆرەکانی کارەکەی تاوتوێ کرد، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندیی هەبوو بە گرنگیی تاوتوێکردنی ئەو هۆکارانەی لەپشتی تیرۆری نێودەوڵەتین و پەیوەندیی نێوان ئەم هۆکارانەو پێویستی گرتنەبەری ڕێوشوێنەکان، بۆ ڕێگەگرتن لەکارەکانی تیرۆر کە ژیانی بێ تاوانان رووبەرووی مەترسی دەکاتەوەو، لیژنەکە لەناوخۆیدا تاوتوێکردنی سروشتی ئەو ئەرکەی کەوتۆتە ئەستۆی و، ئەو بارودۆخە جۆراوجۆرانەی، بۆ تیرۆری نێودەوڵەتی، هۆکاری سەرەکی پێکدەهێنن.

هەندێ لەشاندەکان پێیان وابوو کە پێویستە تاوتوێی ڕێگەچارە ئاشتیخوازو عایدیلانەکان بکرێت کە دەکرێت لەڕێگەیانەوە ئەو هۆکارانە بنبڕ بکرێن کە لەپشتی دیاردەی تیرۆری نێودەوڵەتییەوەن. ئەو پێشنیارەی کە کۆمەڵەی وڵاتانی بێلایەن پێشکەشی لیژنەکەیان کرد، جیاوازیی دەکات لەنێوان تیرۆری تاك و تیرۆری دەوڵەت و تیرۆری ئاراستەکراو دژی دەوڵەتان. پێشنیارەکە پێی وایە کە تیرۆری تاك سەرچاوەی خۆی لەفاکتەرە کۆمەڵایەتی و دەروونی و بۆماوەییەکانەوە دەگرێت و تاوتوێکردنی ئەم هۆکارانە، ناچێتە چوارچێوەی کاری لیژنەکەوە[٣٥٩].

بەڵام تیرۆری نێودەوڵەتی کە لەزیندانی بەکۆمەڵ و پراکتیزەکردنی ئەشکەنجەو قەتلوعامدا خۆی دەبینێتەوە، کاری تۆڵەسەندنەوەو پەلاماردانی دانیشتوانی

---

[٣٥٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤.

[٣٥٩] نوێنەری جەزائیر لە لیژنەی تایبەت بەدیاریکردنی هۆکارەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی، پێشنیارێکی پێشکەش کرد کە تیایدا هاتووە:

*motivations of individual terrorism is a Subject for Study in Sociology, Psychlogy, gentics and other Contemporary human Sciences. Its Study is to within the term of reference of the Ad Hoc Committee.*

بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣-٢٤.

مەدەنی و، وێرانکردنی ژێرخانی ئابووری، ولاتان بەمەبەستی هێنانەدی نۆرێنی داگیرکاریی پەنای پێدەبەن و، پراکتیزەکردنی جیاوازیی رەگەزی، یان داگیرکاری بێگانەیان، بۆ لەناوبردنی ویستی گەل، یان بۆ ئەوەی بخرێتە ژێر رکێفی سیاسەتێکی دیاریکراوەوە، یان قۆستنەوەی سەرچاوەو سامانەکانی، بەجۆرێ کە لەگەل بەرژەوەندییە تایبەتەکانیدا یەکنەگرێتەوە، بەلام تیرۆری ئاراستەکراو دژی دەوڵەتان، تاقمێکی کۆمەڵایەتی پێی هەڵدەستن، کاتێ کە لەمافەکانیان بێ بەری دەبن، یان کاتێ دەبنە قوربانیی سستەمە ئابووری، کۆمەڵایەتی یان سیاسییە ناڕەواکان، یان کاتێ کە شێوازە یاساییەکان لەبەدیهێنانی عەدالەتدا نوشست دەهێنن.

پێشنیارەکە ئاماژە بەوە دەکات کە یەکێك لەو هۆکارانەی دەبنە هۆی توندوتیژی دژی دەوڵەتێك، هێشتنەوەی گەلێکە لەژێر دەسەلاتی داگیرکارییدا، یان دەرکردنی گەلێکە لەنیشتمانەکەیدا، یان پراکتیزەکردنی سیاسەتێکی رەگەز پەرستانەیە یان دەستێوەردانی بێگانەیە لەسیاسەتی ولاتێك دا، یان سوود وەرگرتنی لەسامانەکەی، یان دەستدرێژیی بێگانەیە لەدژی، یان بایەخنەدانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، بەشێوازەکانی ستەمکاری کە دانیشتوان بەدەستییەوە دەناڵێنن و، بێتوانایی رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، لە گێڕانەوەی مافە رەواکانی دانیشتوان، نیشاندەدات.

هەندێ لەشاندەکان (سوریاو تەنزانیا) پێیان وابوو کە پەیوەندییەکی بەرپا هەیە، لەنێوان تاوتوێکردنی ئەو هۆکارانەی لەپشتی تیرۆرەوەن و ئەو رێوشوێنانەی کەدەبێ بگیرێنەبەر دژی تیرۆرو، تاوتوێکردنی هۆکارەکان پێش مەرجێکە بۆ ئەو رێوشوێنانەی کەدەبێ بگیرێنەبەر بۆ بنبڕکردنی.

بەلام هەندێکیتر لەشاندەکان(سویدو یابان) پێیان وابوو کە دەبێ جیاوازی بکرێت، لەنێوان ئەو هۆکارانەی هانی تیرۆر دەدەن و. ئەو رێوشوێنانەی کە دەگیرێنەبەر بۆ بنبڕکردنی. هۆکارەکانی تیرۆر ئاڵۆزن و بەرفراوانن و دەبێ بۆماوەی درێژخایەن رەچاو بکرێن، چونکە ئاسان نییە بەتەواوی و یەکسەرە چارەسەر بکرێت. بەلام کارە تیرۆرییەکان کە گیانی بێتاوانان لەناو دەبات، دەبی کار بکرێن

بۆ بنبڕکردنیان و چاوەڕێی ئەوە نەکرێت تا هۆکارەکانیان بنبڕبکرێن. ڕێوشوێنی ڕێگەگرتن لە تیرۆر خۆی دەسەپێنێت بەوەی کە ڕێوشوێنی خێران دەبێ لە ئەنجامدانیاندا دواخستن نەبێت. ئەو وڵاتانەی ڕێوشوێنی ناوخۆیی دەگرنەبەر، بۆ پاراستنی هاووڵاتییان دژی تاوانکارییەکان. بەبێ چاوەڕێ کردن، تا ئەو هۆکارانە تاوتوێ بکرێن کە دەبنە هۆی ئەنجامدانی ئەو تاوانانەو. هەندێکی‌تر پێیان وابوو کە دەبێ ڕاسپاردەکان دابڕێژرێن، سەبارەت بەو ڕێوشوێنانەی کە دەبێ بگیرێنەبەر، بۆ بەرەنگار بوونەوەی کارە تیرۆرییەکان، بەتایبەتی ئەوانەی کە کۆمەڵەی نێودەوڵەتی ناتوانن چاوپۆشی لێبکەن، یان پەسەندی بکەن، وەك دەست درێژی کردنەسەر ئەندامانی باڵیۆزخانەو کەسانی دبلۆماسی و، ڕفاندنی فڕۆکەی مەدەنی و گۆڕینی ڕەوتییان و بە بارمتەگرتنی سەرنشینانی.

## سێهەم- لیژنەی تایبەت بەتاوتوێکردنی ڕێوشوێنەکانی ڕێگەگرتن لە تیرۆری نێودەوڵەتی:

ئەم لیژنەیە لەماوەی ٧-١٨ی ئابی ١٩٧٣دا کۆبووەوەو، ئەو پێشنیارانەیان تاوتێکرد کە کۆمەڵەی دەوڵەتانی بێلایەنی پێشکەشیان کردو، ئەوانەی کە لەلایەن ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکاو بەرتانیاو نایجیریاو ئێرلەندای باکوورو ئۆرگوای خرابوونەروو[٣٦٠].

دوو لایەن لەنێوان ئەندامانی لیژنەکەدا دەرکەوت، یەکەم پێی وایە کە ڕووداوەکانی تیرۆر کە ڕوویدا، لەکاتی دەرچوونی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ژمارە ٣٠٣٤کە گەلێ لەبێ تاوانان دەکات بەقوربانی، وا دەخوازێت ڕێوشوێنی چالاك بگرێتەبەر، بۆ ڕێگەگرتن و بنبڕکردنی کاری تیرۆری نێودەوڵەتی و. ئەم لایەنە (یەکێتی سۆڤیەت) بانگەشەی کرد بۆ پێویستی گرتنەبەری ڕێوشوێنی بنبڕکردنی، لەڕێگەی ڕێکەوتننامەیەکی نێودەوڵەتییەوە کە بۆ ئەم مەبەستە ئامادە دەکرێت و ئەم جۆرە ڕێوشوێنانە، دەبێ زیان بەمافی گەلان لە دیاریکردنی

---

[٣٦٠] بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨.

چارەنووسدا نەگەیەنێت، یان زیان بە جارنامەی تایبەت بە پێوەندیی دۆستانەی نێوان دەوڵەتان نەگەیەنێت و، کار بۆ ئەوە بکات، رێگە نەدرێت بەتەشەنەکردنی توندوتیژی بۆ دەرەوەی سنووری کێشەکە، هەروەها دەبێ لەسەر پرەنسیپی بەدەستەوەدان، یان سزادان بێت و. نوێنەری نایجیریا بڕوای خۆی راگەیاند، بەوەی پێویستە لیژنە تایبەتەکە راسپاردەیەك بەرز بکاتەوە، بۆ کۆمەڵەی گشتی و تیایدا داوای لێبکات ئیدانەی ئەو کارە توندو تیژانە بکات کە هەڕەشە لەگیانی بێتاوانان دەکات و لەناویان دەبات و، هەندێ لەشاندەکان پێیان وابوو، پێویستە چەندین رێکەوتنامەی نێودەوڵەتی ببەسترێت و هەریەکەیان بەشێك لەو کارە تیرۆرییانە چارەسەر بکات، وەکو رفاندنی دبلۆماسییەکان و ناردنی ئەو نامانەی ماددەی تەقینەوەیان تێدایەو. هەندێکیان ئەوەیان وەبیرهێنایەوە کە رێوشوێنی ئیداری و یاسایی گرنگن کە تیرۆری نێودەوڵەتی و. هەندێکیتر پێشنیاری ئەوەیان کرد کە هاوکاریی دوو قۆڵی و ئیقلیمی، بۆ بنبڕکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی بەهێز بکرێت.

راستییەکیتر پێی وابوو کە مەسەلەی گرتنەبەری رێوشوێنی دژ بەتیرۆر، پەیوەندییەکی پتەوی بە بابەتی پێناسەکردنی تیرۆرو دیاریکردنی ئەو هۆکارانەوە هەیە کە لەپشتیەوەن و. ئەم تاقمە پێیان وابوو، هیچ رێوشوێنێکی ئەوتۆ نەگیرێتەبەر بۆ رێگەگرتن لەتیرۆری نێودەوڵەتی، بەر لەگەیشتن بەپێناسەیەکی ئەو دیاردەیە کە لەلایەن هەمووانەوە پەسەندبێت و، دیاریکردنی ئەو هۆکارانەی دەیخولقێنن. هەر لەم بارەوە، هەندێ لە شاندەکان داوای کۆتایی هێنان بە داگیرکاری و دەستێوەردان لەکاروباری ناوخۆی وڵاتان و، بەخشینی مافی سەربەخۆیی سیاسی و ئابووری بۆ گەلانی ژێردەستەو، نەهێشتنی جیاوازیی رەگەزی و. جەختکردن لەسەر مافی گەلان لەدیاریکردنی چارەنووسیان کرد کە ئەمانە دەبنە هۆی، خۆبەخۆی بنبڕبوونی هەموو شێوازەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی.

لەو مشتومڕانەی کە لەنێوان سێلیژنەدا روویان دا، روون دەبێتەوە کە چەند دەوڵەتان بیرو بۆچوونی جیاوازیان هەیە، لەسەر پێناسەکردنی تیرۆرو ئەو

هۆکارانەی لەپشتییەوەن‌و ئەو رێوشوێنانەی کە دەبێ بگیرێنەبەر، بۆ ،رێگەگرتن لێی‌و. لیژنەی تایبەت بەتیرۆری نێودەوڵەتی لەدانیشتنی ١١ی ئابی ١٩٧٣دا، بڕیاریدا کە راپۆرتێك ئامادە بکات تیایدا کۆمەڵەی گشتی ئەو مشتومڕانە بخاتەروو کە لەناو هەرسێ لیژنەکەدا کران‌و لیژنەکە نەیتوانی بگات بەچەند بڕیارێکی دیاریکراو کە لەسەری رێك بکەون، لەنێوان ئەندامانیاندا، سەبارەت بەو ئەرکانەی خراونەتە ئەستۆی‌و، راپۆرتەکەیان تەنیا پێشنیاری رێوشوێنی عەمەلی لەخۆگرتبوو، لەپێناوی بنبڕکردنی خێرایی کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتی، لەگەڵ راسپاردەی کۆمەڵەی گشتی، بۆ تاوتوێکردنی وردی ئەو پێشنیارانەو، دەکرێ ئەوەی لە راپۆرتی لیژنەکەدا هاتبوو، سەبارەت بەرێوشوێنی رێگەگرتن لە تیرۆری نێودەوڵەتی، بەم جۆرە چڕبکەینەوە:

١. ئیدانەکردنی بێ‌یەك‌و دووی هەموو کارە تیرۆرییە نێودەوڵەتییەکان لەلایەن کۆمەڵەی گشتییەوە کە ژیان‌و گیانی مرۆ دەخەنە مەترسییەوە، یان لەناوی دەبەن، یان هەڕەشە لە ئازادییە بنەڕەتییەکانی دەکەن.

٢. هاندانی هەموو وڵاتان، بۆ بەشداریکردنی تاك یان لەڕێگەی هاوکاریی لەگەڵ وڵاتانی تردا، یان داموو دەزگاکانی نەتەوە یەکگرتووەکانی پەیوەندیدار، بۆ بنبڕکردنی وردەوردەی ئەو هۆکارانەی، لەپشت تیرۆری نێودەوڵەتییەوەن.

٣. داوا لە دەوڵەتان بکرێت پابەندبن بەخاڵەکانەوە، بەپێی یاسای نێودەوڵەتی، بۆ رێگەگرتن لە رێکخستنی کاری شەڕی ناوخۆ، یان شەڕی تیرۆر، لەوڵاتێکی تردا، یان هاندان بۆی، یان یارمەتیدان، یان بەشداریکردن تیایدا یان رێگەدان بەرێکخستنی چالاکییەکان لەناو قەڵەمڕەوەکەیدا کە بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە کارانە ئاراستە دەکرێن.

٤. هاندانی هەموو وڵاتان بۆ هاوکاریی تەواو، بەتایبەتی لەڕێگەی ئاڵوگۆڕکردنی ئەوەی پەیوەندیی بەو بابەتەوە هەبێت لە زانیاری پەیوەندیدار بەرێگەگرتن‌و بنبڕکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی‌و، بەستنی پەیماننامەی تایبەت، یان دابین کردنی رێکەوتننامەی دوو قۆڵی پەیوەندیدار بە بڕگەی تایبەت، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندیی هەیە بە بەدەستەوەدان، یان دادگایکردنی تیرۆریستییە نێودەوڵەتییەکان.

٥. بانگەشەی ئەو وڵاتانەی کە ئەو کارەیان ئەنجام نەداوە کە بین بەلایەن لەڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییە بەرپاکاندا، کە پەیوەندییان، بەلایەنە جۆراوجۆرەکانی کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتییەوە هەیە.

٦. کۆمەڵەی گشتی پێویستە بەستنی ڕێکەوتننامە، یان ڕێکەوتننامە سەربارەکان تاوتوێ بکات کە پەیوەندییان بە پرەنسیپی بەدەستەوەدان، یان دادگایکردن، بۆ بنبڕکردنی کارەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی هەیە کە هێشتا لەو ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییە لێکچووەکان نەبێت. لەم بارەوە دەکرێت تاوتوێی ئەوە بکرێت برگەی لێکچوو بخرێتە ناو ئەو ڕێکەوتننامانەوە- بەراست کردنەوەو ئەگەر پێویستی کرد- وەکو ئەو برگەیەی لەڕێکەوتننامەی ساڵی ١٩٧٩ بنبڕکردنی بە بارمتەکردندا هاتووە، ئاماژە بەو گەلانە دەکات کە دژی دەسەڵاتی داگیرکەران و دەسەڵاتە ڕەگەز پەرستەکانی دەجەنگن.

٧. کۆمەڵەی گشتی و ئەنجومەنی ئاسایش، لەپێناوی بەشداریکردن لە بنبڕکردنی ئەو هۆکارانەی لەپشتی کێشەی تیرۆری نێودەوڵەتییەوەن، بایەخێکی تایبەت بدەن بە هەموو ئەو حاڵەتانە، بەداگیرکردن و ڕەگەز پەرستی و ئەو حاڵەتانەش بەهۆی داگیرکاری بێگانەوە ڕوو دەدەن و، هەر حاڵەتێکی تر کە دەبێتە هۆی تیرۆری نێودەوڵەتی.

جێی ئاماژە بۆکردنە کە کۆمەڵەی گشتی تاوتوێکردنی ئەو ڕاپۆرتەی دواخست کە لیژنە تایبەتەکە لەخولی بیست و نۆیەمدا خستییەروو، دواتر بۆ خولی سێهەم دوایخست. لە ١٥ی کانونی یەکەمی ١٩٧٦دا، کۆمەڵەی گشتی بڕیاری دا داوا لە لیژنەی تایبەتی پەیوەندیدار بەتیرۆرەوە بکات، بۆ درێژەدان بەکارەکانی بەپێی ئەو دەسەڵاتەی لەبڕیاری کۆمەڵە ژمارە ٣٠٣٤ پێیدرا.

# بەشی پێنجەم
# لایەنە یاساییەکانی تاوانی تیرۆری نێودەوڵەتی

لە خستنەڕووی هەوڵەکانی کۆمەڵەی گشتی، لەپێناوی نەهێشتنی دیاردەی توندوتیژی لەژینگەی نێودەوڵەتییدا، دەردەکەوێت کە نەتەوە یەکگرتووەکان، پێشکەوتنی ئەوتۆی بەدەست نەهێناوە، لەمەڕ پێناسەکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی، یان گەیشتن بەڕێکەوتنێك، سەبارەت بەچۆنیەتی رووبەروو بوونەوە لەگەڵ کردە تیرۆرییەکان و نەهێشتنیان. بڕیارە پەیوەندییدارەکانی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان کە، چەندین پەراگرافی گشتییان تێدایە، و ناکرێ لەڕێگەیانەوە، دارشتنێکی هاوبەش گەڵاڵە بکرێت، بۆ دیاریکردنی ئەو رێوشوێنانەی کە دەبێ ئەنجام بدرێ، بۆ جیاوازیی توند لەنێوان بۆچوونی دەوڵەتاندا، سەبارەت بەلایەنە یاساییەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی و، رێکنەکەوتنیان لەسەر ئەو توخمانەی کە تاوانەکە پێکدەهێنن.

با ئاماژە بەو تەنگژانە بکەین کە رێگە لە دارشتنی پێناسەیەکی دیاریکراوی تیرۆری نێودەوڵەتی و، هەوڵە زانستییەکان بۆ پێناسەکردنی ئەم دیاردەیە دەگرن، دواتر بیرۆکەی خۆمان، سەبارەت بە تیرۆرو ئەو پێناسەیە دەخەینە روو، کە بۆ تاوانی تیرۆری نێودەوڵەتی پێشنیاری دەکەین.

## بابەتی یەکەم
## دانانی پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ تیرۆری نێودەوڵەتی کارێکی ئاسن نییە

لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییدا، سەبارەت بە پێناسەکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی بۆچوونی جیاواز هەیە، سەرەڕای ئەوەی کە کردە تیرۆرییەکان، هەڕەشەی بۆ سەر ئاسایش و ئارامیی و سەقامگیربوونی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و، وەرسکردنێکی ترسناکە بۆسەر هەست و سۆزە مرۆڤایەتییەکان و ویژدانی جیهانی و، یەکێکە لە فاکتەرەکانی ئاڵۆزیی، لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا، کەوا دەکەن، ئەو کردانە بەچاوی تاوانی نێودەوڵەتیی دژی ئاسایش و ئاسوودەیی مرۆڤایەتی تەماشا بکرێن، بەڵام هێشتا جیاوازییەکی گەورە لە راو بۆچوونی دوو دەوڵەتە، زلهێزەکە*، سەبارەت بەپێناسەی تیرۆری نێودەوڵەتیدا هەیە.

لەو مشتومڕانەی نێوان ئەو لیژنانە کە نەتەوە یەکگرتووەکان پێکیانی هێنا، بۆ تاوتوێکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی، دەرکەوت کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. بەپاڵپشتی وڵاتانی بلۆکی رۆژئاوا، هەوڵدەدات پێناسەی تیرۆری نێودەوڵەتی بکات، بەجۆرێ کە خەباتی چەکدارانەی بزووتنەوە رزگاریخوازە نیشتمانیەکان بگرێتەوە، لەچوارچێوەی پراکتیزەکردنی مافی خۆیان، لە دیاریکردنی چارەنووسدا. بەڵام وڵاتانی بلۆکی رۆژهەڵات، بەسەرۆکایەتی یەکێتی شۆڤیەت پێی وایە کە تیرۆری راستەقینە، تیرۆری دەوڵەتە، واتە ئەو جۆرە لەتیرۆر کە دەوڵەتێك دژی دەوڵەتێکی‌تر، لە رێگەی بەکرێ گیراوەکانیەوە ئەنجامی دەدات[٣٦١].

---

* مەبەست ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو یەکێتی سۆیەتی جارانە کە لەسەردەمی شەڕی سارد دا بەدوو زلهێزەکە ناو دەبران (وەرگێڕ).

[٣٦١] بڕوانە:
. Cit, p.11.

ململانێی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو یەکێتی سۆڤیەت، لەبواری پێناسەکردنی تیرۆردا توندوتیژتر دەبێت، دەبینین ویلایەتە یەکگرتووەکان، زاراوەی وا بەکار دەبات، بەوەی ئایدۆلۆژی پەتیەو یەکێتی سۆڤیەت بەوە تاوانبار دەکات کە یارمەتی تیرۆریستەکان دەدات[٣٦٢] لەولاشەوە یەکێتی سۆڤیەت، ولاتە یەکگرتووەکان تاوانبار دەکات، بەوەی بەگژی بزووتنەوەکانی رزگاریخوازیی نیشتمانیدا دەچێتەوە، لەرێگەی ئاراستەکردنی گورزی لەباربەر، لەشێوەی کردەی تیرۆریزمیدا کە بەکرێ گیراوەکانی لە سەرانسەری ولاتاندا ئەنجامی دەدەن و دژی بزووتنەوەکانی رزگاریخوازیی نیشتمانی، لەچوارچێوەی ئەو دوژمنایەتیەی، بەرامبەر بەهێزە سۆشیالیستە ئازادیخوازو پێشکەوتنخوازەکان ئەنجامی دەدەن، یەکێتی سۆڤیەت ئەو رەفتارانەی ئەمریکا بەتیرۆری(راستڕەو) ناو دەبات، واتە ئەوەی کە هێزە راستڕەوەکان، بەسەرکردایەتی ولاتە یەکگرتووەکان دژی چەپی رزگاریخوازو شۆڕشگێڕ ئەنجامی دەدات[٣٦٣].

جیاوازیی لەنێوان راو بۆچوونی ویلایەتە، تەنیا لەمپەر نییە، لە بەرامبەر گەیشتن بەپێناسەیەکی دیاریکراوی تیرۆری نێودەولەتی، چەندین تەنگژەی تر هەن کە خۆیان زۆر لە هاندەرەکان دەکەن بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانەو جۆراوجۆری شێوازو وێنەکانی کردە تیرۆرییەکان، جگە لەجیاوازیی بۆچوونی یاسای نێودەولەتی تاوانکاری، بۆ دیاردەی تیرۆر، لەتێڕوانینی یاسا تاوانکارییە ناوخۆییەکانی ولاتە جۆراوجۆرەکانەوە.

---

[٣٦٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣-٤٤.

[٣٦٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠-٤٣، لەم بارەوە زانایانی سۆڤیەت، ئەم بڕیارەیان داوە:

*emocracy and Social progress. It has always been used, and is being used more than at any time befor, by the reactionary forves of forves of imprialist states, both insideand outtside these Countries, against the national liberation morement. Fighting against socialist Countres, the international Communist and Working- Class movement is one of the top priorities of right- wing terrorism.*

**یەکەم- هاندەرانی تیرۆری نێودەوڵەتی و هۆکارەکانی:**

چەندین هۆکارو هاندەری تیرۆری نێودەوڵەتی هەن، کە گەلێ جار ئاسان نییە بەوردی کۆبەند بکرێن، بۆ دیاریکردنی ئەو هۆکارانەی لەپشتی هەڵکشانی کردە تیرۆرییەکانەوەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، دەکرێت هاندەرەکان و هۆکارەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی بۆ ئاراستەکارییە سەرەکییەکانی پۆلێن بکرێن، کە گرنگترینیان هاندەری سیاسی و ئابووری و هاندەری راگەیاندنن.

زۆربەی کردە تیرۆرییەکان و کردەکانی توندوتیژی، گەلێ جار چەند هاندەرێکی سیاسی لەپشتییانەوەیە، لەوانە دەستەبەرکردنی مافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلان، یان بەرەنگاریی داگیرکاری، یان رەتکردنەوەی بیرۆکەی رەگەزپەرستی و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ، یان راکێشانی سەرنجی رای گشتی جیهان، بۆ کێشە یان دۆخێك کە تایبەت بێت بەگروپێکی رەگەزییەوە، یان دەربڕینی ناڕەزامەندی لەسەر سیاسەتی ناعادیلانە کە دەسەڵاتی دەوڵەت دژی هاووڵاتییانی خۆی دەیگرێتەبەر. ئەو کردە تیرۆرییانەی کە هاندەری سیاسی لەپشتەوە بێت، کە سەرەنجام مەبەستی ئەوەبێت دەسەڵاتی دەوڵەت ناچار بکات، بڕیارێکی دیاریکراو بگرێتەبەر کە ئەنجامدەرانی کردەی تیرۆریی بەدەستەبەرکەری بەرژەوەندیی ئەو گروپەلێکیبداتەوە کەسەر بەون، یان لەگەڵ خواستەکان و ئامانجە سیاسیەکانییدا یەکدەگرێتەوە، هەروەها رەنگە کردە تیرۆرییەکان، بەمەبەستی زیان گەیاندن بێت بە بەرژەوەندیی وڵاتێکی دیاریکراو، یان هاووڵاتیانی، بەهۆی هەڵوێستی سیاسییان لەبەرامبەر کێشەیەکی دیاریکراودا.

رەنگە هاندەر لەپشتی کردە تیرۆرییەکانەوە، گەیاندنی ژیان بێت لە ئابووریی دەوڵەتێکی دیاریکراو، وەکو رووخاندنی دامەزراوە پیشەسازی یان بازرگانییەکانی، یان پەلاماردانی نووسینگەکانی کۆمپانیاکانی فڕۆکەوانی، یان دامەزراوە گەشت و گوزارییەکانی دەوڵەتێك، بەمەبەستی وروژاندنی ترس و دڵەڕاوکێ، لەنێوان ئەوانەی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن.

ئەم کردانە بەو مەبەستە ئەنجام دەدرێن کە زیانی ماددی لەو دامەزراوانە بدەن بەوەی کە سەرچاوەی ئابووری و داهاتی دەوڵەتن. رەنگە هاندەری ئابووری لەوەدابێت کە تاقمێکی تیرۆریست نیازیان بە کۆمەکی ماددی هەبێت، بۆ ئەوەی

گەیشتن بەو ئەنجامانەی لەپێناوی دەستەبەرکردنیان بەدیهاتوون، درێژە بەکردەوەکانیان بدەن.

گەلێجار بۆ دەستەبەرکردنی ئامانجەکانی، تیرۆر پشت بەتوخمێکی گرنگ دەبەستێت، ئەویش بڵاوکردنەوەی ئەو بیرۆکانەیە کە لە پێناویاندا کار دەکات (*Publicity of the Cause*)و خستنە رووی لەبەرامبەر رای گشتی جیهانی و رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان، بۆ دەستەبەرکردنی پشتگیریکردنی وکۆمەککردنی[٣٦٤]. رەنگە رێکخراوێکی شۆرشگێر هەست بەوە بکات کەپشت گوێ خستنێك هەبێت، لەلایەن رای گشتییەوە، سەبارەت بەکێشەکەی، بۆیە پەنا دەباتەبەر هەندێ کردەی تیرۆریی بزوێنەر، بەمەبەستی راکێشانی سەرنجی جیهان ئەو کێشەیەی بەرگری لێدەکات و، دروستکردنی جۆرێ لەهاوسۆزی، لەگەڵ ئەوانەدا کە بەرگری لێدەکەن و، ناچارکردنی حکومەت و دەوڵەتان، بۆ دانان بە رەوایی و دادپەروەریی ئەوداو بایەخدان پێی، لەسەر ئاستی سیاسی و، هەندێ کردەی تیرۆریستی بزوێنەر سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، وەکو رفاندنی فرۆکەو پەلاماردانی کونسولگەری، لەدروست کردنی جۆرێ لەهاوسۆزی، لەسەر ئاستی رای گشتی جیهانی، لەگەڵ ئەنجامدەرانی ئەو کردانە، لەرێگەی ئەو راپۆرتە چڕوپڕانەی کە کەناڵەکانی راگەیاندن بڵاوی دەکەنەوەن سەبارەت بەو ستەمەی رووبەرووی دەبنەوەو ئەو ئەندێشانەی کە گەلەکانیانی پیادا رەت دەبن[٣٦٥].

**دووەم- وێنەو شێوازەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی:**

رەنگە گەورەترین لەمپەر لەبەردەم ئەوانەدا. کە دەیانەوێت پێناسەیەکی دیاریکراوو گشتگیری تیرۆری نێودەوڵەتی دابرێژن، ئەوە بێت کە شێوازەکانی توندوتیژی زۆرن و ئەو وێنەو شێوازانە جۆراوجۆربن کە ئەنجامدەرانی کردە تیرۆرییەکان دەیگرنەبەر، بۆ جێبەجێکردنی کردە تاوانکارییەکانیان.

---

[٣٦٤] بروانە: ((الارهاب والعنف السياسي)) احمد جلال عزالدين، ل١٥١و دواتر.

[٣٦٥] بروانە: د.محمد المجذوب، سەرچاوەی ئاماژەپێکراو، ل١٩٨-١٩٩.

هەروەها بروانە:

*(Spring filed, Thomas, 1975), p.p 43-46*

تیرۆریستان لێهاتوویی و کارامەیی خۆیان، لە بەکارهێنانی ئامرازە نوێکانی زانست و تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو، لەپێناوی بەدیهێنانی ئامانجەکانیاندا سەلماند.

کردە تیرۆرییەکان دابەشدەکرێن بە چەند کردەیەك کە دژی ئامرازەکانی گواستنەوەی مەدەنیی نێودەوڵەتی، بەهەموو شێوازەکانیەوە ئەنجام دەدرێن، وەکو رفاندنی فڕۆکەو کەشتی و گۆڕینی رەوتییان و بە بارمتەگرتنی سەرنشینانیان، هەروەها ئەو کردە مەترسیدارانەش دەگرێتەوە کە فڕۆکەکان رووبەرووی دەبنەوە، لەکاتێکدا لەسەر خاکی فڕۆکە خانەکان نیشتوونەتەوە، ئەو پەلاماردانانەی دامەزراوەکان لەفڕۆکەخانەو نووسینگەکانی کۆمپانیای فڕۆکەوانی رووبەرووی دەبنەوە. چەندین کردەیتر هەن کە دژی کەسەکان ئەنجام دەدرێن، وەکو کردەی دەستدرێژیی کردنەسەر ئاسایشی جەستەیی، وەکو رووداوی تیرۆرکردنی ئاراستەکراو دژی کەسایەتییەکانی دەسەڵاتی گشتی و کاربەدەستانی دەوڵەت و سیاسەتمەداران و پیاوانی ئایینی و دیپلۆماتەکان و سەرانی وڵات و سەرەك وەزیران و. دواتر هەندێ کردەیتر دژی سامان ئەنجام دەدرێن، وەکو ئاگر خستنەوەو بەکارهێنانی نارنجۆك و رووخاندنی سامانە گشتییەکان و تایبەتەکان و وێرانکردنی ئامرازەکانی هاتوچۆی گشتی و تەقاندنەوەی باڵیۆزخانەو کۆمپانیاکانی گەشتوگوزاری و هتد. هەموو ئەم کردە تیرۆرییانە، بەمەبەستی تۆقاندنی خەڵکییەو هەڕەشەکردن لەئاسایش و سەقامگیریی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و شێواندنی ئاسوودەیی، لەشوێنە هەستیارەکانداو تێکدانی ئەو پەیوەندییانەی کە دەبێ لە مامەڵە نێودەوڵەتییەکاندا بەرقەرار بێت.

**سێهەم- یاسای نێودەوڵەتی تاوانکاری و پێناسەکردنی تاوانی نێودەوڵەتی:**

یاسای نێودەوڵەتی تاوانکاری، ئەو بەشەیە لەیاسای نێودەوڵەتی کە ئەو تاوانانە دەست نیشان دەکات کە دژی ئاسایش و ئاسوودەیی مرۆڤایەتییەو. بریتییە لە سزادانەکان و مەرجەکانی بەرپرسێتی تاکەکان و کەسانی یاسایی دیاری دەکات، بەمەبەستی بەرگرییکردن لەسستمی گشتیی نێودەوڵەتی[٣٦٦].

---

(٣٦٦) سەبارەت بەپێناسەی یاسای نێودەوڵەتی، بڕوانە: د. عبدالعزیز مخیمر عبدالهادی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤و لاپەڕەکانیتر. بەشێوەیەکی گشتی بڕوانە:

یاسای نێودەوڵەتی تاوانکاری، دوابەدوای جەنگی دووەمی جیهانی گەڵاڵە بوو، بەتایبەتی لە دادگایکردنەکانی نۆرمبێرگ و تۆکیۆدا، بەهۆی دادگایکردنی تاوانبارانی جەنگ، لە ئەڵمانە نازییەکان و ئەو یابانییانەی تاوانی جەنگ و تاوانە دژە مرۆڤایەتییەکانیان ئەنجام دا.

بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتیی تاوانکاری، جیاوازە لەبنەماکانی یاسای تاوانکاریی ناوخۆ کە مامەڵە لەگەڵ تاوانە نێودەوڵەتییەکاندا دەکەن و، هەندێك بە زاراوەی (یاسای تاوانکاریی نێودەوڵەتی) ناوی دەبەن، بەوەی یەکەمیان مۆرکێکی نێودەوڵەتی هەیەو سەرچاوەکانی لەڕێکەوتننامەو ڕێورەسمە نێودەوڵەتییەکاندا دەبینرێت کە وڵاتان لەسەری ڕێکدەکەون، بەڵام دووەمیان تایبەتە بەلایەنی تایبەت لەیاسای سزادانی ناوخۆیی کە بەمەبەستی دیاریکردنی دەسەڵاتی سەرکوتکارانەی دەوڵەتە، بۆ نەهێشتنی ئەو تاوانەی مۆرکێکی نێودەوڵەتی هەیەو، سەرچاوەکانی لەیاساو ڕێسا سزاییە ناوخۆییەکانی هەر دەوڵەتێکدا هەیە.

جیاوازییەك هەیە، لەنێوان زانایانی یاسای نێودەوڵەتی تاوانکاری و زانایانی یاسای تاوانی نێودەوڵەتییدا، لەسەر پێناسەکردنی تاوانی نێودەوڵەتی، مامۆستا(گلاسیر) تاوانی نێودەوڵەتی وا پێناسە دەکات کە ئەو کارەیە کە ئەنجام دەدرێت، بەمەبەستی تێکدانی بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتی و، زیان بەو بەرژەوەندییانە دەگەیەنێت کە ئەو یاسایە دەیانپارێزێت، لەگەڵ دانانان پیایدا بەشێوەیەکی یاسایی، بەوەی کە تاوانەو دەبێ ئەنجامدەرانی سزا بدرێن. گلاسیر پێی وایە کە کارەکە لەپێناوی خۆی یان بەناوی دەوڵەتەوە، یان لە پێناویدا ئەنجامی دەدات، بۆیە بیرۆکەی بەرپرسێتی تاوانکاریی دەدات، بۆیە بیرۆکەی بەرپرسێتی تاوانکاریی دەوڵەت، یان کەسە مەعنەوییەکان ڕەتدەکاتەوە[٣٦٧].

بەڵام مامۆستا دکتۆر محەمەد محییەدین عیوزە، تاوانی نێودەوڵەتی وا پێناسە دەکات کە هەر سەرپێچیکارییەکی نێودەوڵەتی دەگرێتەوە- چ ئەو سەرپێچییە

---

*Bassiouni, M.C, and Nanda, V.P, (eds*
*Low: CRIMES AND PUNISHMEN, Vol. I, (spring field, Thomas, 1973).*

(٣٦٧) بڕوانە: د.عبدالعزیز مخیمر، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠.

یاسای نیشتمانی یاساغی بکات یان بڕیاری لەسەر بدات- کە رووبدات بەکردەوە، یان کەسێکی موحافیزکارە دەست لە ئازادیی خۆی هەڵبگرێت، لەسەر پشکبووندا (بەرپرس لەرووی رەوشتەوە) کە زیان بە تاکەکان یان کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بگەیەنێت، لەسەر داوای دەوڵەت یان هاندانی، یان رەزامەندی- گەڵ‌جار- دەکرێ بەپێی بڕگەکانی ئەو یاسایە، وەکو تاوانکارێك سزا بدرێت[٣٦٨].

رەنگە گرنگترین تایبەتمەندیی تاوانی نێودەوڵەتی، بوونی توخمی نێودەوڵەتی بێت تیایداو. کاتی سیفەتی نێودەوڵەتی بوونی تاوان بەدیدێت، کە ئەو بەرژەوەندیی و بەهایانە بگرێتەوە کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی پارێزگارییان لێبکات، یان ئەوەی داموو دەزگا گرنگەکانی رووبەرووی مەترسی ببنەوە، یان ئەوەی تاوانباران لەرووی رەگەزنامەوە، سەر بەزیاتر لەدەوڵەتێك بن، یان ئەوەی تاوانباران هەڵبێن بۆ وڵاتێکیتر کە تاوانەکەی تیادا ئەنجام درابێت، یان ئەگەر تاوانەکە دژی کەسانێك ئەنجام درابێت کە لەسایەی پارێزگاریی نێودەوڵەتیدابن.

مەرجی نییە بۆ ئەوەی تاوانەکە سیفەتێکی نێودەوڵەتی وەربگرێت، لەدەوڵەتێکەوە دژی دەوڵەتێکیتر دەرچووبێت، یان ئەوەی وڵاتێك لەپشتی پلان دانانەوە بێت، یان هاندەری ئەنجامدانی بێت. چونکە ئەو تاوانانەیکە لەکاتی شەڕ یان بەهۆیەوە ئەنجام دەدرێن، تاوانی نێودەوڵەتین و دەکرێ ئەنجامدەرانیان دادگایی بکرێن، چ ئەو تاوانەی کە ئەنجامی دەدەن، لەسەر داوای وڵاتەکەیانەوە بێت، یان خۆ بەخۆ ئەنجامیان دابێت. هەروەها چەتەگەریش بەتاوانی نێودەوڵەتی ئەژمار دەکرێت، ئەگەر چی ئەنجامدەرانی ئەم کارە، لەسەر داوای دەوڵەت، یان بەهۆی هاندانیەوە ئەنجام نادرێت و، هەر بەوەی لە دەریا قووڵەکاندا ئەنجام بدرێت، ئەوا بەتاوانی نێودەوڵەتی ئەژمار دەکرێت.

---

[٣٦٨] د.محمد محي الدين عوض، ((دراسات في القانون الدولي الجنائي))گۆڤاری یاساو ئابووری، ژمارەی دووەم، ١٩٦٩، ل٢٩٤.

## بابەتی دووەم
## هەوڵە زانستییەکان، بۆ پێناسەکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی

پێناسەکانی تیرۆر دەگۆڕێن، بەپێی بۆچوونی زانایانی یاسای نێودەوڵەتی، لەدیاریکردنی ئەو دیاردەیەو توخمە پێکهێنەرەکانی کردەی تیرۆر. ڕەنگە گرنگترین هەوڵە زانستییەکان بۆ پێناسەکردنی تیرۆر، ئەوانەبن کە کۆنگرەی یەکەم، بۆ یەکخستنی سزادان پێی هەستا، کە لەشاری وارشۆ لەپۆڵەندا، لەساڵی ١٩٣٠ بەسترا[٣٦٩].

ویڵکسۆن (*Wilkison*) تیرۆر وا پێناسە دەکات کە ((ئاکامی توندوتیژیی توندرەوەکە ئەنجام دەدرێت، لەپێناوی گەیشتن بەچەند ئامانجێکی سیاسیی دیاریکراو، کە لەپێناویدا قوربانی دەدات، بە هەموو بیرو باوەڕە مرۆڤایەتیو ڕەوشتکارییەکان[٣٧٠])) ویڵکسۆن تاوانەکانی تیرۆر بەم جۆرەی خوارەوە پۆلێن دەکات[٣٧١]:

---

[٣٦٩] بڕوانە: ((الارهاب فى القانون الجنائى))، د.محمد مؤنس محى الدين، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣.

[٣٧٠] بڕوانە:

*overnment and Opposition, Vol. 8, No. 3, Summer 1973, London, P.222.*

هەروەها بڕوانە:

*n 1974).*

[٣٧١] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٣-٣٠٨. موس تیرۆر بەم شێوەیە پێناسە دەکات:

*Sheldon G. Levy, William J. Crotty,*

*Commission on the Cause and Prevention of Violence, U.S. Government Printion office, (Washington, 1969), P.421.*

١. تیرۆری جەنگی( پەنابردنە بەر شێوازی جۆراوجۆر، بۆ بلاوکردنەوەی ترس لەناوهاوولاتییاندا، لەرێگەی بەکارهێنانی چەکی وەکو نارنجۆك و چەکی ئاگرین و هتد)

٢. تیرۆری سەرکوتکاری (وەرگرتنی هەڵوێستێکی دیاریکراو، لە چوارچێوەی سستمی رێوشوێنە سەرکوتکارییەکاندا).

٣. تیرۆری شۆرشگێرانە (بە مەبەستی لەقکردنی سستمی سیاسی دەوڵەت و دەسەلات بەدەستەوەگرتن).

٤. تیرۆری نیمچە شۆرشگێرانە (مەبەست لەو کارانەیە کە بەبێ هیچ هاندەرێکی سیاسی، یان ئایدۆلۆژی ئەنجام بدرێن و، مەبەست ئەوە نەبێت دەسەلاتی دەوڵەتێك زەوت بکرێت).

سۆرنتۆن پێی وایەن تیرۆر بەکارهێنانی تۆقاندنە وەکو کارێکی هێمایی، بە مەبەستی کارکردنە سەر رەفتاری سیاسی بەهۆی شێوازی نا ئاساییەوە، کە دەخوازێت پەنا ببرێتە بەر هەرەشەو توندوتیژی [٣٧٢]. و سۆرنتۆن بایەخێکی تایبەت دەدات بەشێوازە نائاساییەکان، لە پێناسەکردنی تیرۆردا، توندوتیژی کە ئالۆزیی سیاسی دەبزوێنێت، لەپلەو پایەیەکی بەرزتر لەتوندوتیژیی سیاسی جیادەکاتەوە. بەلام سۆرنتۆن مەبەستی خۆی، لەمەر سروشتی نائاسایی کاری تیرۆری روون نەکردۆتەوە، هەروەها هیچ رێنماییەکی نەخستۆتە بەرچاو، تا لەرێگەیانەوە، لەنێوان کاری نائاسایی (تیرۆر)و کاری ئاساییدا جیاوازیی بکرێت، کە لەبۆچوونی خۆیدا، کاری تیرۆرییانە پێك ناهێنێت. تیرۆر بەلای سۆرنتۆنەوە بە سروشتە هێماییەکەوە جیادەکرێتەوە. کە کاریگەرییەکی زیاتر بەکردەکە دەبەخشێت[٣٧٣] بەلام واردلۆ، تیرۆری سیاسی وا پێناسە دەکات کە بەکارهێنانی

---

[٣٧٢] بروانە:

,in H.E.

*Eckstein (ed.), Internal War (London: Collier- Macmillan, 1964), P.73.*

[٣٧٣] سۆرنتۆن لەم بارەیەوە بریار دەدات کە:

توندوتیژی، یان هەر هەڕەشەیەك كە لەلایەن تاك یان كۆوە كە لەپێناوی یان دژی دەسەڵاتێكی بەرپا ئەنجام دەدرێت، كاتی كە مەبەست لەوكارە، راهێنانی حاڵەتێك بێت لەنیگەرانی توند، لەلایەن كۆمەڵێك لەقوربانیانی راستەوخۆی تیرۆرەوەو، ناچاركردنیان لەسەر رەزامەندیو ملدان بەخواستە سیاسییەكانی ئەنجامدەرانی كردە تیرۆرییەكان[٣٧٤].

بەپێی گرۆس، پێویستە، لەنێوان ئەو حاڵەتە جیاوازانەی كە توندوتیژییان تیادا بەكار دەبرێت جیاوازیی بكرێت، لەوانە[٣٧٥]:

١. خەباتو توندوتیژیی ئاراستەكراو دژی دەسەڵاتی تاكڕەوی لەناو دەوڵەتدا.

٢. توندوتیژیی ئاراستەكراو دژی داگیركەرانی بیانی، كە هەوڵی لەناوبردنی دەوڵەت، یان بەكۆیلەكردنی گەلەكەی دەدەن.

٣. توندوتیژیی ئاراستەكراو دژی دامەزراوە دیموكراسییەكان، وەكو ئەوەی حزبە فاشیەكانو نازییەكانو دارو دەستەكانیان ئەنجامیان دا.

---

*If the terrorist Comprehends that he is Seeking a demonstration effect, he Will atack targests with a Maximum Symbolic Value. The Symbols of the State are particularly important, but perhaps even more are those referring to the normative Structures and relationships that Constitute the Supporting framework, of Society. By showing the Weakness of this framework, the insurgents bemonstrate, not only their own strength and the Weakness of the incumbents but also the inability of the Society to Provide Support for its*

سەرچاوەی پێشوو، ل٧٧.

[٣٧٤] بەشێوەیەكی گشتی بڕوانە:

*Wardlaw,G*
*Cambridye University Press, 1982, P.16.*

[٣٧٥] بڕوانە:

*,op. Cit, p.422.*

لەبەر رۆشنایی پۆلێنکردنی سەرەوەی کردەکانی توندوتیژی، گرۆس توندوتیژیی دەکات بە(٥) بەلەشەوە، بەمجۆرەی خوارەوە[٢٧٦]:

١. توندوتیژیی تەکنیکی، بەمەبەستی هێنانەدی مەبەستێکی هەلپەرستانەی دیاریکراو، یان بەدەستهێنانی سوودێکی کاتی (وەکو سزادان، مۆرکردنی سزا، روخاندنی حکومەت).

٢. توندوتیژیی هەرەمەکی، بەبی رەچاوکردنی بەدیهێنانی مەبەستێك و بۆ مەبەستێکی دیاریکراو ئاراستە نەکرابێت.

٣. توندوتیژیی هەرەمەکی چڕ، واتە هەرەمەکی لە سروشتیدا، بەڵام ئاراستەکراوبێت بۆ ئامانجێکی دیاریکراو.

٤. توندوتیژیی لەچوارچێوەی بەرین و گشتگیرییدا.

٥. تیرۆری سیاسی دژی دەسەڵاتداران.

بەڵام واڵتەر پێی وایە کە تیرۆر کردەیەکی تۆقێنەرە، لەسێ توخم پێك دێت: کاری توندوتیژی یان هەرەشەی ئەنجامدانی، کاردانەوەی سۆزداریی کە لەئەوپەڕی پلەی ترسی قوربانیان و قوربانییە شیمانەکراوەکانەوە سەرچاوە دەگرێت و، ئەو کاریگەرییانە دەگرێتەوە کە بەهۆی توندوتیژی، یان هەرەشەی بەکارهێنانی و ئەو دڵەڕاوکێیانەی لێی دەکەونەوە[٢٧٧].

لەهەوڵێکی تری پێناسەکردنی تیرۆر، لە سۆنگەی یاسای نێودەوڵەتییەوە، ئیریك دێڤێد پێی وایە کە تیرۆر هەموو ئەو کردانەی توندوتیژیی چەکدارانە

---

[٢٧٦] سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣٢.

[٢٧٧] W

*Case Studies of Some PRIMITIVE African Communitie (New York: Oxford University Press. 1969), P.5 -*

دەگرێتەوە کە لەپێناوی ئامانجی سیاسی، فەلسەفی، ئایدیۆلۆژی یان ئایینی ئەنجام دەدرێن[٣٧٨].

فریلاند دەڵێت، تیرۆر بەکارهێنانی تاکتیکی توندوتیژییە، سەرەتا بەمەبەستی خولقاندنی دۆخێکی گشتیی لەترس و دڵەڕاوکێ، بەلای بەشی زۆری گەلەوە[٣٧٩].

بەڵام میکۆلۆس تیرۆر وا پێناسە دەکات کە بەکارهێنان، یان هەڕەشەکردنی بەکارهێنانی ئەو نیگەرانییەی لەتوندوتیژیی نا ئاساییەوە سەرچاوە دەگرێت بۆ دەستەبەرکردنی مەبەستی سیاسی. مەبەست لەوە کاریگەرییە لەسەر هەڵوێست و رەفتاری تاقمێك کە کاری تیرۆر بەرنامەیان لەسەر دادەڕێژێت، زیاتر لە قوربانییە راستەوخۆکە[٣٨٠].

لەهەولێکدا بۆجەختکردن لەسەر لایەنی ئایدیۆلۆژی، یان ستراتیژیی دیاردەکە، تۆرك بەم جۆرە تیرۆر پێناسە دەکات کە ئایدیۆلۆژییەك یان ستراتیژییەکە پاساو بۆ تیرۆری جەگبڕ یان سووك دەهێنێتەوە، بەمەبەستی بەرپەچدانەوەی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی، لەرێگەی زیاتر ترساندن بەلایەوە، لەرێگەی لێدانی ئامانجە هەڕەمەکییەکان[٣٨١].

بەڵام فیراکوتی پاساو بۆ لایەنی خەباتگێری کاری تیرۆر دەهێنێتەوە، وا پێناسەی دەکات کە کارێکە ئەنجام دەدرێت، وەکو ئامرازێك بۆ خەباتی سیاسی، بەمەبەستی کاریگەریی لەسەر دەسەڵاتی دەوڵەت، یان دەستەبەرکردنی ئەو دەسەڵاتە، یان بەرگری کردن لێی، کەخۆی لەبەکارهێنانی توندوتیژی دژی بێتاوانان و بێوەیاندا دەبینێتەوە[٣٨٢].

---

(٣٧٨) *In Reflexions sur la defintion et la repression du terrorism, Editions de Bruxelles, (Brussels, 1974).p.125.*

(٣٧٩) بڕوانە: ((الارهاب والقانون الدولي))، د.اسماعيل الغزالي، سەرچاوەی ئاماژەپێکراوی پێشوو، ل١٢-١٣.

(٣٨٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣.

(٣٨١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

(٣٨٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

سوتیل تیرۆر وا پێناسە دەکات کە تاوانکاریی تێکەڵ بە تۆقاندنو ترساندنە، بەمەبەستی بەدیهێنانی مەبەستێکی دیاریکراو[٣٨٣].

گۆنز بێرگ توخمەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی، بەم شێوەیە چڕ دەکاتەوە[٣٨٤]:

١. دەستدرێژی بۆسەر خزمەتگوزاریی گشتی، وەکو سەرقاڵکردنی هاتوچۆی نێودەوڵەتی، وەکو رفاندنی فرۆکە.

٢. دەستدرێژیی بۆسەر سەرۆکی دەوڵەت یان ئەندامێکی حکومەت لە دەرەوە.

ولیمکن پێی وایە کە تاوانی تیرۆری نێودەوڵەتی، کاتێ روو دەدات کە ئەم توخمانەی خوارەوە لە ئارادابن[٣٨٥]:

١. دووبارە بوونەوەی روودانی کاری تیرۆر، یان جۆراوجۆربوونی کارە تیرۆرییەکان.

٢. رەفتارە تیرۆرییەکان، بەمەبەستی خولقاندنی پشێوی، یان ئاڵۆزی بێت لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا.

٣. کە جیاوازیی هەبێت لە نێوان:

ا. رەگەزنامەی بکەر.

ب. رەگەزنامەی کەسی قوربانی.

جـ. رەگەزنامەی ئەو شوێنەی کە تاوانەکەی تیادا ئەنجام دراوە.

بەڵام لیژنەی شارەزایان کەسەر بەیەکێتی نێودەوڵەتیی یەکخستنی یاسای تاوانکارییە، پێی وایە کە کاتێ کارێك بە تیرۆری نێودەوڵەتی دادەنرێت کە ئەم مەرجانەی تێدا بێت[٣٨٦]:

١. ئاڵۆزیی لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا بوروژێنێت.

---

[٣٨٣] بڕوانە:

*665,1938,p.96.*

[٣٨٤] بڕوانە: ((الارهاب السياسي والقانون الجنائي))، د.عبدالرحيم صدقي، هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٩٧.

[٣٨٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەرە.

[٣٨٦] هەمان سەرچاوە، ل٩٨.

٢. کە تاوانەکە ئاراستە بکرێت دژی ئەو وڵاتەی تاوانەکەی تیادا ئەنجام دەدرێت (واتە ئاسەواری تاوانەکە زیاتر لە ناوچەیەك لە دەوڵەتێکدا بگرێتەوە).

٣. ئەنجامدەران لە دەرەوە پەنایانهێنابێت.

٤. ئامادەکاری بۆ تاوانەکە لەوڵاتێکیتردا کرابێت، نەك ئەو دەوڵەتەی پەیوەندیدارە بەئەنجامدانی تاوانەکەوە، یان تیرۆری نێوەناچڵی لەوڵاتێکیتر، جگە لەوڵاتە پەیوەندیدارەکەدا رووبدات.

لەسەر ئاستی ئەکادیمیی عەرەبیدا، د.عەبدولعەزیز سەرحان پێی وایە کە تیرۆری نێودەوڵەتی چەق لەسەر بەکارهێنانی نارەوای هێز دەبەستێت‌و. تیرۆری نێودەوڵەتی بەم جۆرە پێناسە دەکات. کە هەر دەستدرێژییەك بۆسەر گیان‌و سامانی گشتی‌و تایبەتە بە پێچەوانەی برگەکانی یاسای نێودەوڵەتیی گشتیی بەسەرچاوە جۆراوجۆرەکانیەوە، بە پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی دادگای نێودەوڵەتیی دادوەریش. پێی وایە کە لەرێگەی ئەم پێناسەیەوە، دەکرێ وا تەماشای کاری تیرۆر بکرێت کە تاوانێکی نێودەوڵەتییە، لەسەر بنەمای سەرپێچیکردن لەیاسای نێودەوڵەتی. بۆیە سزا دەیگرێتەوە، بەپێی یاساکانی سەرجەم وڵاتان.

کەپێشتریش ئەو برگانە جەختیان لەسەر کردووە کە دادگای نۆرمبێرگ‌و دادگای تۆکیۆ دژی تاوانبارانی جەنگی دووەمی جیهانی دەریان کرد. هەروەها لەوە زیاتر دەڕوات‌و دەڵێت کە کاری تیرۆر مۆرکێکی نێودەوڵەتی بەخۆوە دەگرێت‌و دواتر بەتاوانی نێودەوڵەتی هەژمار دەکرێت، ئەوسا گرنگ نییە چ تاك ئەنجامی بدات یان تاقمێك یان دەوڵەتێك، هەروەها ئەو کارانەی جیاوازیی رەگەزی دەگرێتەوە کە هەندێ وڵاتان ئەنجامیان دەدەن‌و. هەرکارێك بەمەبەستی بەرگریی لەمافە تایبەتەکان بەتاك‌و مافی مرۆڤ یان گەلان، مافی دیاریکردنی چارەنووس‌و مافی رزگارکردنی خاکی داگیرکراو بەرەنگار بوونەوەی داگیرکاری ئەنجام بدرێن، یاسای نێودەوڵەتی سزایان بۆ دیاری ناکات، چونکە ئەم کارانە لەبەرامبەر مافەگەلێکدان کە یاسای نێودەوڵەتی تاکەکان‌و دەوڵەتان بڕیاری

لەسەر دەدەن کە تیرۆر وابەستە دەبێت بە بەکارهێنانی رەوای هێزەوە، بەپێی برگەکانی ئەو یاسا نێودەوڵەتییانە کە لەسەری رێکەوتن هەیە یان بەرپان[٣٨٧].

د. سەلاحەدین عامیر پێی وایە کە زاراوەی تیرۆری نێودەوڵەتی، لەم سەردەمەدا بۆ ئەوە بە بەکارهێنانی توندوتیژی بەرێکوپێکی بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی سیاسی و بەتایبەتی هەموو کارەکانی توندوتیژی (رووداوی دەستدرێژیی تاك یان بەکۆ یان وێرانکاری) ئاماژە دەکات کە رێکخراوێکی سیاسی ئەنجامی بدات، بەسەر هاووڵاتییانداو هێنانە کایەی کەسێکی نائارام و. لەم بیرۆکەیەدا دەچێتە سەر کۆمەڵێ کردەی، وەکو بەبارمتەگرتن و رفاندنی کەسەکان، بەشێوەی گشتی و بەتایبەتی کەسانی دبلۆماسی و کوشتنیان و دانانی مادەی تەقینەوە لەشوێنی کۆبوونەوەی کەسانی مەدەنی، یان لەناو ئامرازەکانی هاتوچۆی گشتی و وێرانکاری و گۆرینی رەوتی فرۆکە لەرێگەی بەکارهێنانی زۆرەوە[٣٨٨].

د. عەبدولعەزیز موخەیمەر، ئەو توخمانەی کە تیرۆری نێودەوڵەتی جیادەکەنەوە، بەم جۆرە چر دەکاتەوە[٣٨٩]:

١. نەبوونی جیاوازیی لەنێوان تیرۆری نێودەوڵەتی و ناوخۆ، لەرووی سروشتی خۆیەتی کارەکەوە، هەردووکیان پێویستیان بە بەکارهێنانی شێوازی توندە بۆ خولقاندنی ترس و دڵەراوکێ لای کەسێکی دیاریکراو یان تاقمێکی دیاریکراو، یان لای بەشێك لە کۆمەڵ، یان هەموو کۆمەڵ، بەمەبەستی بەدیهێنانی چەند ئامانجێکی دیاریکراوی هەنووکەیی یان لەئایندەدا.

---

[٣٨٧] بروانە: د.عبدالعزیز سرحان، ((حول تعریف الارهاب الدولی وتحدید مضمونة من واقع قواعد القانون الدولی وقرارات المنظمات الدولیة))، گۆڤاری میسری یاسای نێودەوڵەتی، بەرگی ٢٩، ١٩٧٣، ل١٧٣-١٧٤.

[٣٨٨] بروانە: د.صلاح الدین عامر، ((المقاومة الشعبیة المسلحة من القانون الدولی العام))، ١٩٧٧، ل٤٨٦-٤٨٧.

[٣٨٩] بروانە: د. عبدالعزیز مخیمر، ((الارهاب الدولي)) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٥٧-٦٠.

٢. تیرۆری نێودەوڵەتی ئەو کارەیە کە ئەنجام دەدرێت، بۆ بەدیهێنانی چەند ئامانجێکی سیاسی، یان کۆمەڵایەتی یان مەزهەبی.

٣. هەموو ئەو کارە تیرۆرییانە دەچنە چوارچێوەی تیرۆری نێودەوڵەتییەوە کە فاکتەرێکی دەرەکی یان نێودەوڵەتی تیادا بێت، چ لەلایەن کەسێکەوە یان تاقمێکەوە یان دەسەڵاتدارانی دەوڵەتێکی دیاریکراوەوە ئەنجام درابێت و، چ لەرێگەی پلاندانانەوە بووبێت، یان لەرێگەی هاندان، یان یارمەتیی وڵاتێکەوە بووبێت یان نەبێت.

٤. هەموو ئەو کردە تیرۆرییانە دەکەونە چوارچێوەی تیرۆری نێودەوڵەتییەوە، کە دژی دەوڵەت یان دام و دەزگاکانی، یان دژی دەسەڵاتداران ئەنجام دەدرێن، هەروەها ئەو کردە تیرۆرییانەی ئاراستەی کەسەکان یان تاقمێك، لەناو کۆمەڵ یان هەموو کۆمەڵ بکرێت.

ئەمانەی خوارەوە ناچنە چوارچێوەی تیرۆری نێودەوڵەتییەوە[٢٩٠]:

١. رووداوە تیرۆرییەکان کە بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجی تاوانکاری یان خۆیەتی ئەنجام دەدرێن، وەکو رفاندن و بەبارمتەگرتن، چونکە ئەم کردە تاوانکارییانە، هەموو دەقەکانی سزادان لەسەرانسەری وڵاتانی جیهاندا، سزایان بۆ دیاری کراوەو، کێشەیەك ناوروژێنن سەبارەت بە هاوکاریی نێودەوڵەتی بۆ نەهێشتنیان و لەناوبردنی ئەنجامدەرانیان.

٢. ئەو کردانەی دەوڵەت دژی هاووڵاتییانی خۆی ئەنجامی دەدات، وەها کارگەلێك بەسەرپێچی کردن لەبڕگەکانی یاسای نێودەوڵەتی، بۆ پارێزگاریی لەمافی مرۆڤ ئەژمار دەکرێن و، رەنگە ببنە تاوانی نێودەوڵەتی دژی مرۆڤایەتی. سەرەڕای ئەوەی ئەم کردەوانە بەکردەی ناوخۆ دادەنرێن و ئەو توخمە نێودەوڵەتییانەیان تیادا نییە، تا بەتیرۆری نێودەوڵەتی دابنرێن.

٣. ئەو کردانەی تیرۆر کە لەگەڵ دەست پێکردنی کردەی شەڕدا ئەنجام دەدرێن کە بەپێچەوانەی یاساو رێسای شەڕن، لەبەرئەوەی ئەم کردانە بەو تاوانانە

[٢٩٠] سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨-٥٩.

دادەنرێن کە سزایان بۆ رەچاوکراوەو، پێویستییان بەوە نییە سزای نوێیان بۆ دەست نیشان بکرێت.

د. نەبیل حیلمی تیرۆر وا پێناسە دەکات کە بەکارهێنانی ناڕەوای توندوتیژییە، یان هەڕەشەکردنە بە ئەنجامدانی لەڕێگەی تاقمێکەوە یان دەوڵەتێکەوە، دژی تاك یان کۆمەڵێك یان دەوڵەتێك کە دڵەڕاوکێی لێبکەوێتەوەو گیانی مرۆڤ رووبەرووی مەترسی بکاتەوە، یان هەڕەشە لەئازادییە بنەڕەتییەکان بکات، بەمەبەستی گوشارخستنە سەر تاقمێك یان دەوڵەت تا شێوازی خۆی بەرامبەر بە مەسەلەیەك بگۆڕێت[٣٩١].

هەندێ لە هەوڵی ئەوەدان کە تیرۆر خەباتی شۆڕشگێڕانە بکەن بە دوو رووی دراوێك‌و. لەم راستایەدا، د.ئیسماعیل غەزالی بڕیار دەدات کە ((تیرۆر-یان خەباتی شۆڕشگێڕانە- ئایدیۆلۆژییە، پرەنسیپە، بیرە، دامەزراوەیە، بڕوانامەیە، کە رەوابوون بە توندوتیژی دەدات، یان ستراتیژێکە برەو بەو کردانە دەدات[٣٩٢])).

لەم بارەوە پشت بەبیری سارتەر دەبەستێت کە تیرۆر بەهێزێکی پاڵنەر دەزانێت، بۆ رێکخستنی کۆمەڵایەتی‌و کلیلی ئازادی‌و، لەئاستێکی بەرزی کاروبارە مرۆڤایەتییەکاندا دادەنرێت‌و پێی وایە کە پراکتیزەکردنی یەکێکە لە مەرجەکانی ئازادی[٣٩٣].

د.ئەدۆنیس عەکرە، تیرۆر بەدیاردەیەکی سیاسی دەزانێت‌و وا پێناسەی دەکات کە سەرچاوەی کێشەیەکی توندوتیژە، کە ئەنجام دەر، دەیەوێت لەڕێگەیەوەو لەڕێگەی ئەو ترسەی لە توندوتیژییەوە سەرچاوە دەگرێت، دەبێتە هۆی سەپاندنی راو بۆچوونی سیاسی خۆی، یان سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر کۆمەڵگە یان دەوڵەتدا، لەپێناوی پارێزگاریی لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە گشتییەکان، یان لەپێناوی گۆڕینیان، یان نەهێشتنیان[٣٩٤].

---

[٣٩١] بڕوانە: ((الارهاب الدولي وفقاً لقواعد الدولي العام)) د.نبيل احمد حلمي، ١٩٨٨، ل٣٥-٣٦.

[٣٩٢] بڕوانە: ((الارهاب والقانون الدولي)) د.اسماعيل الغزالي، سەرچاوەی پێشوو ل١٦.

[٣٩٣] سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەرە.

[٣٩٤] بڕوانە: ((الارهاب السياسي- بحث في اصول الظاهرة وأبعادها الانسانية)) د.ادونيس العكرە، ١٩٨٣، ل٩٣.

بەڵام د. ئەحمەد جەلال عیزەدین پێی وایە کە هەوڵەکانی پێناسە کردنی ماددیو بابەتی بێکەموکوڕی نەبوونە، یان لەبەرئەوەی کە تەنیا لایەنی ماددی (کردەکان)، یان لایەنی یاسایی (تاوانەکان)، یان لایەنی ڕەوشتکاری، یان لایەنی سیاسی، یان هەندێ لەو لایەنانەی ڕەچاو کردووەو لایەنەکانی تری پشت گوێ خستووەو، پێی وایە کە باشترین پێناسەکردن بۆ ئەم دیاردەیە، ئەوەیە کە دوو تایبەتمەندیی تیادا بێت[٢٩٥].

١. داماڵینو بابەتمەندی، بەجۆرێك تەنیا لەگەڵ تێڕوانینی یەکێك لە لایەنەکاندا نەگونجێت، بەڵکو تێڕوانینە جۆراوجۆرەکان وەلاوە دەنرێنو، دواتر پاڵنەرو هاندەرەکان، بۆ ئەنجامدانی کارێك کە پێناسە نەیگرێتەوە.

٢. بەئاگابوون لەلایەنە جۆراوجۆرەکانی دیاردەکە، بەبێ خافڵبوون لێیانو. چەند تایبەتمەندییەکمان پێشکەش دەکات کە پێناسەی تیرۆر دەیانگرێتەوەو جیای دەکەنەوەو دیاری دەکەنو- بەپێی بۆچوونی خۆی- ڕێگە نادات لەگەڵ ئەو دیاردانەدا تێکەڵ بێت کە لەیەکترەوە نزیکنو. تایبەتمەندییەکان ئەمانەن[٢٩٦]:

١. توندوتیژی، یان هەڕەشەی توندوتیژی.
٢. ڕێکخستنی گرێدراو بەتوندوتیژی.
٣. ئامانجی سیاسیی تیرۆر.
٤. تیرۆر ئەلتەرناتیڤە، بۆ بەکارهێنانی ئاسایی هێز.

پێناسەی تیرۆر وا چڕدەکاتەوە، کە ((توندوتیژییەکی ڕێکخراو بەرو دووە، بەمەبەستی هێنانەدی حاڵەتێك لە هەڕەشەی گشتیی ئاراستەکراو، بۆ دەوڵەتێك یان بۆ تاقمێکی سیاسی، کە تاقمێکی ڕێکخراو بەمەبەستی هێنانەدی ئامانجی سیاسی[٢٩٧] ئەنجامی دەدات)).

---

[٢٩٥] بڕوانە: ((الارهاب والعنف السياسي))، د.احمد جلال عزالدين، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣-٣٤.

[٢٩٦] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢-٤٩.

[٢٩٧] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٩.

# بابەتی سێهەم

# بۆچوونی تایبەتیمان، لەسەر تیرۆری نێودەوڵەتی

بۆچوونی تایبەتیمان، لەسەر تیرۆری نێودەوڵەتی پێشتر ئاماژەمان بەو لەمپەرانە کرد کە ڕێگە لەئەرکی دانانی پێناسەیەکی دیاریکراوی تیرۆری نێودەوڵەتی‌دەگرن‌و، بەشبوونی ئاشکرای نێوان شارەزایانی یاسای نێودەوڵەتی، لەسەر بنەماکانی تاوانی تیرۆرو ئەو توخمانەی کاری تیرۆر پێکدەهێنن. و هەر لە سۆنگەی بڕوامان بەوەی کە پێناسەی تیرۆری نێودەوڵەتی‌و دەرخستنی ئەو کردەو ڕەفتارانەی، بەکاری تیرۆر دادەنرێن، یان ئەوانەی لە وچوارچێوەیەدا دەردەچن، بە خاڵی سەرەتای هەر هەوڵێکی نێودەوڵەتی دادەنرێن، بۆیە هەوڵدەدەین، چەند چەمکێك پێشکەش بکەین کە دەکرێ لە ڕێگەیانەوە، تیرۆری نێودەوڵەتی پێناسە بکەین‌و بنەماکان‌و لایەنە جۆراوجۆرەکانی دیاری بکەین.

**یەکەم: پێناسەی پێشنیازکراو بۆ تیرۆری نێودەوڵەتی:**

تیرۆر بەکارهێنانی شێوازی توندە، وەکو ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانج، لەوانە بڵاوکردنەوەی ترس بۆ ناچارکردن، لە هەڵوێست وەرگرتنێکی دیاریکراو، یان هەڵوێست وەرنەگرتن. و لەم پێناسەوە ڕوون دەبێتەوە کە ڕواڵەتەکانی تاوانی تیرۆر جیاوازییان هەیە لەگەڵ تاوانەکانی تردا، چونکە:

١. تیرۆر ئامرازە، نەك پێناو.

٢. شێوازە بەکارهاتووەکان جۆراو جۆرن‌و مۆرکی توندوتیژی پێوەیەو حاڵەتێك لە ترس‌و دڵەراوکێ دروست دەکات.

٣. باسکردن لەسەر تاوانی تیرۆر نابزوێنرێت، تەنیا لە کاتێکدا نەبێت کە ئەگەر کێشەیەکی سیاسی، یان هەڵوێستێکی دیاریکراو، واتە بە مانایەکی تر دوو گرووپی جیاواز، لەئارادا بێت.

گەڵێ جار چەند هۆکارێکی سیاسی، لە پشتی ئەم تاوانانەوەن، گرنگترینیان:

-ڕەچاو نەکردنی مافی کەمینەکان.

-داننەنان بە مافی گەلان، لەدیاریکردنی چارەنووسدا.
-رێزنەنان لە مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکانی.

بۆیە تیرۆر نابێ هەموو کردارەکانی توندوتیژیی سیاسی بگرێتەوە کە دەبنە مایەی خوڵقاندنی ترس، یان دڵەڕاوکێ و ئەو جۆرە شتانە. هەندێ جاری بەبێ مەبەستی بڵاوکردنەوەی ترس و دڵەڕاوکێ، لەنێوان خەڵکیدا بەکاردەبرێت، بەڵکو بەبێ ئەنقەست و یان بەرێکەوت بەکاردەبرێت- وەکو لەو حاڵەتانەی ترسدا کە رووبەرووی ئەوانە دەبێتەوە کە لە ترسی گیانی خۆیان ئامادەی رووداوەکە دەبن، هەروەها پێویستە تیرۆرو کارەکانی تر تێکەڵ نەکرێن کە هێزیان شێوازی توندوتیژییان تیادا بەکاردەبرێت، بۆیە دەبێ لە روانگەی یاساییەوە، هەموو ئەو کردارانە لە بازنەی تیرۆر دەربکەین، کە بە مەبەستی گەیاندنی زیانی گیانی ئەنجام دەدرێن، لە شوێنی رووداوەکە، یان بارمتەگیراوان، یان کوشتنیان و یان ئەشکەنجەدانیان.

بۆیە دەتوانین توخمەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی، بەم جۆرە چڕبکەینەوە:

١.کارێکە لە کارەکانی توندوتیژی کە ئاراستەی قوربانییەکی دیاریکراو دەکرێت(کەسێك، یان کۆمەڵێ کەس، یان بە بارمتە گیراوان.)

٢. کە ئەنجامدەری کارەکە بەو مەبەستە ئەنجامی دابێت، تا ترس لە دڵی کۆمەڵێ خەڵکدا دروست بکات کە دووربن لە گۆڕەپانی کاری تیرۆریستییانە، بە بەکارهێنانی قوربانیان، وەکو ئامرازێك بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو حاڵەتە.

٣. کە ئەنجام دەری تاوانەکە وابێت ئەو تاکانە، لە داهاتوودا داخوازییەکانی بۆ دەستەبەر دەکەن و، ئەوەیە ئامانجی ئەم کردەیە.

٤. کارەکە مۆرکێکی نێودەوڵەتی پێوەبێت، واتە تاوانەکە لە زیاتر لە دەوڵەتێکدا رووی دابێت، یان قوربانیانی کارەکە سەر بە چەند وڵاتێك بن.

بۆیە تاوانی تیرۆر، لەناوەڕۆکدا جیاوازیی هەیە لەگەڵ تاوانی دەستدرێژی کردندا، لەوەی کە دووەمیان(دەستدرێژی) دژی ئاسایشی خاك و سەربەخۆیی سیاسیی دەوڵەتێك دەبێت، لەلایەن دەوڵەتەوە، بەڵام تیرۆر تاوانێکە دژی گیانی کەسەکان و ماف و ئازادییە سیاسییەکانیان ئەنجام دەدرێت و ئەوانەی کارەکەیان

رووبەڕوو دەبێتەوە کەس یان تاقمێکن و هەروەها ئەنجامدەرانیش هەر تاکە کەسن. واتە وڵاتی تیرۆریستی نییەو، شتێك نییە بەناوی تیرۆری دەوڵەت، دەوڵەت بە پێی یاسای نێودەوڵەتی- دەبێ دەوڵەتێکی دەست درێژیکەر بێت و، تاکەکان و تاقمەکان تاوانی دەستدرێژی ئەنجام نادەن، بەڵکو تاوانی تر ئەنجام دەدەن، وەکو تاوانی شەڕ یان تاوانی دژی مرۆڤایەتی، یان تاوانی تیرۆر.

شایانی ئاماژە پێکردنی، کەتێکەڵکردنی ئەوەی بەدەستدرێژی دادەنرێت، لەگەڵ ئەوەی بە تیرۆر دادەنرێت، ئاکامی یاسایی جۆراوجۆری هەیە. دەستدرێژی-وەکو تاوان- لەتیرۆر ترسناکترەو، خۆی لە"بەکارهێنانی هێزی چەکدارییەوە، لەلایەن دەوڵەتێکەوە دەبینێتەوە، دژی سەروەری و یەکێتی خاکی ئیقلیمی، یان سەربەخۆیی سیاسیی دەوڵەتێکی تر، یان بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ بڕوانامەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا، یەکناگرێتەوە". بەڵام تیرۆر، هەروەکو لە پێناسەکەیدا، پێشتر ئاماژەی پێکرا، بەکارهێنانی ڕێگاکانی توندوتیژییە، لەلایەن کەسێك یان کۆمەڵێکەوە، دژی تاکەکان یان کۆمەڵێك، وەکو ئامرازێك بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی ترس، بۆ ناچارکردن لەسەر وەرگرتنی هەڵوێستێکی دیاریکراو، یان وەرنەگرتنی.

ئەنجومەنی ئاسایش، لەدەستبەکار بوونی لەدەسەڵاتەکانی وەکو دەسەڵاتێکی سەرکوتکەری سنووردارکراو، ئەگەر هەڕەشە لە ئاشتی کرا، یان شێوێنرا، یان ئەوەی کەڕوویدا بەکاری دەستدرێژی دانرا. لەم بوارەدا، ئەنجومەن دەسەڵاتێکی فراوانی دەبێت لەمەزەندە کردندا، بۆی هەیە لەو بارەوە، زانیاری پێشکەش بکات و بڕیار لەسەر گرتنەبەری ڕێوشوێنی گونجاو بدات، بۆ پارێزگاریی لە ئاشتی نێودەوڵەتی، یان گێڕانەوەی[٣٩٨]. و چەند ڕێوشوێنێکی کاتی و ڕێوشوێنی سەربازی و ناسەربازی هەن، کە دەکرێت دژی دەوڵەتی دەستدرێژیکەر، لەلایەن ئەنجومەنەوە بگیرێتەبەر، بەڵام ئەگەر هەڵوێستەکە وا لێکدرایەوە کە تیرۆری دەوڵەت بێت، ئەوا بە ئاسانی ناکرێت بڵێن کە ئەنجومەنی ئاسایش لەو حاڵەتەدا، دەسەڵاتی ڕەسەنی هەیە.

---

[٣٩٨] ماددەی(٣٩) لە بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان.

**دووەم: ڕێگەچارە پێشنیارکراوەکان، بۆ بنبڕکردنی دیاردەی تیرۆری نێودەوڵەتی**

١-پێناسەکردنی تاوانی تیرۆری نێودەوڵەتی و قەدەغەکردنی، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، لە ڕێگەی ڕێکەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی بە کۆوە کە ماکێکی یاسادانانی هەبێت.

٢-بنبڕکردنی هۆکارەکانی تیرۆر لە جیاوازی و ڕەگەزپەرستی لە نێوان گەلاندان و، دەستدرێژی و دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆی وڵاتانداو داگیرکردنی خاک و دەرکردنی بە کۆی دانیشتوان و پێشێل کردنی مافی مرۆڤ و ڕەچاونەکردنی چارەنووسیان و .. هتد.

٣-دامەزراندنی دادگای ئیقلیمی تاوان، بۆ سزادانی ئەنجامدەرانی تاوانی تیرۆری نێودەوڵەتی.

٤-گەشەدان بە بنەما تایبەتەکانی بەدەستەوەدانی تاوانباران، لەیاساو ڕێساکانی تاوان لە وڵاتە جۆراو جۆرەکاندا، لەگەڵ بەستنی ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتی دوو قۆڵی و بەکۆ، تاوانی بە بەدەستەوەدان و دادگایکردنی تاوانبارانی تاوانی تیرۆری نێودەوڵەتی.

# بەشی شەشەم
# بەرپرسێتی لە کردارەکانی تیرۆری نێودەوڵەتیدا

سستمی یاسای نێودەوڵەتی، لە کۆمەڵێ بنەماو پرەنسیپی یاسایی پێکهاتووە، کە ماف و ئەرکەکانی دەوڵەتان دیاری دەکات و، رەفتاریان رێکدەخات. و هەر دەوڵەتێك پابەند دەبێت بەرێزگرتن لەو بنەمایانەو بەپێی ئەو بنەمایانە رەفتار دەکات. و هەر پابەندبوونێك بە یەکێك لەو خاڵانە، یان جێبەجێنەکردنیان، لەلایەن یەکێك لەو وڵاتانەوە، بەشێوەیەك کە زیان بە وڵاتێك، یان چەند وڵاتێکی تر بگەیەنێت، ئەوا دەبێت بنەماکانی بەرپرسێتی نێودەوڵەتی بکەوێتە خۆی، بەرامبەر وڵاتی سەرپێچیکەرو، پابەندی بکات بە قەرەبووکردنی ئەو زیانانەی کە لێی‌دەکەوێت.

پێویستە سێ مەرج هەبێت، بۆ هەستان بە بەرپرسێتی نێودەوڵەتی هەر دەوڵەتێك، کە ئەمانەن[٣٩٩]:

١-رووداني کارێك کە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی رەوا نەبێت: واتە بە پێچەوانەی بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتی، یان رێکەوتننامە بەرپاکانەوە بێت.

٢-ئەو کارە، بە پێی بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتی درابێتە پاڵ یەکێك لەوڵاتان.

٣-بەهۆی ئەم کارەوە، زیان لە وڵاتێکی تر بگات.

---

[٣٩٩] بڕوانە: لە بنەماکانی بەرپرسێتی نێودەوڵەتی، د. احمد محمد رفعت، "القانون الدولی العام"، دارالنهضة العربیة، ١٩٩٧، ل ٥٩٦و دواتر.

## لێکۆڵینەوەی یەکەم
## بەرپرسێتی نێودەوڵەتی لە کردەکانی تیرۆری نێودەوڵەتیدا

بیرۆکـەی بەرپرسـێتی، لـە کارەکـانی توندوتیژیـی نـارەوا، لەسـەر ئاسـتی نێودەوڵەتی، بەم جۆرەی خوارەوە دەوروژێت:

**یەکەم: پابەند نەبوونی دەوڵـەت بـەو ڕێکەوتنـە گرێیـە ستیانەوە کـە تاییـەتن بـە بنبڕکردن و ڕێگەگرتن لەکردە تیرۆرییەکان:**

پێویستە لەسەر هەردەوڵەتێك کە دەچێتە نێو ڕێکەوتنامەیەکی نێودەڵەتییەوە، پابـەندبێت بە بڕگـەو بنـەماکانی ڕێکەوتنامەکـەوەو، بـەڕێکوپێکی جێبـەجێیان بکات و دەبێ لـە بەرامبـەر هـەر شـێواندنێکی ئـەم بنەمایانـەدا، بەرپرسـێتی نێـو دەولـەتی خـۆی بخاتـە گـەڕو، پابەندنەبوونـە نێـو دەوڵەتییـەکان و ڕێکەوتنامـەی بنـبڕکردنی تیرۆرو نەهێشتنی لەو چوارچێوەیەدا دەرناچێت، چوونـە ریـزی هـەر دەوڵەتێك، بۆ ڕێکەوتنامەی تایبەت بە نەهێشتنی زەوتکردنی نارەوای فرۆکـە کە لە لاهای لە ١٦ی کانونی یەکەمی ١٩٧٠دا مۆرکرا، پابەندی دەکات بە تاوانکردنی ئەم کردەوانە، لە یاسای نیشـتیمانیداو سزادانی تونـدو لەسـەری و، گرتنەبـەری ڕێوشوێنی پێویسـت، بۆ دامـەزراندنی لایەنە دەسـەڵاتدارەکانی، بۆ چاوخشـاندن بەم تاوانانـەدا. ئەگـەر ئـەنجامدەر لـەناو قەڵەمڕەوەکـەیدا بێـت، یـان کاتـێ نـەیدا بەدەستی یەکێك لەو وڵاتانەی لە ڕێکەوتنامەکەدا ئاماژەیان پێکراوەو، گرتنەبەری ئەو ڕێوشوێنانەی لە ڕێکەوتنامەکەدا هاتوون، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی رفێنەرەکـەو دووبارە گێڕانەوەی کۆنتڕۆڵی فڕۆکەکە بۆ فڕۆکەوانەکـەی خـۆی و، یارمـەتیدانی سەرسەرنشـینیان و ستافی فڕۆکەکە، بـۆ درێـژەدان بە گەشتەکەیان و، گێڕانـەوەی فڕۆکەو بارەکەی، بەبێ دواکەوتن بۆ خاوەنەکانیان.

هەروەها دەوڵەتەکە پابەند دەبێت، بەوەی تاوانی زەوتکردنـی نـارەوای فڕۆکـە، یەکێکە لەو تاوانانەی کە بەدەستەوەدانی تێدا دەبێت کە لەهەر ڕێکەوتننامەیەکی بەدەستەوەدانی نێوان دەوڵەتانی ڕێکەوتنامەدا هەیە

پابەندنەبوون بە خاڵە پێشووەکانەوە، بەرپرسێتی دەوڵەت دەگرێتەوەو رووبەڕووی سزای نێودەوڵەتی دەکاتەوە کە وڵاتانی تری رێکەوتنامەکە مۆری دەکەن، بەهۆی کەموکوڕی لە جێبەجێ کردنی ئەو خاڵانەدا. هەروەها دەوڵەتی سەرپێچیکار پابەند دەکات بە قەرەبووکردنەوەی گونجاو بۆ وڵاتانی تر، یان بۆ هاووڵاتییانی، ئەگەر بەهۆی کەمو کوڕی لە جێبەجێ کردنیان، ئەو وڵاتانە یان هاووڵاتییانیان تووشی زیان بوون.

**دووەم: بەرپرسێتی نێودەوڵەتی لەسەر کارە تیرۆرییەکان، لەدەرەوەی چوارچێوەی رێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان:**

ئەگەر بزواندنی بەرپرسێتی نێودەوڵەتی، لە حاڵەتی سەرپێچی لە پابەندبوونە نێودەوڵەتییەکان، سەبارەت بە رێگەگرتن و بنبڕکردنی تیرۆر هیچ کێشەیەك نەوروژێنێت، ئەوا مەسەلەکە بە پێچەوانەوە دەبێت، ئەگەر دەقی رێکەوتننامەیەك لەم بارەوە نەبێت.

ئەمەش وا دەکات بپرسین: ئایا دەوڵەت دەکەوێتە ژێر پابەندبوونی نێودەوڵەتیی گشتی، بۆ رێگەگرتن و تاوانبارکردن و سزادانی کردارە تیرۆرییەکان، لە دەرەوەی چوارچێوەی یاسایی نێودەوڵەتی کە رێکەوتنی لەسەر هەبێت؟

چەندین پرەنسیپ و پابەندبوونی گشتی هەیە لەیاسای نێودەوڵەتیدا، کە دەوڵەت ناچار دەکات رێز لەسەرەوەی و سەربەخۆیی و یەکێتی خاکی وڵاتانی تر بگرێت، هەروەها رێگەی لێدەگیرێت قەڵەمڕەوی خۆی بەکاربهێنێت، یان رێگە بدات تا بەکاربهێنرێت، بۆ زیان گەیاندن بە وڵاتانی تر.

بەپێی ئەم پرەنسیپە گشتییە، دەکرێت بڵێین کە هەر دەوڵەتێك بەپێی یاسا پابەندە بە پەنانەبردنە بەر کاری تیرۆری ئاراستەکراو، دژی ئاسایش و سەقامگیربوون و سەربەخۆیی وڵاتانی تر. هەروەها پابەنددەبێت بە یارمەتی نەدان، یان هاندانی تاقمە تیرۆریستەکان، بۆ ئەنجامدانی وەها کار گەلێك، یان رێگەدان بە بەکارهێنانی قەڵەمڕەوەکەیان، بۆ ئامادەکاری بۆ کاری تیرۆریستی، یان داڵدەدانی تیرۆریستان، یان پێدانی مافی پەنابەری پێیان لە خاکەکەیاندا.

و ئەم پرەنسیپە دوو رووی هەیە:

١. ڕوویەکی نێگەتیڤ: کە بریتیە لە پابەندبوونی دەوڵەت بە هاننەدانی کاری تیرۆریستی ئاراستەکراو، دژی وڵاتێکی تر.

٢. ڕوویەکی پۆزەتیف: کە بریتییە لە پابەندبوونی دەوڵەت بە گرتنەبەری هەموو ڕێوشوێنێکی پێویست بۆ ڕێگەگرتن لە بەکارهێنانی قەڵەمڕەوەکەی، بۆ ئامادەکاری بۆ کاری تیرۆر، لەدژی هەر وڵاتێکی تر.

لە پرۆژەی بە یاساکردنی تاوانە نێودەوڵەتییەکاندا، کە لیژنەی یاسای نێودەوڵەتی لە ٢٨ی ئابی ١٩٥٤دا، لەسەری ڕێکەوتن، ئەم پابەندبوونە جەختی لەسەرکرا، کە لە ماوەی دووەم لە پرۆژەکەدا هاتووە کە ئەگەر دەسەڵاتدارانی دەوڵەت هانی چالاکیی تیرۆرییانەیان دا دژی دەوڵەتێکی تر، یان چاوپۆشی کرد لە بەرامبەر چالاکییە تیرۆرییەکاندا کە بەمەبەستی ئەنجامدانی کاری تیرۆر لە وڵاتێکی تردا بێت، ئەوا بە تاوانی دژ بە ئاسایش و گیانی مرۆڤ دادەنرێت. هەمان مانا لە جاڕنامەی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکاندا دەبینین کە لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٠دا دەرچوو، کە تایبەت بوو بە پەرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتی کە پەیوەندیی و هاوکاری، لە نێوان دەوڵەتان دەگرێتەوە، بە پێی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم جاڕنامەیە جەخت دەکات لەسەر ئەوەی"پێویستە لەسەر هەر وڵاتێك زەمینە خۆش نەکات، بۆ کاری شەڕی مەدەنی و کاری تیرۆریستی، لەسەر دەوڵەتێکی ترو هانی نەدات، یان یارمەتی پێشکەش نەکات، یان تیایدا بەشداری نەکات و ڕێگە نەدات لە قەڵەمڕەوەکەیدا، چالاکیی تیرۆر ئەنجام بدرێت کە خزمەت بە ئەنجامدانی ئەم کارانە دەکات"

لەوەی سەرەوە، ڕوون دەبێتەوە کە تەنانەت لە کاتی نەبوونی دەقێکی تایبەت، بە ڕێگەگرتن یان بنبڕکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی، پابەندبوونێکی نێودەوڵەتی دەکەوێتە ئەستۆی، دەسەپێنێت بەسەریدا، کە هیچ جۆرە چالاکییەکی تیرۆریستانە، ئەنجام نەدات دژی دەوڵەتانی ترو ڕێگەنەدان بە بەکارهێنانی قەڵەمڕەوەکەیان، بۆ ئەنجامدانی وەها کارگەلێك، یان زەمینە خۆشکردن و خۆ ئامادەکرن بۆی و، ڕێگەنەدان و هاننەدان بۆ ئەنجام دانی. هەروەها دەوڵەت پابەند دەکات بە گرتنەبەری هەموو ڕێوشوێنێکی ئەمنی، بۆ ڕێگەنەدان بە کەسەکان یان

تاقمەکان لەبەکارهێنانی قەڵەمڕەوەکەیان، بۆ ئەنجامدانی تاوانی تیرۆری ئاراستەکراو دژی وڵاتانی تر، یان هاووڵاتییانیان.

لە ڕێگەی ئەو بڕگانەوە کە لە دادگا نێو دەوڵەتییەکانەوە دەرچووەو، ئەو بڕیارانەی کەرێکخراوە نێودەوڵەتییەکان پەسەندیان کردووەو، ڕێکەوتنامە گشتیو تایبەتەکان کە وڵاتان مۆریان کردووەو، یاسا نیشتمانیەکان کە بە تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە داڕێژراون، دەکرێت چەند ڕێو شوێنێکی پێویست دەستەبەر بکرێت، لەلایەن وڵاتانەوە بۆ جێبەجێ کردنی پابەندبوونە نێودەوڵەتییەکان، بۆ بنبڕکردنی کاری تیرۆرو، ئەو ڕێوشوێنانەی کە لە ڕێگەیانەوە دەکرێن، لەم خاڵانەی خوارەوەدا چڕدەکرێنەوە:

١-بوونی ڕێسایەکی گونجاوی نیشتمانی، بۆ تاوانبار کردنی ئەو کردە تیرۆرییانەی کە لە ناوەو دەرەوەی قەڵەمڕەوی دەوڵەتدا، ئەنجام دەدرێت.

٢-بوونی دامو دەزگای دادوەریو ئاسایشی کە بتوانێت هەموو ڕێساکانی تایبەت بە بنبڕ کردنی تیرۆر، یان گرتنو دادگایی کردنی تیرۆرستان پراکتیزە بکات.

٣-چڕکردنەوەی چاودێریی لەسەر ئەو ڕێکخراوو تاقمانەی کە بەپەنا بردنەبەر توندوتیژیو تیرۆر، ناویان دەرکردووە.

٤-چڕکردنەوەی چاودێریی، لەسەر بەکارهێنانی چەك یان بەجۆرێ کە نەگاتە بەدەستی تیرۆرستانو ڕێکخراوە تیرۆرستەکانەوە.

٥-ئاڵوگۆڕی زانیاری لەگەڵ وڵاتانو ڕێکخراوە نێو دەوڵەتییەکانی پەیوەندیدار، بەبنبڕکردنی تیرۆرەوە.

٦-توندکردنی ڕێوشوێنی ئەمنی، لە فڕۆکەخانەو بەندەرو ڕێڕەوە سنوورییەکان، بەجۆرێ کە ڕێگە بگیردرێت لەگواستنەوەی چەك لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر، یان دزە کردنی تاقمە تیرۆریستەکان.

٧- ڕێگە گرتن لە بەشداریی یان یارمەتی یان هاندان، بۆ ئەنجامدانی کاری تیرۆری لەوڵاتانی تردا.

٨-ڕێگەنەدان بە بەکارهێنانی قەڵەمڕەوی نیشتمانی وڵات، وەکو پەناگەیەك بۆ تیرۆریستانو، شوێنێك بۆ ئامادەکردن، یان ئاراستەکردنی چالاکی تیرۆری دژی وڵاتێکی تر.

٩-بە دەستەوەدانی ئەنجامدەرانی کاری تیرۆر کە لە قەڵەمڕەوی وڵاتدا هەن، بۆ ئەو وڵاتانەی کە داوایان دەکەن، یان ڕەوانەکردنیان بۆ دەسەڵاتە تایبەتمەندەکان بۆ دادگایی کردنیان، لەمەڕ ئەو تاوانە تیرۆرییانەی کە ئەنجامیان داوە.

١٠-لابردنی ئاکاری سیاسی لەسەر تاوانە تیرۆرییەکان، بەتایبەتی ئەوانی کە بە ئامرازی توندو تیژی، یان بەبێ جیاوازی یان ئەوانەی ئاراستەی دژی بێ تاوانان دەکرێن.

## لێکۆڵینەوەی دووەم
## بەرپرسێتی تاوانکاری لەسەر کارە تیرۆرییە نێو دەوڵەتییەکان

ئەنجامدانی کاری تیرۆری نێو دەوڵەتی بەرپرسێتی نێو دەوڵەتیی تاوانکاریی دەیبزوێنێت، بۆ هەموو کەسە ئاسایی یان کەسە مەعنەوییەکان (دەوڵەت، یان تاقمیتیرۆریستان).

**یەکەم-بەرپرسێتی تاوانکاریی نێو دەوڵەتی تاکەکان[400]:**

تاکە کەسەکان دەکرێن بە دوو بەشەوە، بە شێکیان تاکە کەسە ئاساییەکانە کە خاوەنی ئامرازی دەسەلاتی گشتی نین و بە شێوازی تایبەت بە خۆیان ڕەفتار دەکەن، دووەمیان، نوێنەرانی دەوڵەتن کە دەسەلاتیان بەناو بۆ حیسابی ئەو دەوڵەتەیە، ئەوەش دەسەلاتگەلێکە کە بەپێی پلەی پۆستەکانیان دەستەبەری دەکەن.

بەرپرسێتی تاکە کەسەکان، هیچ جیاوازییەکی لەسەر نییە، تەنیا بۆ سەلماندنی دەتوانین دادگای نۆریمبێرگ بە نموونە بهێنینەوە، کە بە راشکاوی جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە تاکەکان، نەك بونەوەرە ئەبستراکتەکان تاوان ئەنجام دەدەن کە پێویستە بەپێی یاسای نێو دەوڵەتی سزا بدرێت. یاسای تاوانکاریی نێودەوڵەتی تەنیا دان بە بەرپرسێتی کەسی بەهۆشدا دەنێتو. لەلای ولاتان، ئەو بڕوایە جێگیرە کە دەوڵەت پابەندە بە دادگایی کردن، یان بەدەستەوەدانی ئەنجامدەرانی کارە تیرۆرییەکان.

**دووەم-بەرپرسێتی تاوانکاریی نێو دەوڵەتیی کەسانی مەعنەوی:**

بەرپرسێتی کەسانی مەعنەوی (دەوڵەتو )، لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتی و ناوخۆ، لەکارە قورسو ئاڵۆزەکان دادەنرێنو، ئەگەر چی هەندێ یاسا ناوخۆییەکان پێیان وایە کە دەکرێت کۆمپانیا بازرگانییەکان، لەمەڕ

---

[400] بڕوانە: د. احمد محمد رفعت(لدراسە القانون الدولی لحقوق الانسان) ١٩٨٥، ل١٠٣و دواتر.

تاوانکارییەکان و، بەتایبەتی تاوانە ئابوورییەکان دادگایی بکرێن و هەندێ سزای داراییان بەسەردا بسەپێنرێت.

دەبینین کە راپۆرتی بەرپرسێتی تاوانکاریی دەوڵەت، وای لێدەکات هەست بە ئاستی هەڵەکەی خۆی بکات، لە بەرامبەر کۆمەڵەی نێودەوڵەتییدا، هەروەها بەرپرسێتی دەوڵەت، لەلایەن ویستی بە کۆمەڵی نەتەوە پاساوی بۆ دەهێنێتەوە، لەسەر بنەمای ئەوەی کە هەر کۆمەڵێك خاوەنی هەستو سۆزو ویستی جیاوازە لە ئەندامانی و، دواتر دەبێتە هۆی بڕیاردان، لەسەر بەرپرسێتی نێو دەوڵەتیی تاوانکاریی دەوڵەت، بۆ وەبیر هێنانەوەی هەر تاکێك کە دەکرێت هەندێکی بسەپێنرێت، ئەمەش وا دەکات کە رێگە لە روودانی تاوانە نێو دەوڵەتییەکان بگیرێت.

دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە ئەگەر بەرپرسێتی دەوڵەت، لەرووی تیۆرییەوە وێنا کرابێت، ئەوا لەرووی عەمەلییەوە بەو شێوەیە نییە، لەبەر ئەوەی هیچ شتێك نییە دەوڵەت ناچاری بکات، لەبەردەم دادوەری تاوانی نێو دەوڵەتیدا ئامادە ببێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، دەکرێت بڕیار لەسەر هەندێ سزا بدرێت کە بگونجێت، لەگەڵ سروشتی یاسایی دەوڵەتدا: وەکو سزای ئابووری و، بڕینی پەیوەندیی دبلۆماسی و، سزای دارایی و، ئابلۆقەی دەریایی و پچڕاندنی پەیوەندی، ئەگەر هاتوو دانانی سزاکانی تری، وەکو زیندانی کردن نەکرا، بەهۆی خۆیەتی و سروشتی خودی دەوڵەتەکە، کە رێگە دەگرێت، تەنانەت لە وێناکردنی ئامادەبوونی (وەکو بوونەوەرێکی ئەبستراکت) لەبەردەم دادوەری نێو دەوڵەتیدا.

واتە دەتوانین جەخت لەسەر ئەوە بکەین کە لە چوارچێوەی تیۆری نێو دەوڵەتیدا، پێویستە سزا لەسەر هەموو ئەوانە دابنرێت کە کاری تیرۆری ئەنجام دەدەن، ئەگەر ویستمان تاوانکارییە گەورەکان بەبێ سزا نەمێننەوە، بەوەی کە کارە تیرۆرییەکان، بەشێوەیەکی گشتی بەپێچەوانەی هەموو بنەما یاساییەکانە کە لە سەرجەم سستمە یاسای (نێو دەوڵەتی و ناوخۆیی) دا هەیە، هەروەها ناگونجێت لەگەڵ ئەگەری گەیشتن، بەرێگە چارەیەکی ئاشتییانە کە یاسای

نێودەوڵەتی و ناوخۆیی پەسەندی بکات، هەروەها پێویستە دەوڵەتان پابەندبن بەو پرەنسیپەوە کە دەخوازێت ئەنجامدەرانی کارە تیرۆرییەکان سزا بدرێن، یان بدرێنە بەدەست ئەو شوێنانەی کە داوایان دەکەن.

**سێیەم-ئامرازەکانی بنبڕکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی:**

چالاکی بنبڕکردنی هەر دیاردەیەکی ناڕەوا، لەوەدا دەبێت کە چەندە ئامراز لە ئارادایە بۆ بنبڕکردنی، یان لانی کەم سووککردنی. گرنگترین ئامرازەکانی بنبڕکردنی تیرۆری نێو دەوڵەتی کە ئەمانەن:

١-گرتنەبەری ڕێوشوێنی چالاک دژی ئەو دەوڵەتەی مافی مرۆڤ و گەلان پێشێل دەکات.

٢-دامەزراندنی دادگایەکی تاوانکاریی نێو دەوڵەتی هەمیشەیی، بۆ دادگایکردنی ئەنجامدەرانی تاوانە تیرۆرییەکان.

٣-هاوکاریی لە نێوان دەوڵەتاندا، لەسەر ئاستێکی بەرفراوان لە بواری بنبڕکردنی تیرۆردا.

٤-بایەخدانی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، بەچەقبەستن لەسەر مەترسیی تیرۆری نێو دەوڵەتی و شوێنەوارە رووخێنەرەکانی.

٥-گرتنەبەری ڕێوشوێنی بەکۆ، بۆ دابڕینی ئەو دەوڵەتەی کە لە ڕێگەی ڕەفتاری جێگیرو ناجێگیریەوە، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، هانی تیرۆری نێو دەوڵەتی دەدات.

٦-دادگایکردنی ئەنجامدەرانی تاوانی تیرۆری نێو دەوڵەتی، لە بەرامبەر دادی ناوخۆی دەوڵەتداو دیاریکردنی توندترین سزا بۆیان.

٧-بە یاساکردنی تاوانەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی.

٨-تاوانەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی بە تاوانی سیاسی دانەنرێت.

٩-بڕیاردان لەسەر بەرپرسێتی نێودەوڵەتی تاوانکاری، بۆ ئەنجامدەرانی کارە تیرۆریی نێودەوڵەتییەکان، چ دەوڵەت بن یان تاک.

١٠-چوونە ڕیزی ئەو ڕێکەوتنامە نێو دەوڵەتییانەوە کە جۆرە هاوکارییەکی نێودەوڵەتی، لە بواری بنبڕکردنی تیرۆردا تێدایە.

# بەشی حەوتەم

## هاوکاریی نێو دەوڵەتی بۆ بنبڕکردنی تیرۆر

پراکتیزە کردنە نێو دەوڵتییەکان سەلماندیان کە تاوانە تیرۆرییەکان نابەستریێنەوە بە سنووری دیاریکراوەوە، ئەنجامدەرانی ئەم تاوانانە ڕەنگە خۆیان ئامادە بکەن بۆ تاوانانەکانیان لەولاتێکدا، دواتر تاوانەکەیان لە ولاتی سێهەمدا ئەنجام دەدەن. بۆیە پێویستە ولاتان هاوکاریی یەکتر بکەن، لە پێناوی دەستگیر کردنی ئەنجامدەرانی ئەم تاوانانەو ڕێگەنەدەن دەربازبن، لە چنگی عەدالەتو دادگایی بکرێن و سزای توندیان بەسەردا بسەپێنرێت و. هاوکاریی نێودەوڵەتی، بۆ بنبڕکردنی تیرۆر دەخوازێت ولاتان ڕێ بکەون، لەسەر بەخشینی دەسەلاتی دادوەری لەم جۆرە تاوانانەدا، بەو دەوڵەتەی کە لەوانی تر توانایی زیاترە، بۆ پراکتیزە کردنی ئەم دەسەلاتەو، گەشەپێدانی ڕیساکانی تایبەت بە بەدەستەوەدانی ئەنجامدەری تاوانەکە، یان گومان لێکراوەکە، ئەگەر هاتوو وای کرد بۆ قەڵەمڕەویدا ولاتێکی تر، جگە لەو ولاتەی کە تاوانەکەی لە قەڵەمڕەویدا ئەنجام داوە، هەروەها بەدەستەوەدانی هاورێکانی کە نیشتەجێی قەڵەمڕەوی دەوڵەتێك یان دەوڵەتانی ترن و، ئەمەش دەخوازێت کە بنەماو ڕێوشوێنی ئەوتۆ دابنرێت کە لە ڕێگەیانەوە بتوانرێت ئەنجامدەرانی تاوانە تیرۆرییەکان بەدەستەوە بدرێن، بۆ دادگایکردنیان و بەستنی ڕێکەوتننامەی نێودەوڵەتیی دوو قۆڵی، یان بەکۆ، کە زەمینە بۆ بەدەستەوەدان، لەبەرامبەر ئەو دەوڵەتانەدا بڕەخسێنێت کە داوای بەدەستەوەدانی دەکەن و، لە ڕێگەی یاساوە ڕێگەی پێدراوە، لەلایەن ئەو دەوڵەتانەوە کە داوایان لێدەکرێت. جگە لە گرنگیی هاوکاریی ئاڵوگۆڕکراوی دادوەری کە بە دواچوون و دەستگیرکردنی ئەنجامدەرانی کارە تیرۆرییەکان دابین دەکات.

لـێرەوە هـەوڵ دەدەیـن هـەندێ لـە ئامرازەکـانی هاوکـاریی نێودەوڵـەتی بخەینـەڕوو، بـۆ ڕێگـە گرتـن لـە کـارە تیرۆرییـەکان و بنبڕکردنیـان، یـان سەرکوتکردنیان، لە کاتی ڕوودانیاندا. و ئەم ئامرازانانە جۆراوجـۆرن لـە نێـوان ئـەوەی کـە ڕێکەوتننامـە نێودەوڵەتییـەکان بڕیاریـان لەسـەرداوە، یـان ئـەوەی ڕێکخـراوە نێودەوڵەتییـەکان رایدەسپێرن، یـان ئـەو ئـامرازە ئـەمنی و دادوەری و سیاسییانەی، لە یاسا نیشتیمانیەکاندا هاتوون.

## لێکۆڵینەوەی یەکەم

## هاوکاریی نێودەوڵەتی، بۆ ڕێگەگرتن و نەهێشتنی کارە تیرۆرییەکان

هاوکاریی نێودەوڵەتی دەیەوێت دەوڵەتان هانبدات بۆ یەکخستنی هەوڵەکانیان و تواناکانیان و، بۆ ڕێگەگرتن لە ڕوودانی کارە تیرۆرییەکان و شکست هێنان بە پیلانە تیرۆرییەکان. و لە حاڵەتانەی کە ئەم تاوانانەیان تیایدا ڕوودەدات، هاوکاریی نێودەوڵەتی شێوازێکی تر بەخۆوە دەگرێت و ڕەهەندێکی جیاواز، بە مەبەستی بنبڕکردنی کارە تیرۆرییەکان و بە ڕاونانی ئەنجامدەرانیان و دەستگیرکردنیان و دادگایکردنیان و سزادانیان.

**یەکەم- هاوکاری نێودەوڵەتی، بۆ ڕێگەگرتن لە کارە تیرۆرییەکان:**

هاوکاریی نێودەوڵەتی، لە چەند ڕێگەیەك و ئامرازێکەوە بەدیدێت کە دەکرێ پەنایان بۆ ببرێت، بۆ ڕێگەگرتن لە کارە تیرۆرییەکان. ئەو شێوازانە دەگۆڕێن، بەپێی جۆری کارە تیرۆرییەکەو ئەو مەبەستانەی لە پێناویاندا ئاراستە دەکرێن.

١-ئەو ڕێوشوێنانەی دەگیرێنەبەر، بۆ ڕێگەگرتن لە دەستبەسەراگرتنی ناڕەوای فڕۆکە:

أ-پشکنینی گەشتیاران و دڵنیابوون، لە جۆری ئەو شتانەی پێیانە، ئەویش لە ڕێگەی پشکنینی بەدەست، یان بەکارهێنانی ئامێری ئەلکترۆنی.

بڕیاری کۆمەڵەی گشتیی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی فڕۆکەوانیی مەدەنی ڕێگە، لە هەڵگرتنی چەك دەگرێت، لەلایەن کەسەکانەوە لەناو فڕکەدا یان گەڕان بەدوایدا. هەروەها بە پێویستی دەزانێت ڕێوشوێنی پشکنین و بەکارهێنانی ئامێری دۆزینەوەو کۆنترۆڵکردنی چەك بگیرێتەبەر، کە گەشتیارەکان لەگەڵ خۆیاندا، یان لەناو کەل و پەلەکانیاندا هەڵیدەگرن[٤٠١].

---

[٤٠١] بڕوانە: *A17-10,1970*

ب-پارێزگاری لە فڕۆکەخانەکان، لە رێگەی پاسەوانیی چەکدارانەوە، لەگەڵ پێویستی فەراهەمکردنی هێزی بە توانای ئەمنییەوە، بە ئامێری بێ سیمو هەموو کارئاسانییەکی ترەوە، بۆ پاراستنی فڕۆکەکان لەسەر زەویدا.

ج-لێکۆڵینەوە لە گەشتیاران، لە رێگەی بەراوردکردنی ناویان لە پاساپۆرتەکانیان، لەگەڵ پێناسەکانیاندا. و بڕیاری کۆمەڵەی گشتی رێکخراوی نێودەوڵەتیی فڕۆکەوانیی مەدەنی رێگە دەدات، بەکارمەندانی ئاسایش، هەر کاتێ بیانەوێت تەماشای پاساپۆرتەکان بکەن، بۆ دڵنیابوون لە کەسایەتی گەشتیاران لە ناو فڕۆکەدا.

٢-ئەو رێوشوێنانەی دەگیرێنەبەر بۆ رێگەگرتن، بەشێوەیەکی گشتی لە تاوانە تیرۆرییەکاندا:

**أ-هاوکاریی ئاڵوگۆڕکراو، لە نێوان دامو دەزگاکانی پۆلیسی تاوان کە پسپۆڕن لە کردەکانی بنبڕکردنی تیرۆر لە وڵاتاندا.**

بەوەی یەکێکە لە شێوازە گرنگەکان، بۆ رێگەگرتن لە روودانی تاوانی تیرۆرو دەستگیرکردنی ئەنجامدەرانی رووداوە تیرۆرییەکان. و ئاڵوگۆڕکردنی زانیاریی لە نێوان دامودەزگاکانی پۆلیس، لەزۆربەی وڵاتاندا، بەتایبەتی لە وڵاتانی ئەورووپای رۆژئاوادا، بۆ لەباربردنی زۆربەی پیلانە تیرۆرییەکانو دەستگیرکردنی ئەنجامدەرانی کاری تیرۆر. و یارمەتی ئاڵوگۆڕکراو لە نێوان دامودەزگاکانی پۆلیسدا، لە رێگەی رێکخراوی نێودەوڵەتیی پۆلیسی تاوان(ئەنترۆپۆل)وە ئەنجام دەدرێت. و دەسەڵاتی یۆنان لە ساڵی ١٩٧٦دا، توانی یەکێك لە تیرۆریستانی ئەڵمانیای رۆژئاوا دەستگیر بکات، بەهۆی ئەو وێنانەوە کە رێکخراوەکە پێشکەشی ئەم دەسەڵاتەی کرد.[٤٠٢]

رەنگە ئەو هاوکارییە ئاڵوگۆڕکراوانە، لە چوارچێوەی پەیوەندیی دو قۆڵیی نێوان وڵاتانەوە بێت، یان لە رێگەی رێکخراوە هەرێمییەکانەوە، لەرێگەی یەکخستنی هەوڵەکانی وڵاتانی ئەندام تێیدا، لە بواری بنبڕکردنی تیرۆر. هەروەها

---

[٤٠٢] بڕوانە: د. عبدالعزیز مخیمر(الارهاب الدولی) ، ١٩٨٦، ل٢٨٩.

دەکرێ چەند یەکەیەك، لە هێزی تایبەتی مەشق پێکراو دروست بکرێت، بۆ دەستبەکاربوونی خێرا، بۆ رزگارکردنی بە بارمتە گیراوان، لەسەر داوای ئەو حکومەتانەی رووبەرووی رووداوی تیرۆرییانە دەبنەوەو گەڵێ لە بڕیارەکان کە لە رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە دەرچوون، داوای هاوکاریی نێودەوڵەتی دەکەن. بۆ رێگەگرتن لە تیرۆر بە تایبەتی لەنێوان دامو دەزگاکانی پۆلیس کە تایبەتمەندن، بەم جۆرە تاوانە ترسناکانەوە.

رەنگە هاوکاریی نێودەوڵەتی، لە نێوان دامو دەزگاکانی پۆلیسدا بەشداری بکەن لە بەدیهێنانی هاوکاریی دادوەری ئاڵوگۆڕ، کاتێ کە دامو دەزگاکانی پۆلیس رادەسپێردرێن بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانیان لە وڵاتێکی تردا، لەسەر داوای دەسەڵاتی دادوەری دادگا.

**ب-ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری، سەبارەت بە کەسەکان و رێکخراوە تیرۆرییەکان:**

رێکەوتنامە نێودەوڵەتییە تایبەتەکان بە رێگەگرتن لە تیرۆری نێودەوڵەتی، چەندین دەقیان تێدایە کە وڵاتانی ئەندام پابەند دەکەن، بەگرتنەبەری رێوشوێنی گونجاو، بۆ رێگەگرتن لە روودانی تاوانی تیرۆرو، لەوانە پێویستی ئاڵوگۆڕکردنی زانیاریی، سەبارەت بەو تاوانانەو ئەنجامدەرانیان و ئەو رێوشوێنانەی کە دژیان کراوەو هەر زانیارییەکی تر رەنگە یارمەتیدەربن، بۆ لەباربردنی پیلانە تیرۆرییەکان و کۆنترۆڵکردنی رێکخراوە تیرۆریستەکان. و بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە، لە مادەی شەشەم لە رێکەوتنامەی نیۆیۆرك، سەبارەت بە پاراستنی ئەو کەسانەی لەژێر چاودێریی نێودەوڵەتیدان، هاتووە کە ئەگەر کەسی تاوانبار دەستگیرکرا،بەو تاوانانەی لە رێکەوتنامەکەدا ئاماژەیان پێکراوە، دەبێ ئاگاداری وڵاتە پەیوەندیدارەکان بکرێت، بەو تاوانانەو ئەو رێوشوێنانەی کە رەچاوکراون. و ئەم رێوشوێنانەش، لە رێگەی ئاگادارکردنەوەی راستەوخۆ، یان لە رێگەی سکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە دەبێت. هەروەها رێکەوتنامەکە داوا لە وڵاتان دەکات هاوکاری بکەن، بۆ رێگەگرتن لەو تاوانانەی لە رێکەوتنامەکەدا، ئاماژەیان پێکراوە، لەگەڵ گرتنەبەری رێوشوێنی پێویست، بۆ ئەو مەبەستەو،

ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری‌و یەکخستنی ڕێوشوێنی کارگێڕی، یان هەر ڕێوشوێنێکی تر لەم بارەوە.

شایانی باسەکە ئەو جاڕنامە تایبەتەی لە لیژنەی وەزیرانی ئەنجومەنی ئەورووپا لە ساڵی ١٩٧٨دا دەرچوو، ئاماژە دەکات بە پێویستی پابەندبوونی وڵاتانی ئەندام، بە ئەولەویەتدان بە چاکسازیی ئامرازەکانی گەیاندنی خێرای زانیارییە تایبەتەکان، بە ڕووداوە تیرۆرییەکان بە وڵاتانی پەیوەندیدارەوەو بارودۆخی ڕووداوەکان‌و ئەو ڕێوشوێنانەی دەگیرێنەبەر دژی ئەنجامدەرانی.

**دووەم- هاوکاریی نێودەوڵەتی، بۆ بنبڕکردنی کارە تیرۆرییەکان:**

بۆ بنبڕکردنی تیرۆر پێویستە هاوکاریی نێودەوڵەتی هەبێت، لە نێوان وڵاتانی پەیوەندیداردا، بۆ توندکردنی ئابڵۆقەی سەر تیرۆریستان‌و، ئاسانکردنی دەستگیرکردنیان‌و دادگایکردنیان، یان بەدەستەوەدانیان، بۆ ئەو وڵاتانەی دەیانەوێت دادگاییان بکەن. هەروەها کردەکانی بنبڕکردن پێویستیان بە پێشکەشکردنی یارمەتی دادوەری هەیە، بۆ کۆکردنەوەی بەڵگەکان‌و ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەو گەڕان بەدوای تاوانباران‌و دەستگیرکردنیان‌و، کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ڕێکخراوو تاقمە تیرۆرییەکان کە دەستیان لەو کردانەدا هەیە. بنبڕکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی پێویستی بە هاوکاریی دەوڵەتانە، لەو مەسەلانەدا کە پەیوەندییان بە بەدەستەوەدانە، لە تاوانە تیرۆرییەکانداو دامەزراندنی دەسەڵاتی دادوەری بە جۆرێ کە لەمپەڕ لەبەردەم بەدیهێنانی عەدالەتدا دروست نەکات‌و، ئاڵوگۆڕکردنی هاوکاریی دادوەری. هەروەها هەندێ لە وڵاتان پەنا دەبەنەبەر ئەوەی، هەندێ خاڵ تێهەڵکێشی یاسا تایبەتەکانیان، بەبنبڕکردنی تیرۆر بکەن کە تایبەتن بە خەڵاتکردن‌و هاندانی تاوانکاریی تاوانەکانی تیرۆر، بۆ هاوکاریی لەگەڵ عەدالەتدا، بۆ دەستگیرکردنی هاوکارەکانیان، یان ئەو ڕێکخراوانەی کاریان بۆ دەکەن، لەبەرامبەر سووککردنی سزاکانیان، یان بەخشینیان.

**١-بەدەستەوەدان لە تاوانە تیرۆرییەکاندا:**

بەدەستەوەدان ئەو ڕێوشوێنەیە کە دەوڵەتێك دەست لە کەسێك هەڵبگرێت کە لە قەڵەمڕەوەکەیدا بێت، بۆ دەسەڵاتی وڵاتێکی تر کە داوای بە دەستەوەدانی

دەکات، بەمەبەستی دادگایی کردنی، یان جێبەجێ کردنی بڕیارێك کە دژی دەچووە بۆ سزادانی[٤٠٣]. و بەدەستەوەدانی تاوانباران لە تاوانە تیرۆرییەکاندا بایەخێکی گەورە پەیدا دەکات، ئەگەر تاوانباران توانیان هەڵبێن و پەنا ببنەبەر وڵاتی تر. یان ئەوەی تاوانەکە ئامادەکاری بۆ کرابێت و لەلایەن کەسان و تاقمەکان یان رێکخراوەکانەوە جگە لەو وڵاتەی کە تاوانەکەی تیادا ئەنجام درابێت.

رێسای بنگرتوو لە زانست و داد دا، ئەوەیە کە بەدەستەوەدان لەتاوانە سیاسیەکاندا ئەنجام نەدرێت، ئەمەش وا لە ئەنجامدەری تاوانی تیرۆر دەکات دەرباز بێت لە سزا دان، بەهەڵهاتن بۆ قەڵەمڕەوی وڵاتانی ترو ڕاگەیاندنی ئەوەی کە ئەنجامی داوە، دەکەوێتە چوارچێوەی تاوانی سیاسیەوە کە ئەمەش وا دەکات ئەو وڵاتەی کە تاوانبارەکەی تێدایە، نە توانێت بیدات بە دەستی وڵاتی پەیوەندیدارەوە بە دادگایکردنی. و هەندێ جار ڕوودەدات کە ئەو وڵاتەی تاوانبارەکەی تێدایە، لە قەڵەمڕەوی خۆیدا، دادگایی بکات، بەهۆی ئەوەی خاڵێکی یاسایی سزادان، ئەو تاوانانە ناگرێتەوە کە لە دەرەوە دا ئەنجام دەدرێت[٤٠٤].

لە بەرامبەر هەڵشکانی کردەکانی توندوتیژی و تیرۆر، بەو رەهەندە کار دەکرێت کە ئاکاری سیاسی لە تاوانەکانی تیرۆر دابماڵرێت و، بکرێن بە تاوانەکانی یاسای گشتی کە دەکرێ تیایاندا بەدەستەوەدان ئەنجام بدرێت. و گەلێ لە یاسانیشتیمانییەکان و رێکەوتننامە نێودەوڵەتییە تایبەتەکان، بە بەدەستەوەدانی تاوانکاران و بنبڕکردنی تیرۆری نێودەوڵەتی، ئەم ئاراستەکردنە نوێییەیان رەچاو کردو، دواتر ئەگەری بەدەستەوەدانی ئەنجامدەرانی ئەم تاوانانە بەبێ هیچ لەمپەرێکی یاسایی هاتە ئاراوە.

---

[٤٠٣] بڕوانە: د. نجاتي سيد احمد سند(نظرية الجريمة السياسية في القوانين الوضعيتە المقارنة في الشريعة الاسلامية)، ١٩٨٤، ل٤٤.

[٤٠٤] بڕوانە: (التشريع السويدي)، :کەلە٦ی کانونی یەکەمی ١٩٥٧ دەرچووە، هەروەها(القانون الفرنسي) کەلە٢٣ی مارتی ١٩٢٧دا و، (التشريع السويسري) کەلە٢٢ی کانونی دووەمی ١٨٩٢دا دەرچووە.

لە ڕێکەوتنامەی لاهای ساڵی ١٩٧٠دا، تاوانی زەوتکردنی ناڕەوای فڕۆکە، بەو تاوانانە دانرا کە دەکرێت کاری بەدەستەوەدانی تیایدا ئەنجام بدرێت‌و، مادەی هەشتەم لە ڕێکەوتنامەکە، ئەو بڕگانە پوختە دەکات کە تایبەتن بە بەدەستەوەدانی رفێنەرانی فڕۆکە، چ ڕێکەوتننامەی بەدەستەوەدان هەبێت یان نەبێت، لەو ڕێکەوتنامانەدا. و لە بڕگەی دووەمی مادەی هەشتەمدا، هاتووە:"ئەگەر دەوڵەتێکی ئەندام، بوونی ڕێکەوتننامەی بەدەستەوەدانی بەمەرج دانا، بۆ بەدەستەوەدان، وەکو داوایەك بۆ بەدەستەوەدان لە وڵاتێکی تری ئەندامدا، ڕێکەوتنامەیەك لە نێوانیاندا نەبێت، ئەوا دەتوانێت ئەو ڕێکەوتنامەیە بکاتە بنەمایەکی یاسایی بۆ بەدەستەوەدان، سەبارەت بە تاوانەکەو بەدەستەوەدان، بە پێی هەلومەرجی تر دەبێت کە لە یاسای ئەو دەوڵەتەدا هاتووە کە داوای بەدەستەوەدانی لێدەکرێت".

ڕێکەوتنامەی، ئەورووپا بۆ بنبڕکردنی تیرۆری ساڵی ١٩٧٦، لە مادەی یەکەمیدا هاتووە کە ئاکاری سیاسی لەو تاوانانە هەڵبوەشێتەوە کە لە دەقەکانی ئەم مادەیەدا هاتوون، بەمەبەستی ئەوەی ڕێوشوێنی بەدەستەوەدان بگرێتەوە.

هەروەها مادەی دووەم ڕێگە بە هەر وڵاتێکی ئەندام دەدات، ئاکاری سیاسی لە کردەوە ترسناکەکان‌و کارەکانی توندوتیژی بسڕێتەوە کە لە مادەی یەکەمدا هاتوون، و دژی ژیان‌و گیان‌و ئازادیی کەسەکانەو، هەورەها ئەو کارانەی دژی سامانەکان ئاراستەدەکرێن، کاتێ مەترسییەکی بە کۆی، بۆ کەسان لێبکەوێتەوە.

ڕێکەوتنامەی نیۆیۆرکی ساڵی ١٩٧٣ تایبەتە بەڕێگەگرتن‌و سزادانی ئەو تاوانانەی دژی کەسە دبلۆماسییەکان ئەنجام دەدرێن، لەمەسەلەی بەدەستەوەداندا، هەمان ئەو بڕگانە ڕەچاو دەکات کە پێشتر لە ڕێکەوتنامەی لاهای ساڵی ١٩٧٠دا هاتوون. مادەی ١/٨ی ڕێکەوتنامەیە، ئەو تاوانانەی لەم ماوەیەدا ئاماژەیان پێکراوە، بەو تاوانانە دادەنێت کە دەکرێت کاری بەدەستەوەدانیان تیادا ئەنجام بدرێت کە لە هەر ڕێکەوتننامەیەکی لەو بابەتەدا هەبێت کە لە نێوان وڵاتانی یەك ڕێکەوتنامەدا هەیە. هەروەها داوا لەو وڵاتانە دەکات، لە نێوانیاندا مۆر دەکرێت.

**٢-دەسەڵاتی دادوەری، لە تاوانەکانی تیرۆردا:**

دەسەڵاتی دادوەری بایەخێکی گەورەپەیدا دەکات، ئەگەر هاتوو مەسەلەی بەدەستەوەدانی ئەنجامدەرانی تاوانی تیرۆر رەتکرایەوە، لەلایەن ئەو وڵاتەی داوای لێدەکرێت کاری بەدەستەوەدان ئەنجام بدات. لەو کاتەدا، دەبێ هەستێت بە دادگایکردنی ئەنجامدەری تاوانەکە.

هەموو رێکەوتنامە نێودەوڵەتییەکان، لەگەڵ پرەنسیپی بەدەستەوەدان یان سزادانداو بەپێی ئەم پرەنسیپە، دەبێ دەسەڵاتی دادگایی دەوڵەت دابمەزرێت، بۆ ئەو تاوانە تیرۆرییانە کاتێ تاوانبار سزای خۆی وەربگرێت.

هاوکاریی نێودەوڵەتی رۆڵێکی گرنگ دەبینێت، لە مەسەلەی دامەزراندنی دادوەری، لە تاوانەکانی تیرۆری نێودەوڵەتیدا، ئەویش لە رێگەی بەستنی چەند رێکەوتنامەیەکی نێودەوڵەتییەوە کە وڵاتانی ئەندام پابەند دەکات، بەرەوانەکردنی ئەنجامدەرانی تاوانە تیرۆرییەکان، بۆ دادگایکردنیان، ئەگەر هاتوو نەیدا بەدەستی ئەو وڵاتەی کە داوای دەکات، یان ئەگەر لەمپەری یاسایی هەبوو، رێگەی نەدا داوای بەدەستەوەدان سەر بگرێت، وەکو ئەوەی تاوانبار هاووڵاتیی ئەو وڵاتە بێت کە داوا بەدەستەوەدانی لێدەکرێت، یان ئەوەی تاوانەکە لە قەڵەمڕەوەکەیدا ئەنجام درابێت، یان ئەوەی بەپێی مەزەندەی خۆی، هاندەری سیاسی لە پیشتەوە بێت. ئەمەش وا دەخوازێت کە وڵاتی پەیوەندیدار ئەو تاوانانە، لە یاساکانی سزادانی خۆیدا دابنێت.

هەروەها دەکرێ هاوکاری نێودەوڵەتی، لەرێگەی رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە، رۆڵی گرنگی هەبێت، بۆ راماڵینی ئەو لەمپەڕانەی رێگە لە مەسەلەی دەسەڵاتی دادوەری دەگرن، ئەویش بەدەرکدرنی بریار گەلێ کە وڵاتان پابەند بکات، بە پەنا بردنەبەر یارمەتیی دادوەریی ئاڵوگۆڕکراو، بۆ نەهێشتنی تاوانە تیرۆرییەکان و راسپاردن بە راماڵینی سزای یاسایی کە رەنگە لە یاسا نیشتیمانیەکاندا هەبێت و رێگە لە بەدەستەوەدان، یان دادگایکردنی تاوانبارانی بگرێت.

لە مادەی حەوتەمی رێکەوتنامەی لاهای ساڵی ١٩٧٠دا هاتووە:

"ئەگەر وڵاتی ئەندامی ڕێکەوتنامەکە هەڵنەستێت بە بەدەستەوەدانی ئەو تاوانبارەی لە قەڵەمڕەوەکەیدایە، ئەوا دەبێ -بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی چ کەسێکەو، بەبێ گوێدان بەوەی ئاخۆ تاوانەکە لە قەڵەمڕەوەکەیدا ڕوویدا بێت یان نەء- کێشەکە ڕەوانەی دەسەڵاتە تایبەتمەندەکان بکات بۆ دادگایکردنی و، پێویستە لەسەر ئەم دەسەڵاتانە، بەهەمان شێوە بڕیاربدات کە ڕەچاو دەکرێت، سەبارەت بەهەر تاوانێکی ئاسایی گەورە. ئەویش بەپێی یاسای ئەو وڵاتە". هەروەها لە مادەی حەوتەمی ڕێکەوتنامەی نیۆیۆرك، سەبارەت بە پارێزگاریی لە کەسایەتییە دبلۆماسییەکان لە ساڵی ١٩٧٣دا، بەوەی دەوڵەتی ڕێکەوتنامەکە کە تاوانبارەکە لە قەڵەمڕەویدایەو، هەڵناستێت بە بەدەستەوەدانی، یان ئەوەی کێشەکە بەبێ دواخستن ناخاتە بەردەم دەسەڵاتە تایبەتمەندەکانەوە، بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەکە، بە پێی ئەو ڕێوشوێنانەی لە یاسای ئەو دەوڵەتەدا هەیە.

### ٣-هاوکاریی دادوەریی نێودەوڵەتی:

یارمەتیی دادوەری ئەو ڕێوشوێنە دادوەرییەیەکە پراکتیزەکردنی پسپۆڕیو دەسەڵاتی دادوەری ئاسان دەکات لە وڵاتێکی تردا، سەبارەت بە یەکێك لە تاوانەکان[٤٠٥]. و زۆربەی ڕێکەوتنامە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە بنبڕکردنی تیرۆر، چەند دەقێکیان تێدایە، بۆ پەنابردنە بەر پشتگیریی دادوەریی ئاڵوگۆڕکراو، لەنێوان وڵاتانی ڕێکەوتنامەکەدا، لە پێناوی بەدیهێنانی چالاکییەکەو خێرایی، لەگرتنەبەری ڕێوشوێنی ترو سزادانی تاوانەکانی تیرۆر.

پابەندبوونی نێودەوڵەتی، بە پەنابردنە بەر هاوکاریی دادوەریی ئاڵوگۆڕکراو، بۆ بنبڕکردنی کارەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی، پێداویستییەکانی بەرژەوەندیی گشتیی هەموو وڵاتان پاساوی بۆ دەهێنێتەوە، بۆ ڕووبەڕووبوونەوە، لەگەڵ کارە تیرۆرییەکانداو، بنەما یاساییەکانیان لە پرەنسیپە گشتییەکانی یاساو ڕێساکانی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا دەبیننەوە کە هەموو تەبان، لەسەر ئەوەی تاوانو کاری

---

[٤٠٥] بڕوانە: د. عبدالعزیز الرحیم صدقی(التعاون القضائي الدولي في الفکر المعاصر) ڕاپۆرتێکە پێشکەشکراوە بە کۆنگرەی(١٣)ی یاسای سزاکان، قاهیرە ١-٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٤.

وێرانکاری و توندوتیژی بنبڕبکرێت، هەروەها پرەنسیپە گشتییەکانی یاسای نێودەوڵەتی و رێکەوتنامە نێودەوڵەتییەکانی، تایبەت بە بنبڕکردنی تیرۆر، جەختی لەسەر دەکەن.

رێکەوتنامەی لاهای و[٤٠٦]، رێکەوتنامەی مۆنتریال و[٤٠٧]، رێکەوتنامەی نیویۆرک[٤٠٨]، هاوکاری دادوەریی ئاڵوگۆڕکراو، بۆ بنبڕکردنی تاوانەکانی تیرۆر. ئەگەرچی ئەم رێکەوتنامانە، تەنیا جەخت لەسەر پرەنسیپی هاوکاریی دادوەریی ئاڵوگۆڕکراو دەکەن، بۆ بنبڕکردنی تیرۆر، بەبێ دیاریکردنی مەبەست لێی، بەڵام ئەم هاوکارییە، رەنگە چەند شێوازێك بەخۆوە بگرێت، لەوانە:

أ-بەدەستەوەدانی تاوانبارانی تاوانەکانی تیرۆری نێودەوڵەتی، بۆ ئەو وڵاتەی داوایان دەکات.

ب-جێگیریی دادوەری لە لێکۆڵینەوەدا، کە هەموو ئەو رێوشوێنانەی لێکۆڵینەوە دەگرێتەوە کە دادوەرێك دەیدات بە دادوەرێکی بێگانە، یان بە ئەفسەرێکی پۆلیسی دادوەری، تا لە جیاتی ئەو کارەکانی لێکۆڵینەوە ئەنجام بدات.

ج-هاوکاریی دادوەری لە مادە تاوانکارییەکاندا، بە ئاسانکردنی رێوشوێنی تاوانکاری، لە رێگەی هاوکاری لە کۆکردنەوەی بەڵگەکانی تاوانبارکردنی و رێوشوێنەکانی لێکۆڵینەوەو پێشکەش کردنی ئەو زانیاری و بەڵگەنامانە کە دەسەڵاتی دادوەریی بێگانە داوای دەکات.

د-گواستنەوەی لاپەڕەکانی حاڵەتی تاوانکاریی، لە رێگەی ئەو بڵاوکراوانەوە کە تاوانبارکردنی تێدایە، لە تاوان و کەتن و سەرپێچییەکاندا، لەگەڵ رێگەدان بە دەسەڵاتی دادوەریی لەهەر دەوڵەتێك، لە کاتی ئەنجامدانی توێژینەوەی تاوانکاری، تا وێنەیەك لەو لاپەڕەیەی دەست بکەوێت کە تایبەتە بە حاڵەتی تاوانکاریی تایبەت بە تاوانبارەوە، لەو دەوڵەتەی کە تاوانبارەکە هاووڵاتییەتی.

---

[٤٠٦] مادەی(١٠) لە رێکەوتنامەکە.

[٤٠٧] مادەی(١١) لە رێکەوتننامەکە.

[٤٠٨] مادەی(١٠) لە رێکەوتننامەکە.

ه-گواستنەوە یان پەسەندکردنی ڕێوشوێنە سەرکوتکارییەکان، بەپێی ڕێکەوتنێك، یان بەپێی ئەو یاساو ڕێسایانەی کاری پێدەکرێت، لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر، سەبارەت بە تاوانێك کە لەهەر یەکێکیاندا ئەنجام بدرێت، بۆ وڵاتەکەی تر.

و-گواستنەوە یان پەسەندکردنی جێبەجێکردنی بڕگە دادوەرییەکان. واتە هەموو ئەو ڕێوشوێنانەی کە دەسەڵاتی جێبەجێکردنی دەردێت بە دەوڵەت بۆ جێبەجێکردنی سزای زیندانی کردن، یان سزادان بە پارە، یان ڕێوشوێنی ڕێگەگرتن کە لە وڵاتێکی تردا، بەشێوەی بڕیاری کۆتایی دەردەچێت[٤٠٩].

**٤-ڕێنمایی هاندان و خەڵاتکردن، لە یاساکانی بنبڕکردنی تیرۆردا:**

هەندێ لە ڕێساکانی تایبەت بە بنبڕکردنی تیرۆر چاوپۆشییان، لە گرنگیی بنەماکانی خەڵات نەکردووە، لە بواری بنبڕکردنی تیرۆرو کۆنترۆڵکردنی ئەنجامدەرانی و ئەو ڕێکخراوو تاقمانەی کە لە پشتییەوە دەوەستن و پلانی بۆ دادەنێن و پارەی بۆ تەرخان دەکەن و یارمەتی ئەنجامدانی دەدەن و ئەم ڕێسایانە بە ئەنقەست هانی تیرۆریستان دەدەن، تا دەست لە کاری چەکدارانە هەڵبگرن و هاوکاریی لەگەڵ دەسەڵاتدا بکەن لەڕێگەی بنەما گەلێکی یاساییەوە، کە یان سزاکانیان سووك دەکات، یان لێیان خۆش دەبێت.

لەو وڵاتانە فەرەنساو ئیسپانیاو بەریتانیاو ئەڵمانیا کە چەند دەقێك لە ڕێساکانیاندا هەیە، هانی ئەنجامدەرانی تاوانی تیرۆر دەدەن کە هاوکاریی بکەن لەگەڵ داد دا.

مادەی ٤٦٣ لە یاسای فەرەنسا، بۆ بنبڕکردنی تیرۆر کە لە ساڵی ١٩٨٦دا دەرچوو، دوو ڕووی تێدایە، بۆ چاوپۆشی لە سزادان، لەبڕگەی یەکەمدا هاتووە کە هەر کەسێك وەکو ئەنجامدەر یان هاوکار، لە ئەنجامدانی یەکێك لەو تاوانانەی لە بڕگەی ١١ی مادەی ٤٤ی یاسای سزاکان(واتە ئەو تاوانانەی لە مادەی ١٦/٧٠٦ی یاسای ڕێوشوێنە تاوانکارییەکاندا ئاماژەیان پێکراوە) دا، کە

---

[٤٠٩] بڕوانە: (الاتفاقیة الاوروبیة حول القیمة الدولیة للاحکام القمعیة لعام ١٩٧٠).

پەیوەندیی هەبێت بە پڕۆژەیەکی تاکە کەسی یان تاقمێکەوە، بەمەبەستی شێواندنی گەورەی ئاسایشی گشتی، لە ڕێگەی ترساندن و تۆقاندنەوە، ئەوا سزا دەبەخشرێت لە، ئەگەر هاتوو دەسەڵاتە ئیداری یان دادوەرییەکانی ئاگادار کردەوەو، ئەو ئاگادارکردنەوە بووە هۆی ڕێگەگرتن، لە جێبەجێ کردنی تاوانەکەو دەست نیشانکردنی تاوانبارانی تر[٤١٠]

بەڵام برگەی دووەم لە مادەی ٤٦٣ باس لە ڕوویەکی تری چاوپۆشی لە سزادان دەکات، بەوەی کە هەر کەسێك تاوانی ئەنجامدا، وەکو بکەر یان هاوکاریی لەگەڵ یەکێك لەو تاوانانەی لە برگەی ١١ی مادەی ٤٤ی یاسای سزاداندا هاتووەو، تاوانەکە پەیوەندیی هەبێت بە پڕۆژەیەکی تاکەکەسی یان تاقمێکەوە، بە مەبەستی شێواندنی گەورەی ئاسایشی گشتی، لە ڕێگەی ترساندن یان تۆقاندنەوە، ئەوا لە سزا دەبەخشرێت، ئەگەر هاتوو ئاگاداری دەسەڵاتە ئیداری، یان دادوەرییەکانی کردەوەو، ئەوەش بووە هۆی ڕێگە گرتن لە مردنی کەسێك، یان ڕوودانی کەمئەندامی بەهۆی تاوانەکەوەو، دەست نیشانکردنی تاوانبارانی تر[٤١١].

ئەگەر مەرجەکانی بەخشین نەبوو لەو سزایەی کە لە دووحاڵەتەکەی پێشوودا هاتووە، ئەوا تاوانباری هاوکاریکەر-لەو تاوانانەی پێشتر ئاماژەیان پێکرا- سوود لە سوککردنی سزا وەردەگیرێت، ئەگەر هاتوو بەر لەوەی بەدوایدا بگەڕێن، زانیاریی خستنەڕوو کە زەمینە بۆ ئاسانکاری خۆش بکات، بۆ دەست نیشانکردنی تاوانی تر[٤١٢]. ئەگەر هاتوو زانیاری دوای دەست پێکردنی لێکۆڵینەوەی پێشکەشکرد، کە زەمینە بۆ دەستگیر کردنیان خۆش بکات. وسووککردنیسزا لە کەمکردنەوەی سزا کە بۆ نیوەی کەمترین ئاستی دیاریکراو

---

[٤١٠] د. محمد ابو الفتح الغنام(مواجهه الارهاب في التشريع المصرى)، ١٩٩٦، ل٢٦٥.

[٤١١] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٦

[٤١٢] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٦

دادەبەزێنرێت، بەڵام ئەگەر سزاکە زیندانی کردنی هەمیشەیی بوو، ئەوا مادەکەی بۆ ٢٠ساڵ کەم دەکرێتەوە (م٢/٣٦٤)[٤١٣].

بنەماکانی هاندان و خەڵاتکردن، لە یاسایی فەڕەنسی بۆ تیرۆردا، کە هەندێ بە "سستمی تۆبەکردنی پۆزەتیڤ" ناوی دەبەن، لە راستیدا کارێ لە کارەکان تۆبەکردن، یان جیابوونەوە لە تیرۆر نییە، هەروەکو ئەوەی هەندێ لەزانایان پێیان وایە، بەڵام تەنیا یەکێکە لەکارەکانی هاوکایی پۆزەتیڤ لەگەڵ دەسەڵاتەکاندا[٤١٤].

---

[٤١٣] سەرچاوەی پێشوو،ل٢٢٦-٢٦٧

[٤١٤] سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٧

## لێکۆڵینەوەی دووەم

## هاوکاریی عەرەبی، لەبواری بنبڕکردنی تیرۆردا.

هاوکاریی عەرەبی لە بواری بنبڕکردنی تیرۆردا، لە چوارچێوەی هەستکردنی گەلێ لە ولاتانی عەرەبییەوە هات، بۆ گرنگیی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم دیاردەیە، بە شێوەی بە کۆمەڵو، ڕووبەڕوو بوونەوەی تاکەکی کاریگەریی چالاکی نابێتو، نیشانەکانی ئەم هاوکارییە لە ساڵی ١٩٩٣دا دەرکەوت، دواتر ئەم ئاراستەکردنە پشتگیری کرا لە ساڵی ١٩٩٤و قوڵتربووەو ڕەهەندی نوێی چالاکتری بەخۆوە گرت، لە ساڵانی ١٩٩٥و ١٩٩٦دا.

هاوکاریی عەرەبی، لە بواری بنبڕکردنی تیرۆردا، زیاتر لە ئاستێك دەگرێتەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

-ئاستی وەزیرانی ناوخۆ.

-ئاستی وەزیرانی ڕۆشنبیری

-ئاستی وەزیرانی داد.

**یەکەم- هاوکاریی لە ڕێگەی ئەنجومەنی وەزیرانی ناخۆی عەرەبەوە:**

ئەنجومەنی وەزیرانی ناوخۆی عەرەب، بە یەکێك لە سەنتەرە بنەڕەتییەکان ئەژمار دەکرێت، بۆ کردەی هاوکاریی عەرەبی- عەرەبی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆر. و بیرۆکەی ئەنجومەن لە کۆنگرەی یەکەمی وەزیرانی ناوخۆی عەرەب گەڵاڵە بوو کە لە قاهیرە لە ساڵی ١٩٧٧دا بەستراو، کۆنگرەی سێهەم کە لە ڕیاز ساڵی ١٩٨٢دا بەسترا، بڕیاریدا لەسەر پەیڕەو پڕۆگرامی ئەنجومەن، دوای ئەوەی خرایە بەردەم ئەنجومەنی کۆمەڵەی عەرەب کە لە ئەیلولی هەمان ساڵدا، بڕیاری لەسەردرا. و ئەنجومەنەکە یەکەمین دانیشتنی خۆی لە دارولبەیزا، لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٢دا بەست.

ئەنجومەن پێکهاتووە لە[٤١٥]:

١-ئەمانەی گشتیی ئەنجومەن، بارەگای هەمیشەیی لە تونسە، و چوار نووسینگەی هەیە:

أ-نووسینگەی عەرەبی، بۆ بنبڕکردنی تاوان، بارەگاکەی لە بەغدایە.

ب-نووسینگەی عەرەبی، بۆ پۆلیسی تاوانکاریو بارەگاکەی لە دیمەشقە.

ج-نووسینگەی عەرەبی، بۆ کاروباری مادە بێهۆشکەرەکانو بارەگاکەی لە عەممانە.

د-نووسینگەی عەرەبی، بۆ پاراستنی مەدەنیو بە هاناوە چوونو بارەگاکەی لە دارولبەیزایە.

٢-سەنتەری عەرەبی بۆ توێژینەوەی مەدەنیو بارەگاکەی لە ریازە.

٣-یەکێتی عەرەبی، بۆ وەرزشی پۆلیسو بارەگاکەی لە قاهیرەیە.

٤-چەند بەشێك، بۆ پەیوەندیی بەهەر دەوڵەتێکەوە، بۆ هاوکاریی لەگەڵ ئەمانەتی گشتیدا

ئەنجومەن ستراتیژییەکی ئەمنیو عەرەبی یەکگرتوو لە ساڵی ١٩٨٣دا دابنێت، بۆ پارێزگاری لەبەرە ناوخۆکانی عەرەبی، لە هەموو مەترسییەك کە هەڕەشەی لێبکاتو، ستراتیژییەکە، بەپێی سێ پلانی پێنج ساڵە جێبەجێ دەکرێت.

لەگەڵ هەڵکشانی شەپۆلی تیرۆر، لەچەند وڵاتێکی عەرەبی، لەسەرەتای نەتەوەکاندا، ئەنجومەن زۆربەی بایەخی خۆی ئاراستەی چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە کردو، کۆبوونەوەی نۆیەمی ئەنجومەن کە لە تونس لە کانونی دووەمی ١٩٩٢دا بەسترا، سەرەتایەك بوو بۆ هەوڵی هاوکاریی عەرەبی- عەرەبی لە بواری بنبڕکردنی تیرۆردا. و دەست پێشخەرییەکە، لەلایەن میسرەوە بوو کە وەزیری ناوخۆی میسر، داوای دانانی ستراتیژییەکی پوختەی کرد، بۆ ئاسایشی عەرەبیو، جەختی لەسەر"ئامادەگی میسر کرد بۆ پێشکەشکردنی تواناکانی

---

(٤١٥) بڕوانە: عبدالصمد سكر، (التعاون الدولي الامني في مكافحة الجرائم المعاصرة)، ١٩٧٧، ل١٣٢و دواتر.

پەیمانگە زانستییەکانی و توانایی و شارەزایی و زانیاریی ئەمنی خۆی، وەکو مافێکی تەواوی هەر وڵاتێکی عەرەبی، بەبێ ئەوەی نیازی بە رێکەوتنێکی نووسراو، یان پێش مەرج هەبێت"و بانگەشەکەی میسر لەلایەن بەشێك لە وڵاتانی بەشدار، لەم کۆنگرەیەدا پێشوازیی کرا.

سەرەتای هاوکارییە راستەقینەکە، لە کۆبوونەوەی دەیەمی ئەنجونەدا دەستی پێکرد، لە کانونی دووەمی ١٩٩٣، کە میسر پێشنیاری کرد ستراتیژییەکی ئەمنی عەرەبی تایبەت دابنرێت، بۆ رووبەڕووبوونەوەی تیرۆرو، ئەو بانگەشەیەی میسر، لەلایەن تونس و جەزائیرەوە پەسەندکراو، لە کۆبوونەوەی یانزەیەمی ئەنجومەن، لە کانونی یەکەمی ١٩٩٤دا، هەوڵەکانی میسرو تونس و جەزائیر سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بۆ دانانی تیرۆر- بۆ یەکەمین جار- لە ناو خشتەی کارەکانی ئەنجومەنداو، ئەم گۆڕانکارییە کاتێ بوو کە هەندێ لە وڵاتان هەڵوێستی خۆیان گۆڕی، سەبارەت بەو تاقمە سیاسییانەوە کە لەژێر پەردەی ئاییندا بوون و، لە چوارچێوەی کۆبوونەوەکەدا، میسر ئەم پێشنیارەی کرد(٤١٦):

١-پێکهێنانی کارکردنی حکومی، بۆ دانانی رێوشوێنی بنەماکانی رەوشتی دەوڵەتانی ئەندام، لە ئەنجومەن بۆ بنبڕکردنی تیرۆر.

٢-ئیدانەکردنی هەموو کردەو رێگەو کارە تیرۆرییەکان، لە هەر سەرچاوەیەکەوە بێت و هەر هۆیەك و مەبەستێکی لە پشتەوە بێت.

٣-پتەوکردنی هاوکار، لە نێوان دەوڵەتە عەرەبییەکاندا، لە بواری ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری، لەسەر چالاکی و تاوانە بە کۆمەڵەکان و رێکخراوە تیرۆریستییەکان و سەرکردەو ئەندامانیان و شوێنی کۆبوونەوەو رێگەکانی تەمویلکردنیان و چەك و تەقەمەنی و ئەو مادانەی کە دەیان تەقێننەوە، ئەویش بە پێی یاساکان و رێوشوێنە ناوخۆییەکانی هەر لایەنێك.

---

(٤١٦) راپۆرتی ئەنجومەنی شورای میسر کە لە لیژنەی کاروباری عەرەبی و دەرەکی و ئاسایشی نەتەوەیی دەرچوو، لە خولی ئاسایشی ١٧دا، سەبارەت بە بابەتی(الابعاد الخارجية لظاهرة الارهاب)، بەشی دووەم لەراپۆرتی(مواجهه الارهاب)، ١٩٩٧، ل٩٢و لاپەڕەکانی دواتر.

٤-گەشەدان بەئاڵوگۆڕکردنی توانای زانستی و تەکنەلۆژی، لەبواری هاوکاریی ئەمنیدا، لەگەڵ تاقم و ڕێکخراوە تیرۆریستەکان و چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەیان و، لە بورای ئاسایش و پاراستنی ئامێرو کەرەستەکانی هاتووچۆی ئەمنیەکان، لەبەندەرەو فڕۆکەخانەو وێستگەکانی شەمەندەفەرو شوێنی کۆبوونەوەی گشتییەکاندا

٥-پشتگیری لە هاوکاری دوو قۆڵی، یان چەند لایەنە لە نێوان وڵاتانی دراوسێدا کە بەدەست گرفتەکانی تاوانی تیرۆرەوەو بەشێوەی لێکچوو یان هاوبەش دەناڵێنن.

٦-وڵاتانی ئەندام ڕێوشوێنی چالاک و یەکلاکەرەوە بگرنەبەر، بۆ ڕێگەگرتن لە کاری تیرۆرو بە هەموو شێوازەکانیەوە، لە ڕێگەی گرتنەبەری ئەم ڕێوشوێنانەی خوارەوە:

أ-پابەندبوون بە هەڵنەستان یان بڕەودان یان بەشداریی کردن، بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکانی کارە تیرۆرییەکان، بە هاندان یان یارمەتیدان، یان تەمویلکردنی ئەم کارانە.

ب-دانانی چەند سستەمێك بۆ بڕیاردان لەسەر ڕێوشوێنی بەرودوو، بۆ گواستنەوەی چەك و کەرەستەو مادەی تەقینەوەو هاوردەرکردن و ناردنە دەرەوەی و، ئەنبارکردنی بەجۆرێ کە بکرێ کردەکانی چاودێریکردنیان ڕێکبخرێت، لە ڕێگەی گومرگ و سنوورو بۆ ئەوەی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر نەگوێزرێنەوە، تەنیا بەمەبەستی ڕەوا نەبێت و بەشێوەیەکی نەگۆڕ، ئەویش بەپێی یاسای ناوخۆی هەر وڵاتێك و ڕێگە نەدان، بەوەی خاکەکەی ببێت بە گۆڕەپانی پیلاندانان و یان ڕێکخستن یان جێبەجێ کردنی کارە تیرۆرییەکان، یان دەستپێکردن یان بەشداریکردن تیایداو بە هەر شێوەیەك بەڕێگەنەدان بەدزەکردنی تیرۆریستانیشەوە بۆی، یان دالدەدانیان، یان ڕاهێنانیان و چەکدارکردنیان و تەمویلکردنیان، یان پێشکەشکردنی هەر ئاسانکارییەك کە لە ڕێگەوە بتوانن ئامانجەکانیان دەستەبەر بکەن.

ج-پتەکردنی هاوکاری، لە نێوان وڵاتانی ئەندامو پێشکەشکردنی هاوکاریی ئاڵوگۆڕکراو، لە بواری ڕێوشوێنی گەڕان بەدوای کەسانی هەڵهاتوو، یان داواکراوەکان، بۆ ئەوەی بڕگە یاساییەکانیان بەسەردا جێبەجێ بکرێت.

کردەکانی کۆبوونەوە لە کۆتاییدا، پێکهێنانی لیژنەیەکی حکومی لێکەوتەوە، بۆ داڕشتنی پێشنیارێکی میسری.

ئەو گۆڕانکارییە گەروەیە لەمەڕ هاوکاریی عەرەبی ڕوویدا، لە بواری بنبڕکردنی تیرۆر، لە کۆبوونەوەی(١٣)ی ئەنجومەن لە کانونی دووەمی ١٩٩٦دا، ئەوە بوو بە شێوەیەکی کۆتایی بڕیار لەسەر پرۆژە میسرییەکەدرا[٤١٧].

دووەم: هاوکاریی لەرێگەی ئەنجومەنی وەزیرانی رۆشنبیریی عەرەبەوە:

سەرەتای راستەقینەی هاوکاری عەرەبی، لەبواری بنبڕکردنی تیرۆر، لەرێگەی کەناڵەکانی راگەیاندنەوە لەساڵی ١٩٩٣وە بوو، لەکانونی یەکەمی ئەو ساڵەدا، لیژنەی هەمیشەیی راگەیاندنی عەرەبی، راپۆرتێکی گرنگی لەژێر ناوی: ((رۆڵی راگەیاندنی عەرەبی لەمەڕ دیاردەی توندڕەویو تیرۆردا)) تاوتوێکرد.

لەخولی (٥٣)ی لیژنەکە، لەکانوونی دووەمی ١٩٩٤دا، کارنامەی لیژنەکە بەندێکی تایبەتی لەخۆگرت، لەمەڕ چۆنیەتی هاوکاری عەرەبی لەبواری بنبڕکردنی تیرۆردا.

بەڵام لەسەر ئاستی ئەنجومەنی وەزیرانی عەرەبدا، ئەنجومەن بۆیەکەم جار لەخولی ٢٦ی خۆیدا، لەقاهیرە لەتەمووزی ١٩٩٣دا، کێشەی تیرۆری تاوتوێکردو بڕیاریدا، لەسەر دانانی میکانیزمێك، بۆ بەرەنگاربوونەوەی توندڕەویو پلانێك تاوتوێ کرا، بۆ بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر، بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی وشیاریی رای گشتیی، لەناونیشتمانی عەرەبو لەدەرەوەیدا، لەمەترسی کێشەی تیرۆر کەدەخوازێت کۆمەڵگە عەرەبییەکان لەجیهان دابڕێت، لەرێگەی هەڵمەتێکی راگەیاندنی فراوانەوەو، بەرچاو روونکردنی رای گشتی عەرەبی، لەرێگەی بابەتی راگەیاند، لەرێگەی خوێندنو بیستنەوە، بەبەرپرسێتی خێزانی بەرەو پاراستنی

---

[٤١٧] لەستراتیژی عەرەبی بۆ بنبڕکردنی تیرۆر، بڕوانە (مجلس وزارء الداخلیە العرب، الرؤی-الطموحات)، تونس، ١٩٩٧، لاپەرە ١٤، و هەروەها بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە ١٤٨-١٤٩

نەوە نوێکان، لەوەی نەکەونە زەلکاوی تیرۆرەوەو، دابینکردنی پێویستییەکانی لاوان لەهەموو بوارەکانداو، بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیارییان و دانانی پلانێك بۆ روونکردنەوەی بواری ئایینی، بۆ ئەوەی ئایین بەرووە راستەو دروستەکەی خۆی بخرێتەروو، دوور لەدەمارگیری و چڕکردنەوەی بەرنامەکانی راگەیاندن کەمەترسیی تیرۆر بەرجەستە دەکات، لەسەر پێکهاتە سەرەکییەکانی ئابووریی عەرەبی،و پابەندبوونی کەناڵەکانی راگەیاندن، بەبابەتمەندی تا نەبێتە نێچری پروپاگەندەو قسەو قسەلۆك و جیاوازیی لە نێوان تیرۆرو خەباتی رەوای گەلانداو، دانانی دیاردەی تیرۆر لەناو چالاکییەکانی نووسینگەکانی کۆمەڵەی عەرەبی لەدەرەوەدا، لەرێگەی لێکست و چاوپێکەوتنە رۆژنامەییەکاندا(٤١٨).

ئەنجومەن لەخولی ٢٧ی ساڵی ١٩٩٤ی خۆیدا، رایسپارد کە پەلەبکرێت لە دانانی میکانیزمی هاوکاریی عەرەبی، لەپێناوی بنبڕکردنی دیاردەی توند رەویدا.

لەخولی ٢٨ی ئەنجومەن لەساڵی ١٩٩٥دا، کێشەی تیرۆر لەسەرووی بەرنامەی کارەکاندا بوو. ئەنجومەن لەم خولەوە رەزامەندیی نیشان دا لەسەر پرۆژەی بڕیارێك کە جەزائیر لەژێر ناوی (بنەماکانی رەفتاری وڵاتانی ئەندام لە ئەنجومەنی وەزیرانی راگەیاندنی عەرەب، بۆ بنبڕکردنی تیرۆرو توندڕەوی) پێشکەشیکرد. پرۆژەکە هانی دەدا، بۆ جەخت کردن لەسەر پابەندبوونی وڵاتانی ئەندام، بۆ بەهێزکردنی چالاکییان، لەبواری راگەیاندندا، بۆ رووبەروو بوونەوەی شاڵاوە دوژمنکارییەکانی دژی جیهانی ئیسلام و، ریسواکردنی کارەکانی گروپە تیرۆریستەکان، پرۆژەکە هانی رۆژنامەو گۆڤارە عەرەبییەکانی دەدا، ئەو هەواڵانە بڵاوبکەنەوە کە خزمەت بەیەکێتی نەتەوەیی عەرەب و ئیسلام و شکۆمەندییان دەکات، دوور لە دیاردەی تیرۆرو توندڕەوی و، پابەندبوونی وڵاتانی ئەندام، بە بڵاونەکردنەوەی ئەو هەواڵانەی هانی تیرۆر دەدەن.

لە ٤ی ئەیلولی ١٩٩٥دا، یەکەمین کۆنگرەی راگەیاندنی ئاسایشی عەرەبی لەتونس بەستراو، ئەم کۆنگرەیە هەنگاوێکی گەورەبوو، لەپێناوی پشتگیریی

(٤١٨) راپۆرتی ئەنجومەنی شورای میسری، کەپێشتر ئاماژەی پێکرا، ل٩٥

کردنی هاوکاریی عەرەبی، لەبواری بنبڕکردنی تیرۆردا، کە کۆنگرە ستراتیژییەکی ڕاگەیاندنی عەرەبی داڕشت، بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاریی ئەمنی.

سێهەم- هاوکاریی لەڕێگەی ئەنجومەنی وەزیرانی دادەوە:

سەرەتای بایەخدانی ئەنجومەن، بەرووبەروو بوونەوەی کێشەی تیرۆر لە ساڵی ١٩٩٣دا بوو، کاتێ ئەنجومەن لە کۆبوونەوەی نۆیەمی لە ٩ی نیسانی ئەو ساڵەدا، داوای داڕشتنی ڕێکەوتننامەیەکی عەرەبی هاوبەشی کرد، بۆ ڕێگەگرتن لە توندڕەوی، هەروەها وەزیران پێکهێنانی لیژنەیەکی هونەرییان تاوتوێکرد، بۆ ئامادەکردنی پرۆژەی ڕێکەوتننامەکە.

لە کۆبوونەوەی دەیەمی ئەنجومەن لە نیسانی ١٩٩٤دا، پرۆژەی ڕێکەوتنامە پێشنیارکراوەکەی خستە بەردەم وەزیران، بەڵام ڕێکەوتن لەسەر دواخستنی تاوتوێکردنی، بۆ کۆبوونەوەی ١١، لە تشرینی دووەمی ١٩٩٥، کە بڕیارێکی دەرکرد، بۆ گشتاندنی پرۆژەی ڕێکەوتنامەکە، بەسەر وڵاتانی ئەندامدا بۆ تاوتوێکردن و دەربڕینی راو پێشنیارەکانی لەسەری، دوا مۆڵەت مایسی ١٩٩٦بوو، بۆ خستنەرووی تێبینی لەسەری، بۆ خستنەرووی لەبەردەم ئەنجوومەن لە خولی ١٢ لە تشرینی دووەمی ١٩٩٦دا.

لەڕاستیدا، ئەو هەوڵانەی دران، بۆ بەدیهێنانی هاوکاریی عەرەبی هاوبەش، لەبواری بنبڕکردنی تیرۆردا، تەنیا لەوسێ خولگەیەی پێشوودا نەبوو، بەڵکو بووە مایەی تاوتوێکردنی، لە هەندێ کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی وەزیرانی دەرەوەی عەرەبدا میسر پێشنیاری کرد بڕگەی بنبڕکردنی تیرۆر بخرێتە سەر پەیماننامەی شەرەفی عەرەبی کە پێشنیاری کردبوو، بۆ پشتگیریی لە هاوکاریی عەرەبی، لە جەژنی پەنجایەمینی کۆمەڵەی وڵاتانی عەرەب لە مارتی ١٩٩٥دا.

کۆنگرەی نۆیەمی نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆ نەهێشتنی تاوان کە لە قاهیرە لە نیسانی ١٩٩٥دا بەسترا، لە کۆبوونەوە نێودەوڵەتییە گرنگەکان دادەنرێت کە جموجۆڵێکی میسری و عەرەبی لەخۆگرت، بۆ بەرەنگاربوونەوەی کێشەی تیرۆر. میسر لەو کۆنگرەیەدا، سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بۆ بایەخ پێدان بەکێشەی تیرۆرو هەروەها هەوڵەکانی بۆ ئەوەی تیرۆر بکرێت، بەیەکێك لە جۆرەکانی تاوانی

ڕێکخراو خستەگەڕ. لەم کۆنگرەیەدا، ڕەزامەندیی نیشاندرا، لەسەر ئەو پێشنیارەی لەم بارەوە پێشکەشی کرد. پێشنیارەکەش ئەم بڕگانەی لەخۆگرتبوو[٤١٩]:

١. ئیدانەکردنی توندی تاوانە ڕێکخراوەکانو تاوانە تیرۆرییەکان، بە هەموو شێوازەکانو پراکتیزەکردنیان، لەهەر شوێنێکدا ئەنجام بدرێتو سەرچاوەکەی لەهەر شوێنێکەوە بێت، چونکە مەبەستەکەی لەناوبردنی ئازادییە بنەڕەتییەکانو مرۆڤو دیموکراسییەو هەڕەشە لە ئاسایشی ئیقلیمیی وڵاتانو ئاسایشیان دەکاتو، سەقامگیربوونی ئەو حکومەتانە دەشێوێنێت کە بەشێوەی یاسایی دامەزراونو بنەماکانی کۆمەڵگەی مەدەنی فرەلایەنی تێکدەدات، جگە لەئاکامە زیانبارەکانی، لەسەر فراژوبوونی ئابووریو کۆمەڵایەتیی وڵاتان.

٢. بانگەشەکردنی وڵاتان بۆ گرتنەبەری ڕێوشوێنی نیشتمانی چالاک، هەر کاتێ پێویستی کردو بەوشێوەیەی لەگەڵ پرەنسیپەکانی یاسای نێودەوڵەتیدا بگونجێت، لەبوارەکانی یاسادانانو لێکۆڵینەوەو جێبەجێکردنی یاساکاندا، لەپێناوی دابینکردنی بنبڕکردنی تاوانەکانی تیرۆرو تاوانە ڕێکخراوەکان.

٣. هاندانی وڵاتان بۆ بەهێزکردنی هاوکاریی نێودەوڵەتی، لەگەڵ ڕەچاوکردنی هەموو سستمە یاساییەکانو مافی مرۆڤو پێوەرەکانی یاسای نێودەوڵەتی، لەپێناوی بنبڕکردنی تاوانە تیرۆرییەکانو تاوانە ڕێکخراوەکانو پەیوەندییەکانیان.

٤. بانگەشەکردنی وڵاتان بۆ هاوکاریو گۆڕینەوەی زانیاری تەکنۆلۆژیو توانایی و شارەزایی، لەبواری بنبڕکردنی بەکارهێنانی داهاتی تاوانو بەتایبەتی تاوانی ڕێکخراو لەتەمویلکردنی تیرۆر، هاوکاری لەهەردوو بواری یاساییو دادوەریدا، بەتایبەتی سەبارەت بە بەدەستەوەدانی تاوانباران، لەڕێگەی بەستنیڕێکەوتنامەی دووقۆڵی یان ئیقلیمی، یان نێودەوڵەتی، یان هەر ڕێکەوتننامەیەك لەنێوان وڵاتەپەیوەندیدارەکاندا.

---

[٤١٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩-١٠٠.

٥. بانگەشــەکردنی‌لیژنەی گشــتیی کۆنگــرە، تــا داوا لــە دەزگــای نەتــەوە یەکگرتووەکان بکات، بۆ کۆکردنەوەی زانیاری، لەسەر پەیوەندیی نێوان تاوانی رێکخراو تاوانە تیرۆرییەکانداو، هاوکاریی لەنێوان چالاکییەکانیان‌و ئاسانکاریی، بۆ گەیشتنی ئەو زانیارییانە بەدەستی وڵاتان.

٦. بانگەشەی لیژنەکە تا داوا لە پەیمانگەو مەڵبەندەکانی رێگەگرتن لە تاوان‌و عەدالەتی تاوانکاریی بکات، بایەخی تەواو بدەن بە توێژینەوەی پەیوەندییەکانی نێوان تاوانی رێکخراو، تاوانی تیرۆرو ئاسەوارەکانیان‌و رێگەو شوێنی گونجاو بۆ بەرەنگاربوونەوەیان.

٧. بانگەشــەی لیژنەکــە بــۆ دروســتکردنی تیمێکــی کــارکردنی نێودەوڵــەتیی حکومــی کــە بــە ئــەندام بــوون تیــایدا کراوەبێــت، بــۆ چوونــەوە بــەو رێوشــوێنە پێویستانەدا، بۆ بنبڕکردنی تاوانە رێکخراوەکان، لەگەڵ بایەخدان بەهەڵکێشانی مەترسیی پــەیوەندییان لەگــەڵ تاوانــە تیرۆرییــەکاندا، بــۆ دارشــتنی دەقێك یــان چەکێکی یاسایی، بەمەرجێ ئەو گروپە راپۆرت بۆ لیژنەکە، لەسەر کارەکانیــان بەرزبکاتەوە.

کۆنگرەکە رازیی‌بوو لەسەر پێشنیارێکی تری میسر، کە داوای دروستکردنی مەڵبەندێکی ئیقلیمی کرد، بۆ راهێنــان لەســەر توێژینــەوەکانی بنبڕکردنی تاوان‌و عەدالەتی تاوانکاری لەوڵاتانی دەریای ناوەڕاستدا.

لەم بارەوە، میسر پرۆژەی بڕیارێکی پێشکەش بە کۆمەڵگەی گشتی نەتەوە یــەکگرتووەکان کــرد، لــەخولی ئاســایی خــۆی لــە تشــرینی یەکــەمی ١٩٩٥دا کــە بریتیی بوو لە [٤٢٠]:

١. تاوتوێکردنی بڕگەی تیرۆر، هەر ساڵی جارێك لەجیاتی دوو ساڵ جارێك.

٢. ســکرتێری گشــتی نەتــەوە یــەکگرتووەکان راپۆرتێکــی ســاڵانە، ســەبارەت بەرووداوەکانی تیرۆر پێشکەش دەکات کــە لەســاڵی رابــردوودا روویــان داوە بــۆ تاوتوێکردنیان‌و دەرخستنی چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەیان.

---

[٤٢٠] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣. کارکردن بۆ جێبەجێکردنی چارنامەی سەرۆکایەتی کە لەئەنجومەنی ئاسایش لەساڵی ١٩٩٢دا دەرچوو، کە تایبەت بوو بە بنبڕکردنی دیاردەی تیرۆر.
٤. پتەوکردنی هاوکاریی، لە نێوان دەوڵەتان لەبواری بنبڕکردنی تیرۆردا.
٥. زیادکردنی هاوکاریی لە نێوان رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئاژانسە تایبەتەکان، لەبواری بنبڕکردنی تیرۆردا.

# پاشکۆکان

## ڕێکەوتنامەی ئەو تاوان و کردارانەی لەناو فڕۆکەدا ئەنجام دەدرێن کە لە تۆکیۆ لە ١٩٦٣/٩/١٤دا مۆرکرا

## وڵاتانی بەشدار لەو پەیماننامەیەدا ڕێکەوتن لەسەر:

## بابی یەکەم

## بواری جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەکە

**مادەی یەکەم:**

١. ئەم ڕێکەوتننامەیە جێبەجێدەکرێت، لەسەر:

(أ) ئەو تاوانانەی بڕگەکانی یاسای سزادان دەیانگرێتەوە.

(ب) هەموو ئەو کردارانەی بە تاوان ئەژمار دەکرێن، یان ئەوانەی بە تاوان ئەژمار ناکرێن، بەڵام ئاسایشی فڕۆکە، یان ئەو کەس و سامانانەی لەناویدان دەخەنە مەترسییەوە، یان دەبنە هۆی شێواندنی باری هێمنی ناو فڕۆکە.

٢. جگە لەوەی لە بڕگەکانی بابی سێهەمدا هاتووە، ئەم ڕێکەوتننامەیە هەموو ئەو تاوانانە دەگرێتەوە کە ئەنجام دەدرێن یان ئەو کردەوانەی هەرکەسێك پێی هەڵدەستێت، لەناو هەر فڕۆکەیەکدا کە تۆمار کرابێت، لەگەڵ ئەو دەوڵەتەی گرێبەستی لەگەڵدا کرابێت، لەکاتی فڕینی فڕۆکەدا، یان لەسەر دەریا، یان هەر شوێنێکی‌تر کە دەکەوێتە دەرەوەی قەڵەمڕەوی هەر وڵاتێك.

٣. سەبارەت بە ئامانجەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیە، فڕۆکە هەر لەکاتی ڕۆشن کردنی پەروانەکانیەوە، بە مەبەستی فڕین وا دادەنرێت کە لەحاڵەتی فڕیندایە، تا ئەو کاتەی بەتەواوی دەنیشێتەوە.

٤. بڕگەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیە، ئەو فڕۆکانە ناگرێتەوە کە بۆ مەبەستی سەربازیو گومرگیو خزمەتگوزاریی پۆلیسی بەکار دەبرێن.

**ماددەی دووەم:**

لەگەڵ ڕەچاوکردنی نەشێواندنی بڕگەکانی ماددەی چوارەمداو، جگە لەو حاڵەتانەی کە دەبێ پارێزگاریی لە ئاسایشی فڕۆکە، یان گیانی سەرنشینانو سامانەکانیان بکرێت، نابێ هیچ بڕگەیەك لە بڕگەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیە، بەجۆرێ ڕاڤە بکرێت کە ڕێگە بدات ڕەفتارو ڕێوشوێن، سەبارەتا بەو تاوانانە بگرێتەبەر کە یاسای سزاکان سزایان لەسەر دەدات کە مۆرکێکی سیاسییان هەبێت، یان پشت ببەستێت بە جیاوازیی ڕەگەزی یان ئایینی.

## بابی دووەم

## پسپۆری

**ماددەی سێهەم:**

١. ئەو وڵاتەی فڕۆکەکەی بەناوەوە تۆمار کراوە، دەست بەکاری پسپۆری دەبێت لەبواری دادگادا، سەبارەت بەو تاوانو کردەوانەی لەناو ئەو فڕۆکەیەدا ئەنجام دەدرێن.

٢. پێویستە لەسەر هەر وڵاتێك کە گرێبەستی ئەنجامداوە- بەوەی کە فڕۆکەکە بەناویەوە تۆمارکراوە-هەموو ئەو ڕێوشوێنانە بگرێتەبەر کە پێویستن، بۆ دامەزراندنی پسپۆریی سەبارەت بەوتاوانانەی لەناو ئەو فڕۆکانەی بەناویەوە تۆمار کراو، ئەنجام دەدرێن.

٣. ئەم ڕێکەوتننامەیە، هیچ یەکێك لەو پسپۆرییانەی تایبەتن بە تاوان، دوورناخاتەوە کە بەپێی بڕگەکانی یاسای نیشتمانی کاریان پێدەکرێت.

**ماددەی چوارەم:**

بۆ هیچ وڵاتێك نییە کە گرێبەستی ئەنجام داوە، جگە لەو وڵاتانەی بەناویانەوە تۆمارکراوەن توخنی هەر فڕۆکەیەك بکەوێتەوە لەکاتی فڕیندا، بەمەبەستی دەست

بەكاربوونی پسپۆریی لەمەڕ تاوان، سەبارەت بەتاوانێك كە لەسەر فڕۆكەكە ئەنجام درابێت، تەنیا لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا نەبێت:

أ. كە تاوانەكە شوێنەوارێكی لە قەڵەمڕەوی ئەم وڵاتەدا هەبێت.

ب. كە تاوانەكە هاووڵاتییەكی ئەم وڵاتە ئەنجامی دابێت، یان دژی ئەنجام درابێت، یان كەسێك كە نیشتەجێی هەمیشەیی ئەم وڵاتە بێت.

جـ. ئەگەر تاوانەكە دژی ئاسایشی وڵات ئەنجام درابێت.

د. ئەگەر تاوانەكە رێساو رێورەسمی ئەو وڵاتە پێشێل بكات كە پەیوەندیدارە، بەفڕین یان جموجۆڵی فڕۆكەكانەوە.

٥. ئەگەر دەست بەكاربوون لەو پسپۆرییەدا، پێویست بوو دابین كردنی رەچاوكردن و پابەندبوونی ئەو وڵاتە بۆ بەڵێنەكانی، بەپێی رێكەوتنامەیەكی نێودەوڵەتیی هەمەلایەنە.

## بابی سێهەم

## دەسەڵاتەكانی كابتنی فڕۆكە

**ماددەی پێنجەم:**

١. بڕگەكانی ئەم بابە، ئەو تاوان و كردەوانە ناگرێتەوە كە كەسێك لەناو فڕۆكەكەدا لەكاتی فڕین لە قەڵەمڕەوەیی ئاسمانیی ئەو وڵاتەی تیایدا تۆمار كراوە، یان لەسەر ئاسمانی دەریا ئازادەكان، یان لەسەر هەر ناوچەیەك لەدەرەوەی قەڵەمڕەوی هەر وڵاتێكدا ئەنجامی دەدات، مەگەر لەو حاڵەتەدا نەبێت كە دوا خاڵی فڕین بێت، یان دوا خاڵی دابەزین لە شوێنی مەبەستدا بكەوێتە وڵاتێكی تر، جگە لەو وڵاتەی تیایدا تۆمار كراوە، یان ئەگەر فڕۆكەكە، دواتر لەبواری ئاسمانیی وڵاتێكی تردا فڕی، جگە لەو وڵاتەی تیایدا تۆمار كراوە، لەگەڵ بەردەوامیی مانەوەی وەها كەسێك لەناو فڕۆكەكەدا.

٢. سەرەڕای بەشەكانی بڕگەی سێهەم لە ماددەی یەكەم- فڕۆكە لەهەر كاتێكدا وا دادەنرێت كە لەحاڵەتی فڕیندایە- سەبارەت بە مەبەستەكانی ئەم بابە هەر

لەوکاتەوە کە دەرگا دەرەکییەکانی دادەخرێت، دوا بەدوای سەرکەوتنی سەرنشینان و بارەکانیان، تا ئەوساتەی کە دەرگاکان دەکرێنەوە، بەمەبەستی خاڵی کردنی فڕۆکەکەو لەحاڵەتی دابەزینی نائاسایدا، بڕگەکانی ئەم بابە جێبەجێ دەکرێن، سەبارەت بەو تاوان و کردەوانەی لەناویدا ئەنجام دەدرێن، تا ئەوکاتەی دەسەڵاتە پەیوەندیدارەکانی دەوڵەت دەست بەکارەکانیان دەکەن بە فڕۆکەکەو سەرنشینەکان و ئەو سامانانەی لەناو فڕۆکەکەدان.

**ماددەی شەشەم:**

١. ئەگەر کابتنی فڕۆکە بەپشت بەستن بەچەند هۆیەکی بەجێ، بڕوای بەوەهێنا کە کەسێك دەستی دایە ئەنجامدانی یەکێك لەو تاوانانەی لەبڕگەی یەکەمی ماددەی یەکەمدا هاتووە، لەناو فڕۆکەکەدا، ئەوا بۆی هەیە ڕێوشوێنی گونجاو تەنانەت ڕێوشوێنی توندیش لەبەرامبەریا بگرێتەبەر ئەگەر پێویستیکرد، لەپێناوی:

أ. پاراستنی ئاسایشی فڕۆکەکە، یان گیانی سەرنشینان یان ئەو سامانانەی لە فڕۆکەکەدایە.

ب. پارێزگاریی لە دیسپلینی ناو فڕۆکە.

ج. بتوانێت وەها کەسێك بدات بەدەستی دەسەڵاتە پەیوەندیدارەکانەوە، یان داگرتنی لە فڕۆکەکە، بەپێی بڕگەکانی ئەم بابە.

٢. بۆ کابتنی فڕۆکەکە هەیە، داوا لە ئەندامانی لیژنەکەی بکات، تا یارمەتی بدەن لەگرتنی هەرکەسێك کە مافی ئەوەی هەیە بیگرێت، هەروەها بۆی هەیە داوای ئەو یارمەتییە بکات، لەسەرنشینان بەوەی بۆ ئەندامانی لیژنەکە، یان بۆ هەر یەکێك لەسەرنشینان هەیە کاری پارێزگاریی بەجێ بکەن، ئەگەر بەڵگەی بەجێی بەدەستەوە هەبێت و بڕوا بەوە بهێنێت کە وەها ڕێوشوێنێك پێویست دەبێت، بۆ پارێزگاریی لە فڕۆکەکەو گیانی سەرنشینانی و ئەو کەلوپەلانەی لە فڕۆکەکەدان.

**ماددەی حەوتەم:**

١. نابێت بە بەردەوامی ڕێوشوێنی توند پیادە بکرێت کە بەسەر کەسێکدا دەسەپێنرێت، بەپێی بڕگەکانی ماددەی شەشەم، لەدوای هەرخاڵێکەوە کە فڕۆکەکە تیایدا نیشتبێتەوە مەگەر:

أ. ئەو خاڵە کەوتبێتە قەڵەمڕەوی ولاتێکەوە کە پەیماننامەکەی مۆر نەکردبێت و دەسەلاتدارانی ڕێگە نەدەن ئەو کەسە دابگیرێت، یان ئەگەر ڕێوشوێنەکە بەپێی بڕگەی یەکەمی (ج) لە ماددەی شەشەم بێت، بەمەبەستی بەدەستەوەدانی کەسی دیاریکراو، بۆ دەسەلاتە پەیوەندیدارەکان.

ب . لەکاتێکدا بەناچاری فڕۆکەکە نیشتەوەو فڕۆکەوانەکە نەیتوانی ئەو کەسە بداتە دەست دەسەلاتە پەیوەندیدارەکانەوە.

جـ لەکاتێکدا ئەو کەسە ڕازی بوو، لەسەر بەردەوامبوونی فڕینەکە لەکاتێکدا دەستی بەسەردا گیرابێت.

٢. پێویستە لەسەر فڕۆکەوانەکە، بەزووترین کات ئاگاداری دەسەلاتدارانی ئەو،ولاتە بکاتەوە کە فڕۆکەکە لەقەڵەمڕەویدا دەنیشێتەوەو کەسی دەست بەسەرگیراوی تێدابێت، بەپێی بڕگەکانی ماددەی شەشەم، سەبارەت بەبوونی ئەو کەسە لەناو فڕۆکەکەداو هۆکارەکانی دەستگیرکردنی، بەمەرجێ ئەو ئاگادارکردنەوەیە بەپێی توانا، لەبەر نیشتنەوەی فڕۆکەکە بێت.

**ماددەی هەشتەم:**

١. لەکاتی پێویستدا، فڕۆکەوانەکە بۆی هەیە ڕێوشوێنی پێویست بگرێتەبەر، بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی.

أ. لەبەندی یەکەم لە ماددەی شەشەمدا، دابەزاندنی هەرکەسێك لە قەڵەمڕەوی هەر ولاتێکدا کە فڕۆکەکەی تیادا دەنیشێتەوە، ئەگەر بەپێی چەند بنەمایەکی بەجێ دەرکەوت دەستی داوەتە یان دەداتە ئەنجامدانی ، یەکێك لەو تاوانانەی کە لەناو فڕۆکەکەدا لە ماددەی یەکەم، بڕگەی (ا-ب) ئاماژەی پێکراوە.

٢. پێویستە لەسەر فڕۆکەوانەکە ڕاپۆرت بەرزبکاتەوە، بۆ دەسەلاتدارانی ئەو ولاتەی کە کەسێك لەسەر خاکەکەی لەفڕۆکەکەدا دادەبەزێنرێت، بەپێی ئەم مادەیە، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی هۆکارەکانی ئەو دابەزاندنە.

**ماددەی نۆیەم:**

**١. ئەگەر فڕۆکەوانەکە پشت بەست بەچەند بنەمایەکی بەجێ، گەیشتە ئەو بڕوایەی کە کەسێك کارێکی لەناو فڕۆکەکەدا ئەنجام دا کە بەتاوانی ترسناکی دانا، بەپێی یاسای سزادان لەو دەوڵەتەی کە فڕۆکەکەی تێدا تۆمارکراوە ئەوا بۆی هەیە بیدات بەدەستی دەسەڵاتدارانی پەیوەندیداری هەر وڵاتێکەوە کە ڕێکەوتننامەکەی مۆرکردووەو فڕۆکەکە تیایدا دەنیشێتەوە.**

**٢. پێویستە لەسەر فڕۆکەوانەکە، لەنزیکترین کاتدا، ئاگاداری دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتە بکات کە ڕێکەوتنامەکەی مۆرکردووەو فڕۆکە تیایدا دەنیشێتەوەو کەسێکی تیادایەو دەیەوێت بیدات بەدەستەوە، بەپێی بڕگەی ناوبراو، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی هۆکارەکانی، بەمەرجێ ئەو ئاگادارکردنەوەیە، بەپێی توانا، بەر لەنیشتنەوەی فڕۆکەکە بێت.**

**٣. پێویستە لەسەر فڕۆکەوانەکە بەڵگەو زانیاریی تەواو بداتە دەست ئەو دەسەڵاتدارانەی تاوانبارەکەیان دەداتە دەست، بەپێی بڕگەکانی ئەم مادەیەو، بەپێی یاسای ئەو وڵاتەی فڕۆکەکەی تیادا تۆمارکراوە.**

**ماددەی دەیەم:**

**سەبارەت بەو ڕێوشوێنانەی ئەنجام دەدرێت، بەپێی ئەم ڕێکەوتننامەیە، نەفڕۆکەوانەکەو، نەهیچ کەسێك لەستافی فڕۆکەکەو نەهیچ سەرنشینێك یانی خاوەنی فڕۆکەکە، یان ئەو کەسەی گەشتەکە لەسەرحیسابیئەو دەکرێت، بەرپرس نین لەبەرامبەر هەر داوایەك کە بەهۆی ئەو مامەڵەیەوە پەیدا دەبێت کە کەسی تاونبار ڕووبەڕووی دەبێتەوە.**

# بابی چوارەم
# دەستبەسەراگرتنی نایاسایی فڕۆکە

**ماددەی یانزەیەم:**

١. ئەگەر کەسێك لەناو فڕۆکەکەداو لەکاتی فڕینداو لەڕێگەی هێزەوە، دەستی دایە کارێکی نارەوا، یان هەڕەشەی بەکارهێنانی هێزی کرد، بۆ کارێکی نارەوا کە بەدەستێوەردان دادەنرێت لە بەکارهێنانی فڕۆکە، یان دەست بەسەراگرتنی. یان هەر کۆنترۆڵکردنێکی هەڵەی فڕۆکەکە، یان هەوڵدان بۆی، ئەوا پێویستە لەسەر ئەو وڵاتانەی ڕێکەوتنامەکەیان مۆرکردووە، هەموو ڕێوشوێنی گونجاوو پێویست، بۆ دەست گرتنەوە لەلایەن فڕۆکەوانەکەوە بەسەر فڕۆکەکەدا یان بۆ پارێزگاریی لە کۆنترۆڵکردنیدا بگرنەبەر.

٢. لەو حاڵەتەی لەبڕگەی دووەمدا ئاماژەیان پێکرا، پێویستە لەسەر وڵاتانی ڕێکەوتنامەکە کە فڕۆکەکە تیایدا دەنیشێتەوە ڕێگە بەسەرنشینانی ئەو فڕۆکەیە بدرێت، بۆ درێژەدان بەگەشتەکەیان لە نزیکترین کاتداو پێویستە لەسەری فڕۆکەو کەلوپەلەکانی سەری بگێڕێتەوە، بۆ ئەو کەسانەی بەپێی یاسا خاوەنیانن.

**ماددەی دوانزەیەم:**

پێویستە لەسەر هەریەکێك لە دەوڵەتانی ڕێکەوتنامەکە، ڕێگە بە فڕۆکەوانی فڕۆکەیەك بدەن کە وڵاتێکی تری ڕێکەوتنامەکەدا تۆمار کرابێت، هەرکەسێ بیەوێت لە فڕۆکەکە دایگرێت، بەپێی ناوەڕۆکی بڕگەی یەکەمی ماددەی دووەم.

**ماددەی سیانزەیەم:**

١. پێویستە لەسەر هەر دەوڵەتێك کە ڕێکەوتنامەکەی مۆرکردووە، ئەو کەسە بەدەستەوە بدات کە فڕۆکەوانەکە بەدەستەوەی دەدا، بەپێی بڕگەی یەکەم لە ماددەی نۆیەم.

٢. پێویستە لەسەر هەر دەوڵەتێکی ڕێکەوتنامەکە، ئەگەر بینی کە بارودۆخەکە پێویست دەکات، هەر کەسێکی گومانلێکراو، لە ئەنجامدانی یەکێك لەو کارانەی، لە بڕگەی یەکەمی ماددەی یانزەیەمدا دەستگیر بکات، یان هەرکەسێك کە

بەدەستییەوەی دابێت، یان بەرامبەری هەر ڕێوشوێنێك بگرێتەبەر، بۆ گێڕانەوەی بۆ قەڵەمڕەوی یاساکانی ئەو دەوڵەتە، بەمەرجێ ڕێوشوێنەکان تا کاتی گونجاوو پێویست بەردەوام بێت، بۆ تەواوکردنی ڕێوشوێنی تاوانکاریی، یان ڕێوشوێنی بەدەستەوەدانی.

٣. پێویستە یارمەتی هەرکەسێك بدرێت کە بەپێی ناوەڕۆکی بڕگەی پێشوو دەستگیر کرابێت، کە بەزووترین کات پەیوەندیی بکرێت، بە نزیکترین نوێنەری ئەو وڵاتەی کە یەکێك لە هاووڵاتییانی بۆ دەگێڕدرێتەوە.

٤. پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتەی کەسێکی دەدرێتەوە دەست، بەپێی ناوەڕۆکی بڕگەی یەکەم لە مادەی نۆیەم، یان ئەوەی کە یەکێك لە فڕۆکەکان لە قەڵەمڕەوەکەیدا دەنیشێتەوە، دوای ئەنجامدانی یەکێك لەو کارانەی، لە بڕگەی یەکەم لە ماددەی یانزەدا هاتوون، یەکسەر هەستێت بە ئەنجامدانی لێپێچینەوەی سەرەتایی لە ڕووداوەکاندا.

٥. کاتێ وڵاتێك هەڵدەستێت بە دەستگیرکردنی کەسێك، بەپێی بڕگەکانی ئەم مادەیە، پێویستە لەسەری خێرا ئەو وڵاتە ئاگادار بکاتەوە کە فڕۆکەکەی بەناوەوەیە، یان ئەو دەوڵەتەی کەسەکە هاووڵاتییەتی لەراستی ئەو کارەو ئەو بارودۆخەی تر ئاگادار بکاتەوە، لەو زانیارییانە کە بەرژەوەندیی لەوە دابێتو بەباشی زانی، پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتەی لێپێچینەوەی سەرەتایی دەکات، بەپێی بڕگەی چوارەم لەم مادەیە کە یەکسەر دەست پێشخەری بکات، لەناردنی ڕاپۆرتێك سەبارەت بەئاکامی ئەو لێپێچینەوەیە، بەو دەوڵەتەی ئاماژەی پێکراوەو، تیایدا ئەوە ڕوون بکاتەوە کە ئایا بەتەمایە دەسەلاتی خۆی لەو بارەوە ئەنجام بدات.

**ماددەی چواردەیەم:**

١. ئەگەر کەسێك بەپێی بڕگەی یەکەم لە ماددەی هەشتەم لەفڕۆکە داگیرا یان بەپێی بڕگەی یەکەمی ماددەی نۆیەم دا بەدەستەوە، یان دوای ئەنجامدانی یەکێك لەو کارانەی، لەبڕگەی یەکەمی ماددەی یانزەهەمدا، ئاماژەی پێکراوە لە فڕۆکەکەدا داگیراو، نەیتوانی یان نەیویست درێژە بەگەشتەکەی بداتو ئەو

دەوڵەتەی فڕۆکەکەی تیادا نیشتبۆوە، رازی نەبوو قەبوڵی بکات، ئەوا بۆ ئەو دەوڵەتە هەیە، ئەگەر کەسەکە هاووڵاتی خۆی نەبێت، یان نیشتەجێی هەمیشەیی خۆی نەبێت، بیگێڕێتەوە بۆ قەڵەمڕەوی ولاتەکەی خۆی، یان بۆ قەڵەمڕەوی ئەو ولاتەی تیایدا، بەشێوەی هەمیشەیی نیشتەجێیە، یان بۆ قەڵەمڕەوی ئەو ولاتەی کە گەشتە هەواییەکەی لەوێوە ئەنجام داوە.

٢. دابەزاندنی کەسێك یان بەدەستەوەدانی، یان دەستگیرکردنی، یان گرتنەبەری رێوشوێنیتر کە لەبڕگەی دووەمی ماددەی سیانزەهەمدا ئاماژەی پێکراوە، هەروەها گێڕانەوەی کەسی ناوبراو، بەوە دانانرێت کە مۆڵەتی چوونە ناو قەڵەمڕەوی دەوڵەتێکی دیاریکراوی رێکەوتنامەکەی پێبدرێت و هەروەها سەبارەت بەیاساکانی ئەو ولاتە، تایبەتە بە چوونە ناوەوەی کەسان بۆ قەڵەمڕەوەکەی، یان وەرگرتنیان تیایدا، لە بڕگەکانی ئەم رێکەوتنامەیەدا، شتێکی ئەوتۆ نییە کە یەکنەگرێتەوەلەگەڵ یاساکانی ئەو ولاتەی دەیەوێت، ئەو کەسانە لە خاکەکەی خۆی دووربخاتەوە.

**ماددەی پانزەهەم:**

١. بەرەچاوکردنی بڕگەکانی مادەی چواردەهەم، هەرکەسێك کە بەپێی بڕگەی یەکەمی مادەی هەشتەم دابەزێنرا، یان بەپێی بڕگەی یەکەمی مادەی نۆیەم درابەدەستەوەو بیەوێت درێژە بەگەشتەکەی بدات، پێویستە لەنزیکترین کاتدا بەربدرێت، بۆ ئەوەی روو لەو شوێنە بکات کەخۆی دەیەوێت، ئەگەر هاتوو یاسای ئەو ولاتەی فڕۆکەکەی تیا نیشتۆتەوە، داوای نەکات، بۆ بەدەستەوەدانی، یان بۆ تەواوکردنی رێوشوێنی تری تاوانکاریی.

٢. پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتەی رێکەوتننامەکەی مۆرکردووەو کەسێك لەقەڵەمڕەوەکەیدا، بەپێی بڕگەی یەکەمی مادەی هەشتەم دادەگیرێت، یان بەدەستەوە دەدرێت، بەپێی بڕگەی یەکەم لەمادەی نۆیەمدا، یان ئەوەی کەسێکی گومانلێکراو بە ئەنجامدانی یەکێك لەو کارانە دادەگیرێت کە لەبڕگەی یەکەمی ماددەی پانزەیەمدا ئاماژەی پێکراوە، دەبێ بەو جۆرە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت کە کەمتر نەبێت لە مامەڵەی لەگەڵ هاووڵاتییانی لەکەدار بکرێت کە تایبەتە، بەچوونە

ناو قەڵەمڕەوەکەی یان وەرگرتنی کەسانێك تیایدا، یان دووبارە بەدەستەوەدانیان، یان دوورخستنەوەیان لێی.

## بابی پێنجەم
## چەند برگەیەکی‌تر

**ماددەی شانزەهەم:**

١. سەبارەت بەدووبارە بەدەستەوەدان، ئەو تاوانانەی کە لەناو فڕۆکەکەیدا ئەنجام دەدرێت کە لەیەکێك لەولاتانی رێکەوتنامەکەدا تۆمار کرابێت، لەهەر شوێنێکدا ئەنجام درابن، هەروەکو ئەوەی لەناو قەڵەمڕەوی ئەو ولاتەشدا ئەنجام درابێت کە فڕۆکەکەی تیا تۆمارکراوە.
٢. بەرەچاوکردنی ناوەڕۆکی برگەی پێشوو، شتێکی ئەوتۆ لە برگەکانی ئەم رێکەتنامەیەدا نییە کە رێوشوێنی دووبارە بەدەستەوە دان بسەپێنێت.

**ماددەی حەڤدەهەم:**

پێویستە لەسەر ئەو ولاتانەی رێکەوتننامەکەیان مۆرکردووە، لەکاتی گرتنەبەری رێوشوێنی لێپێچینەوە، یان کاتێ دەست بەکاربوون، لەجێبەجێکردنی دەسەلاتەکانی سەبارەت بەو تاوانانەی لەناو فڕۆکەدا ئەنجام دەدرێن، کە چاودێریی و ئاسایشی گەشتی هەوایی و بەرژەوەندییەکانی دابین بکات و، دەبێ نکۆڵی لە ئەنجامدانی ئەو رێوشوێنانەدا نەکات، بەبی پاساو سەبارەت بە فڕۆکەکە، یان سەرنشینان، یان ستافی فڕۆکەکەو کەل‌وپەلەکانی ناوی.

**ماددەی هەژدەهەم:**

ئەگەر ئەو ولاتانەی ئەندامی رێکەوتننامەکەی لەنێوان خۆیاندا، دامەزراوەی هاوبەشی گەشتی هەوایی، یان نووسینگەی نێودەوڵەتییان دامەزراند کە تیایدا فڕۆکەی تۆمار نەکراو، لەهیچ یەکێك لەو ولاتانە بەکار ببرێت، ئەوا پێویستە لەسەر ئەو ولاتانە، بەپێی بارودۆخ یەکێك لەو ولاتانە دەست نیشان بکرێت،

لەبواری ئامانجەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیە بەوڵاتی تۆمارکردن بەمەرجی ڕێکخراوی فڕۆکەوانیی مەدەنی ئاگادار بکرێتەوە، تا ئەویش هەموو وڵاتانی ئەندام لەو ڕێکخراوە ئاگادار بکاتەوە.

## بابی شەشەم

## دوابڕگەکان

**ماددەی نۆزدەیەم:**

تا ئەم ڕێکەوتنامەیە کاری پێدەکرێت، بەپێی مادەی بیست ویەکەم، دەرگا ئاوالایە بۆ هەر دەوڵەتێك مۆری بکات کە تا ئەو بەروارە ئەندام بێت لەنەتەوە یەکگرتووەکان، یان هەر ئاژانسێکی پەیوەندیداردا.

**ماددەی بیستەم:**

١. بڕیار لەسەر ئەم ڕێکەوتنامەیە دەدرێت، لەلایەن ئەو وڵاتانەی مۆریان کردووە، بەپێی ڕێوشوێنی دەستووری هەریەکەیان.

٢. بەڵگەنامەکانی مۆرکردن، بەئەنجوومەنی نێودەوڵەتی فڕۆکەوانیی مەدەنیی دەسپێردرێت.

**ماددەی بیست ویەکەم:**

١. دوا بەدوای سپاردنی بەڵگەنامەکانی بڕیاردان، لەسەر ڕێکەوتنامەکە لەلایەن دوانزە وڵاتەوە کە ئیمزایان کرد، لەنێوان خۆیاندا، کار بەبڕگەکانی ڕێکەوتنامەکە دەکرێت، نەوەد ڕۆژ دوای مێژووی سپاردنی بەڵگەنامەی وڵاتی دوانزەیەمەوە، بەڵام سەبارەت بەو وڵاتانەی، دواتر بڕیاری لەسەر دەدەن، ئەوا سەبارەت بە هەریەکەیان، لەسەرەتای ڕۆژی نەوەدەمینەوە، دوای تەواوکردنی سپاردنی بەڵگەکانی بڕیاردانەکە، کاری پێدەکرێت.

٢. ڕێکخراوی نێودەوڵەتی فڕۆکەوانیی مەدەنی هەڵدەستێت، بۆتۆمارکردنی ئەم ڕێکەوتنامەیە، لای سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، دوابەدوای کارپێکردنی.

**ماددەی بیست‌ودووەم:**

١. ئـەم ڕێکەوتنامەیـە دوای کـارپێکردنی، کـراوە دەبێـت بـۆ ئـەوەی هـەر دەوڵـەتێکی ئـەندام لـە نەتـەوە یـەکگرتووەکان، یـان هـەر ڕێکخـراوو ئاژانسـێکی پەیوەندیدار بچنە ریزیەوە.

٢. چوونـە ریـزەوە، لەڕێگـەی سپاردنی بەڵگەنامەکانی چوونـە ریـزەوە لـەلای ڕێکخراوی نێودەوڵـەتیی فڕۆکـەوانیی مـەدەنی دەبێـت و لـەرۆژی نەوەدەمینـەوە، دوای سپاردنی ئەو بەڵگەنامانە، کاری پێدەکرێت.

**ماددەی بیست‌وسێهەم:**

١. دوای ئاگادارکردنەوەی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی فڕۆکەوانیی مەدەنی بۆ هەر دەوڵەتێك لە دەوڵەتانی ڕێکەوتنامەکە هەیە لەو ڕێکەوتننامەیە بکشێتەوە.

٢. دوای شـەش مـانگ لـەرۆژی ئاگادارکردنـەوەی ڕێکخـراوی نێودەوڵـەتی فڕۆکەوانیی مەدەنی کار بەکشانەوەکە دەکرێت.

**ماددەی بیست‌وچوارەم:**

١. ئەگەر کێشـە لـەنێوان، دوو یـان زیـاتر لـەوڵاتانی پەیماننامەکـە پـەیدابوو، سەبارەت بەراڤەکردن، یان جێبەجێکردنی ئەم ڕێکەوتنامەیەو کە تـەنیا لەڕێگەی دانوسـتانەوە چارەسـەرکرا، ئـەوا دەبـی لەڕێگـەی داوای یـەکێك لـەو وڵاتانـەوە ڕەوانەی دادوەریی بکرێت، ئەگەر چەند لایەنێکی کێشـەکە ڕێك نەکەوتن، لەسەر لیژنـەی دادوەران، دوای شـەش مـانگ لـە رۆژی داوای ڕەوانـەکردن بـۆ دادوەری، ئەوا دەکرێ هەر لایەنێکی کێشەکە، لەسەر داوای خۆی، بەپێی سستمی دادگاکە، ڕەوانەی دادگایی نێودەوڵەتی دادی بکات.

٢. بۆهەر دەوڵەتێك، هەیە، لەکاتی ئیمزاکردن، یان بڕیاردان، یان چوونـە ریـزی ڕێکەوتنامەکەوە، پابەندنەبوونی خۆی رابگەیـەنێت، بەناوەڕۆکی پێشوو وڵاتـانی تـری پەیماننامەکـە پابـەند نـابن، بـە برگـەی نـاوبراوەوە، بـەر لـەو وڵاتـەی پەیماننامەکە کە بۆ یەکەمجار، ئەم پابەند نەبوونەی راگەیاند.

٣. بۆهەر دەوڵەتێکی پەیماننامەکە هەیە کە بەپێی برگەی پێشوو پابەندنەبوونی خۆی راگەیاند، ئەو داوایەی خۆی بکێشێتەوە، لەهەر کاتێکدا لەرێگەی ئاگادارکردنەوەی ئەنجومەنی نێودەوڵەتیی فڕۆکەوانیی مەدەنی.

**ماددەی بیست و پێنجەم:**

جگە لەو پابەند نەبوونانەی لە مادەی بیست و چوارەمدا ئاماژەیان پێکرا، ناکرێت هیچ پابەند نەبوونێك، بەرامبەر ئەم رێکەوتنامەیە رابگەیەنرێت.

**ماددەی بیست وشەشەم:**

رێکخراوی نێودەوڵەتیی فڕۆکەوانیی مەدەنی ئاگاداری هەموو دەوڵەتانی ئەندام، لە نەتەوە یەکگرتووەکان یان هەر ئاژانسێکی پەیوەندیدار، بەم شتانەی خوارەوە، دەکاتەوە:

أ. بەهەر ئیمزاکردنێك لەسەر رێکەوتننامەکەو مێژووەکەی.

ب. بەسپاردنی هەر بەڵگەنامەیەکی بڕیاردان، یان هاتنە ریزیەوەو مێژووەکەی.

ج. بەمێژووی دەست بەکاربوونی رێکەوتننامەکە، بەپێی برگەی یەکەم لە ماددەی بیست ویەکەم.

د. بەوەرگرتنی هەر ئاگادار کردنەوەیەك، سەبارەت بەکشانەوەی مێژووەکەی.

هـ. بەوەرگرتنی هەر ئاگاداری، یان ئاگادارکردنەوەیەك، بەپێی مادەی (٤)و مێژووەکەی.

بۆ سەلماندنی ئەمانە، ئەوانەی لە خوارەوە ئیمزایان کردووەو بەپێی ئەو دەسەڵاتەی پێیان دراوە، ئەم رێکەوتننامەیەیان ئیمزاکرد.

ئەم رێکەوتننامەیە بەرێکخراوی نێودەوڵەتیی فڕۆکەوانیی مەدەنی دەسپێردرێت بەپێی مادەی ١٩و کراوە دەبێت بۆ ئیمزاکردن و رێکخراوی ناوبراو هەڵدەستێت، بەناردنی وێنەی بڕوادار، بۆ هەموو دەوڵەتانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان، یان هەر ئاژانسێکی پەیوەندیدار.

# ڕێکەوتننامەی بنبڕکردنی زەوتکردنی نایاسایی فڕۆکە
# (کە لەلاهای لە ڕۆژی ١٦ی کانونی یەکەمی ١٩٧٠دا ئیمزاکرا)

## پێشەکی

ئەو دەوڵەتانەی ئەم ڕێکەوتننامەیەیان ئیمزا کردووە، لەو بڕوایەدان لە کاری دەست بەسەراگرتنی ناڕەوا، یان هەوڵی کۆنترۆڵکردنی فڕۆکە لەکاتی فڕیندا، گیانی کەسان و سامانیان دەخاتە مەترسییەوەو کاریگەریی ترسناکی لەسەر وەگەڕخستنی هێڵە ئاسمانییەکان هەیەو متمانەی جیهان بە ئاسایشی فڕۆکەوانیی مەدەنی کز دەکات و. لەو بڕوایەدان ڕوودانی ئەم جۆرە کارانە، مایەی نیگەرانییەکی زۆرە. لەو بڕوایەدان کەنیازی زۆر هەیە، بۆ دۆزینەوەی ڕێسای گونجاو بۆ سزادانی ئەنجامدەرانی ئەم جۆرە کارانە، بەمەبەستی ڕێگەگرتن لە ڕوودانیان، بۆیە لەسەر ئەوەی خوارەوە ڕێککەوتن:

**ماددەی یەکەم:**

هەرکەسێ لەناو فڕۆکەدا، کە لەحاڵەتی فڕیندا بێت:

أ. بەبێ مافێکی ڕەوا، هەستێت بەدەست بەسەراگرتنی فڕۆکە، یان هەوڵی دەست بەسەراگرتنی بدات، لەڕێگەی هێزو هەڕەشە، یان هەر شێوازێکی تری توندوتیژیی.

ب. بەشداریی بکات لەگەڵ کەسێکدا کە بیەوێت یەکێك، لەو کارانە ئەنجام بدات، بەتاوانبار ئەژمار دەکرێت.

**ماددەی دووەم**

هەردەوڵەتێکی ڕێککەوتنامەکە بەڵێن دەدات کە سزای توونـد بۆ ئەو تاوانانە دابنێت.

**ماددەی سێهەم:**

١. سەبارەت بەمەبەستەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیە، فڕۆکە هەر لەکاتی داخستنی دەرگاکانی دەرەوەی، دوای بارکردنی، بەوە دادەنرێت کە لەحاڵەتی فڕیندا بێت، تا ئەو کاتەی دەرگاکانی دەکرێتەوە، بەمەبەستی بار داگرتنی و لەکاتی نیشتنەوەی نائاساییدا، فڕۆکەکە لەحاڵەتی فڕیندا دەبێت، تا ئەوکاتەی دەسەڵاتە پەیوەندیدارەکان، بەرامبەر فڕۆکەکەو سەرنیشینان و کەل‌وپەلەکانی ناوی دەست بەکارەکانیان دەکەن.

٢. ئەم ڕێکەوتننامەیە ئەو فڕۆکانە ناگرێتەوە کە بۆ خزمەتگوزاریی جەنگی و گومرگ و پۆلیس بەکاردەبرێن.

٣. ئەم ڕێکەوتننامەیە جێبەجێ ناکرێت، تەنیا لەکاتێکدا نەبێت کە شوێنی هەڵسانی ئەو فڕۆکەیەی، تاوانەکە لەناویدا ئەنجامدراوە، یان شوێنی نیشتنەوەی ئێستای بکەوێتە دەرەوەی قەڵەمڕەوی ئەو وڵاتەی کە فڕۆکەکەی تیادا تۆمارکراوە، بەرەچاو نەکردنی ئەوەی کە ئەگەر فڕۆکە، لەگەشتێکی نێودەوڵەتی، یان ناوخۆییدا بەکارهاتبێت.

٤. ئەم ڕێکەوتننامەیە لەو حاڵەتەی کە لەمادەی پێنجەمدا هاتوون، جێبەجێ ناکرێت، ئەگەر شوێنی هەڵسانی ئەو فڕۆکەیەی تاوانەکەی تیادا ئەنجام درابێت و شوێنی نیشتنەوەی ئێستای بکەونە ناو قەڵەمڕەوی هەمان وڵاتەوە، ئەگەر ئەو دەوڵەتە یەکێك بێت، لەو دەوڵەتانەی لەمادەی ناوبراودا، ئاماژەی پێکراوە.

٥. وێڕای ئەوەی لەبڕگەی ٣و٤ی ئەم مادەیەدا هاتووە، مادەکانی ٦و٧و٨و١٠ جێبەجێ دەکرێن، ئەگەر شوێنی هەڵسانی فڕۆکەکە هەر کوێ بێت، یان شوێنی نیشتنەوەی ئێستای ئەگەر ئەنجامدەرانی تاوانەکە، یان تاوانبارکراوەکە لەناو قەڵەمڕەوی دەوڵەتێکی تری، جگە لەو دەوڵەتەی فڕۆکەکەی تیادا تۆمارکراوە دابوو.

**ماددەی چوارەم:**

١. پێویستە لەسەر هەر دەوڵەتێك کە پەیماننامەکەی مۆرکرد، ئەو ڕێوشوێنانە بگرێتەبەر کە ڕەنگە پێویست بن بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی دادوەریی، سەبارەت

بەتاوانەکــە، یــان هــەر کــارێکیتر لــەکارەکانی توندوتیــژی کــە رەنگـــە دژی سەرنشینان، یان ستافی فڕۆکەکە، لەلایـەن تاوانبارەکـەوە، بـەهۆی ئـەنجامدانی تاوانەکە ئەنجام درابێت، لەم حاڵەتەدا:

أ. تاوانەکە ئەنجامدەدرێت، لەناو فڕۆکەیەکی تۆمارکراو لەو دەوڵەتەدا.

ب. کـاتی ئـەو فڕۆکەیـە کــە لــەناویدا تاوانەکــە ئـەنجام دراوە، لەقەڵــەمڕەوی دەوڵەتەکەو هێشتا تاوانبارەکە لەناویدایە دەنیشێتەوە.

ج. ئەگــەر تاوانەکــە لــەناو فڕۆکەیــەکی بــەکرێ دراو ئـەنجام درابێــت کــە نووسینگەی سەرەکی کاری کرێگرتەکـە لـەو دەوڵەتــەدا بێـت، یـان نیشــتەجێی هەمیشەیی هەبێت تیایدا، ئەگەر وەها نووسیگەیەکی تیادا نەبێت.

٢. هەر دەوڵەتێکی رێکەوتننامەکە هەڵدەسێت، بەو رێوشوێنانەی پێویستن، بۆ دامەزراندنی پسپۆڕیی دادوەریی لەسەر تاوانەکە، ئەگەر هاتوو تاوانبارەکـە لـە قەڵــەمڕەوەیدا بـوو، بـەپێی مـادەی هەشــتەم نـایدات بەدەسـتی هیـچ یـەکێك لـەو وڵاتانەی، لەبڕگەی یەکەمی ئەم مادەیەدا، ئاماژەی پێکراوە.

٣. ئەم رێکەوتنامەیە، هیچ دەسەڵاتو پسپۆڕێکی تاوانکاریی بەدوور نازانێت کە بەپێی یاسای نیشتمانی کاری پێبکرێت.

**ماددەی پێنجەم:**

پێویســتە لەســەر وڵاتــانی رێکەوتنامەکــە کــە لــەنێوانیاندا، دامو دەزگــای وەگەڕخســتنی هاوبەشـیی گواسـتنەوەی هـەوایی، یـان ئاژانسـی وەگەڕخسـتنی نێودەوڵەتی دادەمەزرێنن کە تیایاندا فڕۆکە گەلێ بەکار دەبرێت، دەبنە شـوێنی تۆمارکردنی هاوبەش، یان نێودەوڵەتی کە بۆ هەر فڕۆکەیەك بەئامرازی پێویست، وڵاتێـك لـەنێوانیاندا دیـاری بکرێـت کـە راسـتەوخۆ دەسـەڵاتی دادوەریـی خـۆی بەسەریدا هەبێتو ئەو وڵاتـەی تیایدا تۆمارکراوە هەڵدەستێت بەلێکۆڵینەوە بـۆ ئامانجەکانی ئەم رێکەوتنامەیەو ئاگاداری رێکخـراوی نێودەوڵـەتی فڕۆکـەوانیی مەدەنی دەکاتەوەو، رێکخراویش ئەم ئاگادارکردنەوەیە بەسەر هەموو دەوڵەتانی ئەندامی ئەم رێکەوتنامەیەدا دەگشتێنێت.

**ماددەی شەشەم:**

**١. پێویستە لەسەر هەموو وڵاتانی رێکەوتنامەکە کە ئەنجامدەری تاوانەکەیان تاوانبارکراو، بەئەنجامدانی لەسەر خاکەکەیدا بێت، دەستگیری بکات، یان رێوشوێنی تر بگرێتەبەر بۆ دەستگیرکردنی یان هەر رێوشوێنێکی تر کە بیپارێزێت، ئەگەر گەیشتە ئەو بڕوایەی کە دۆخەکە وا دەخوازێت و دەستگیر دەکرێت، یان رێوشوێنیتر پیادە دەکرێت، بەپێی بڕگەکانی یاساکانی ئەم دەوڵەتە، بەمەرجێ رێوشوێنەکانیتر بەردەوام بێت، بەپێی بڕگەکانی یاساکانی ئەم دەوڵەتە، بەمەرجی تەنیا هەر ئەو رێوشوێنانە بگرێتەبەر تا ئەوکاتەی بتوانرێت رێوشوێنی دادگایی، یان رێوشوێنی بەدەستەوەدان ئەنجام بدرێت.**

**٢. پێویستە لەسەر ئەم دەوڵەتە، یەکسەر لێپێچینەوەی سەرەتایی لەسەر رووداوەکان بکات.**

**٣. پێویستە یارمەتی هەرکەسێك بدرێت کە بەپێی بڕگەی یەکەم لەم مادەیە دەستگیر دەکرێت، بە پەیوەندیی کردنی خێرا بە نزیکترین نوێنەری ئەو دەوڵەتەی کە ئەو کەسە هاوڵاتییەتی.**

**٤. کاتێ وڵاتێك هەڵدەستێت، بەدەستگیرکردنی کەسێك، بەپێی ئەم مادەیە، پێویستە یەکسەر ئاگاداری ئەو وڵاتە بکاتەوە کە فڕۆکەکەی لەسەر تۆمارکراوەو، ئەو دەوڵەتەیش کە لەبڕگەی (١) لە مادەی چوارەمدا ئاماژەی پێکراوەو، هەروەها ئەو دەوڵەتەی کە کەسی دەستگیرکراو هەڵگری رەگەزنامەیەتی، یان هەر وڵاتێکیتری بەرژەوەندیدار، ئەگەر زانی کە ئەوە پێویستەو ئەو بارودۆخەی پێویستیکرد دەست بداتە ئەو کارەو، پێویستە لەسەر ئەو وڵاتەی لێپێچینەوەی سەرەتایی دەکات، بەپێی بڕگەی(٢) لەم مادەیە، خێرا راپۆرتێك سەبارەت بەئاکامی ئەو لێپێچینەوەیە، بەپێی بڕگەی(٢) لەم مادەیە، بنێرێت بۆ ئەو ولاتانەی ئاماژەیان پێکراو تیایدا روونی بکاتەوە کە ئایا بەنیازە دەست بەکاری دادگایی بکات؟**

**ماددەی حەوتەم:**

ئەگەر ئەو دەوڵەتەی ڕێکەوتنامەکەی مۆرکرد، هەڵنەستێت بە بەدەستەوەدانی ئەو تاوانبارەی کە لە قەڵەمڕەوەکەیدا بوو، دەبێ بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی چ کەسێکەو بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی تاوانەکە لە وڵاتەکەیدا ئەنجام درابێت یان نەء کێشەکە ڕەوانەی دەسەڵاتە دادگاییەکانی بکات، بۆ دادگایی کردنی و پێویستە لەسەر ئەم دەسەڵاتانە، بەهەمان ئەو ڕێگەیەی ڕەچاو دەکرێت، سەبارەت بەهەر تاوانێکی ئاسایی گەورە، بەپێی یاسای ئەو دەوڵەتە بۆ ئەو تاوانەش ئەنجامی بدات.

**ماددەی هەشتەم:**

١. تاوانەکە بەیەکێك لەو تاوانانە دادەنرێت کە قابیلی بەدەستەوەدانەو هەر ڕێکەوتنامەیەکی بەدەستەوەدان، لەنێوان دەوڵەتانی ڕێکەوتننامەکەیدا هەبێت و وڵاتانی ڕێکەوتننامەکە بەڵێن دەدەن ئەو تاوانە دابڕێژن، لەهەر ڕێکەوتنامەیەکی بەدەستەوەدان کە لەداهاتوودا دەبەسترێت، وەکو یەکێك لەو تاوانانەی کەدەبی بەدەستەوەدانی تیادابێت.

٢. ئەگەر دەوڵەتێکی ڕێکەوتننامەکە، بەپێویستی زانی ڕێکەوتنامەیەك هەبێت، بۆ بەدەستەوەدان، وەکو مەرجێك بۆ جێبەجێکردنی بەدەستەوەدان، بەمەبەستی داوای بەدەستەوەدان، لەوڵاتێکی تری ڕێکەوتننامەکە کە هیچ ڕێکەوتنامەیەك بەیەکتریان نابەستێتەوە، ئەوا دەتوانرێت و بەپێی خواستێکی خۆی، ڕێکەوتنامەکە بکاتە بنەمایەکی یاسایی بۆ بەدەستەوەدان، سەبارەت بەتاوانەکەو بەدەستەوەدانەکەیش بەپێی مەرجیتر ئەنجام دەدرێت کە یاسای ئەو دەوڵەتە بڕیاری لەسەر دەدات کە داوای بەدەستەوەدانەکەی لێدەکرێت.

٣. پێویستە لەسەر وڵاتی ڕێکەوتنامەکە، بۆ جێبەجێکردنی بەدەستەوەدانەکە مەرجی بوونی ڕێکەوتنامەیەك بەرپا دانەنێت، دەبێ لەناوخۆیاندا دان بەوەدا بنێن، تاوانەکە یەکێکە لەو تاوانانەی بەدەستەوەدان تێدا دەبێت، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەو مەرجانەی لەیاساکانی ئەو وڵاتەدا هاتوون کە لێی داوا دەکرێت تاوانبارەکە بەدەستەوە بدات.

٤. سەبارەت بەمەبەستەکانی بەدەستەوەدان، بەجۆرێ مامەڵە لەگەڵ تاوانەکەدا دەکرێت، لەنێوان وڵاتانی پەیماننامەکەدا هەروەکو بڵێی تەنیا ئەنجام نەدرابێت، نەك تەنیا لەو شوێنەی کە تیایدا روویدا، بەڵکو لە قەڵەمڕەوی ئەو وڵاتانەش بەپێی بڕگەی (١) لەمادەی چوارەم کە دەسەڵاتی دادگایی، بۆ پیادە دەکرێت.

**ماددەی نۆیەم:**

١. ئەگەر یەکێك لەو کارانە رووی‌دا کە لەمادەی (١)دا هاتووە، یان خەیکبوو رووبدات، ئەوا پێویستە لەسەر وڵاتانی پەیماننامەکە هەموو رێوشوێنێکی گونجاو بگرنەبەر، بۆ دووبارە کۆنترۆڵکردنی فڕۆکەکە، لەلایەن فڕۆکەوانەکەوە، یان درێژەدانی بە کۆنترۆڵکردنی.

٢. پێویستە لەسەر هەر وڵاتێکی رێکەوتنامەکە کە فڕۆکەکە، یان سەرنشینانی یان ستافەکە لەسەر خاکەکەی بن، ئاسانکاری بۆ سەرنشینان و ستافەکە بکەن، بۆ درێژەدان بەگەشتەکەیان لە نزیکترین دەرفەتی رەخساودان هەروەها دەبێ فڕۆکەکە بە کەلوپەلەکەیەوە بەبێ دواکەوتن بگرێتەوە، بۆ ئەو کەسانەی مافیان تیایدا هەیە بەپێی یاسا، بەپێی ئەو حاڵەتانەی لە مادەی (١)دا هاتوون.

**ماددەی دەیەم:**

١. پێویستە لەسەر وڵاتانی پەیماننامەکە کە هەریەکەیان بۆ ئەوی‌تر، هەموو یارمەتییەك پێشکەش بکات، سەبارەت بەو رێوشوێنە دادگاییانەی رەچاو دەکرێن، بەر لەو تاوان و کردەوانەی‌تر کە لەمادەی (٤)دا هاتووە و لەهەموو حاڵەتەکاندا، یاسای ئەو وڵاتە جێبەجێ دەکرێت کە داوای یارمەتی لێدەکرێت.

٢. ناوەڕۆکی بڕگەی (١)ی ئەم مادەیە کاریگەریی نابێت لەسەر ئەو پابەندبوونانەی کە هەر رێکەوتنامەیەکی‌تر دەیسەپێنێت چ لەنێوان دوو وڵات، یان بەکۆ کە یارمەتیی ئاڵوگۆڕکراو لەکێشە تاوانبارەییەکاندا رێکدەخات.

**ماددەی یانزەهەم:**

هەر دەوڵەتێکی رێکەوتنامەیەو بەپێی یاسای نیشتمانی خۆی بەراپۆرتێك زانیاریی گونجاو دەخاتە بەردەم ئەنجومەنی رێکخراوی نێودەوڵەتیی فڕۆکەوانیی مەدەنی، بەزوترین کات، سەبارەت بە:

أ. بارودۆخی تایبەت بە تاوانەکە.
ب. بەو ڕێوشوێنانەی بەپێی مادەی(٩) ڕەچاوکراوە.
ج. بەو ڕێوشوێنانەی ڕەچاو کراوە، بەر لەئەنجامدانی تاوانەکە، بەتایبەتی ئاکامەکانی هەر ڕێوشوێنێکی بەدەستەوەدان، یان ڕێوشوێنە یاساییەکانی‌تر.

**ماددەی دوانزەیەم:**

١. ئەگەر کێشەیەك لەنێوان دوو دەوڵەت، یان زیاتر لەو دەوڵەتانەدا بەرپابوو کە پەیماننامەکەیان مۆرکردووە، سەبارەت بەراڤەکردن یان جێبەجێکردنی ئەم ڕێکەوتنامەیەو، لەڕێگەی دانوستانەوە یەکلایی نەکرایەوە، ئەوا ڕەوانەی‌دادوەری دەکرێت، ئەویش لەسەر داوای هەریەکێك لەو دەوڵەتانە. ئەگەر لایەنە پەیوەندیدارەکان بەکێشەکە، لەسەر لیژنەی دادوەران لەماوەی شەش مانگدا ڕێکنەکەوتن، لەڕۆژی داوای ڕەوانەکردنەکەوە بۆ دادوەری، ئەوا بۆ هەر یەکێك لەو لایەنانە هەیە، بە داواکارییەك بەپێی سستمی دادگای ناوبراو کێشەکە ڕەوانەی دادگای نێودەوڵەتی داد بکات.

٢. بۆ هەر دەوڵەتێك هەیە، لەکاتی مۆرکردن یان بڕیاردان لەسەر ئەم ڕێکەوتنامەیە، یان چوونە ریزییەوە، ئەوە ڕابگەیەنێت کە پابەندی بڕگەی سەرەوە نابێت.

ولاتانی تری ڕێکەوتنامەکە، بەر لە هەر دەوڵەتێکی تری ڕێکەوتنامەکە پابەندنابن بەبڕگەی سەرەوە، کە ئەم پابەندنە بوونەی ڕاگەیاند بێت.

٣-بە پێی بڕگەی سەرەوە، بۆ هەر دەوڵەتێکی ڕێکەوتنامەکە هەیە کە پابەند بوونی ڕاگەیاند بێت، کە لەو پابەند بوونەی خۆی پەشیمان بێتەوە هەر کاتێ ویستی، لە ڕێگەی ناردنی ئاگادارییەك لەمەڕ ئەوە بۆ ئەو ولاتانەی، پێشتر لە پابەند نەبوونی خۆی ئاگاداری کردبوون.

**مادەی سیانزەیەم:**

١-ڕێکەوتنامەکە کراوە دەبێت بۆ ئیمزا کردنی، لەلاهای لەڕۆژی ١٦ی کانونی یەکەمی ١٩٧٠وە، سەبارەت بەو ولاتانەی کە بەشدارییان لە کۆنگرەی نێودەوڵەتیی یاسای ئاسمانیی کرد کە لە لاهای بەسترا لەماوەی ١-١٦ی کانونی

یەکەمی ١٩٧٠ (کە دواتر لەکۆنگرەی لاهای ئامارەی پێکرا)و لە دوای ٣١ی کانونی یەکەمی ١٩٧٠وە، بۆ هەموو وڵاتان هەیە ئیمزای بکەن لە مۆسکۆو لەندەن و واشنتۆن. وبۆ هەر وڵاتێك هەیە ئیمزای ئەم رێکەوتنامەیەی نەکردبێت، چوونە ریزیەوەی پەسەند بکرێت، تاکاتی جێبەجێ کردن بەپێی برگەی (٣) لەم مادەیە کەهەر کاتێ بیەوێت بچێتە ریزیەوە.

٢-بۆ ئەم رێکەوتنامەیە شوێنێك دەبێت، بۆ بڕیاردان لەسەری لەلایەن ئەو وڵاتانەی ئیمزایان کردووە. بەڵگەنامەکانی بڕیاردان و چوونە ریزیەوە، لەلای وڵاتانی یەکێتی سۆڤیەت و بەریتانیا و ئیرلەندای باکوور و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دادەنرێن کە لەم رێکەوتنامەیەدا، وەکو حکومەتی پێسپاردن دەست نیشان کراون.

٣-ئەم رێکەوتنامەیە، دوای ٣٠ ڕۆژ لە بەرواری سپاردنی بەڵگەنامەکانی بڕیاردانی (١٠)وڵات کە مۆریان کردبێت، لەسەر ئەم رێکەوتنامەیەو بەشدارییان، لە کۆنگرەی لاهایدا کردبێت، جێبەجێ دەکرێت.

٤-ئەم رێکەوتنامەیە، سەبارەت بە وڵاتانی تر لە ڕۆژی جێبەجێ کردنیەوە، بەپێی برگەی (٣)لەم مادەیە، یان دوای (٣٠) ڕۆژی دواتر لە مێژووی سپاردنی بەڵگە نامەکانی بڕیاردان لەسەری، یان چوونە ریزییەوە-کامیان دوورتر بوو-کاری پێدەکرێت.

٥-وڵاتانی پێسپێردراو لە زۆرترین کاتدا، لە بەرواری سپاردنی هەر بەڵگە نامەیەکی بڕیاردان، یان چوونە ریزەوەو مێژووی جێبەجێ کردنی رێکەوتنامەکەو هەر پێسپاردنێکی‌تر، ئاگاداری ئەو وڵاتانە دەکەنەوە کە مۆریان کردووەو چوونەتە ریزیەوە.

٦-وڵاتانی پێسپێردراو، یەکسەر دوای جێبەجێ کردن، بەپێی مادەی١٠٢ی بەڵگە نامەی نەتەوە یەکگرتووەکان و مادەی (٨٣) لە پەیماننامەی فرۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتی (شیکاگو ١٩٤٤) ئەم پەیماننامەیە تۆمار دەکەن.

**ماددەی چواردەیەم:**

١-بۆ هەر دەوڵەتێکی ڕێکەوتنامەکەهەیە، لەڕێگەی نووسراوێکەوەکە ئاراستەی وڵاتانی پێسپێردراودەکرێت لەو ڕێکەوتنامەیە بکشێتەوە.

٢-دوای ڕەتبوونی (٦) مانگ لە رۆژی وەرگرتنی ئاگادارییەکە لەلایەن وڵاتانی پێسپێردراوەوە کشانەوەکە دەکەوێتە بواری جێبەجێ کردنەوە.

بۆ سەلماندنی ئەوانە، نوێنەران لە خوارەوەو بەپێی ئەو دەسەڵاتەی پێیان دراوە، لەلایەن وڵاتەکانیانەوە ئیمزایان کرد.

لەڕۆژی ١٦ی کانونی یەکەمی‌ساڵی ١٩٧٠، بەسێ وێنە هەریەکەیان بە چوار زمانی ڕەسمیی ئینگلیزیو فەرەنسیو ڕوسیو ئیسپانی دەرکرا.

# ڕێکەوتنامەی بنبڕکردنی تاوانەکانی دەستدرێژیی، بۆسەر ئاسایشی فڕۆکەوانیی مەدەنی
# ( کەلە شاری مۆنتریال لە ڕۆژی ۲۳ی ئەیلولی ۱۹۷۱دا مۆرکرا )

وڵاتانی بەشدار بوو لەم ڕێکەوتنامەیە، ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەکەن:
تاوانەکانی دەستدرێژیی بۆسەر فڕۆکەوانیی مەدەنی، هەڕەشە لەئاسایشی کەسەکان و سامانەکان دەکات و، کاریگەریی ترسناکی لەسەر هێڵە ئاسمانییەکان دەبێت و متمانەی گەلانی جیهان بەئاسایشی فڕۆکەوانیی مەدەنی کەم دەکاتەوە.
ڕوودانی وەها تاوانگەلێك دەبێتە مایەی نیگەرانی و، بۆ ڕێگە گرتن لەم تاوانانە، پێویست دەکات ڕێوشوێنی گونجاو بۆ سزادانی تاوانباران ئەنجام بدرێت. ولەسەر ئەمانەی خوارەوە ڕێککەوتن:

**ماددەی ( ۱ ):**

۱-هەر کەسێ بە ئەنقەست و بەبێ مافێکی ڕەوا، کارێ لەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدات، بەتاوانبار دادەنرێت:

(أ) دەست بداتە کاری توندوتیژی، دژی کەسێك لەناو فڕۆکە لەکاتی فڕیندا، ئەگەر هاتوو ئەو کارە بووە هۆی ئەوەی ئاسایشی فڕۆکەکە بکەوێتە مەترسییەوە.

(ب) فڕۆکەیەك لە کار بخات و نەتوانێت بفڕێت، یان ڕەنگ بێت ئاسایشی فڕۆکەکە لە کاتی فڕیندا، ڕووبەڕووی مەترسی بکاتەوە.

(ج) بە هەر شێوازێك، ئامێر یان مادەیەك بخاتە ناو فڕۆکەکەوە، کە شیمانەی لەکار خستنی فڕۆکەکەی لێبکەوێتەوە، یان کەموکوڕی تیادا پەیدا بکات کە ڕەنگ بێت لە کاتی فڕیندا ئاسایشی ڕووبەڕووی مەترسی بکاتەوە.

(د) ئاسانکاریی هاتوچۆی ئاسمانی تێکبدات،یان دەست لەکاری وەربدات، ئەگەر هاتوو بەهۆی ئەو کارانەوە شیمانەی ئەوەکرا ئاسایشی فڕۆکەکە لەکاتی فڕیندا، ڕووبەڕووی مەترسی بکاتەوە.

(هـ) ئەگەر زانیاریی درۆی ڕاگەیاندو، بەوەش ئاسایشی فڕۆکەکانی لەکاتی فڕیندا، بخاتە مەترسیەوە.

٢-هەر کەسێك یەکێك لەم دووکارەی خوارەوە ئەنجام بدات، بە تاوانبار دەناسرێت:

(أ) ئەگەر یەکێك ئەنجام بدات کە لە بڕگەی یەکەمی ئەم مادەیەدا هاتوون.

(ب) ئەگەر هاوبەشیی بکات، لەگەڵ کەسێك کە یەکێك لەو تاوانانە ئەنجام بدات.

**ماددەی (٢)**

سەبارەت بەمەستەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیە:

(أ)فڕۆکە لە حاڵەتی فڕیندا دادەنرێت، هەر لەو کاتەوە کە دەرگاکانی دەرەوەی دادەخرێن، دوای سەرکەوتنی سەرنشینان، تائەوکاتەی دەرگاکان دەکرێتەوە، بۆ دابەزینی سەرنشینان و لەکاتی نیشتنەوەی نائاساییدا، هەر فڕۆکەکە بەوە دادەنێت کە لە حاڵەتی فڕیندا بێت، تائەو کاتەی دەسەڵاتە پەیوەندیدارەکان دەست بەکار دەبن، لە بەرامبەر فڕۆکەکەو سەرنشینان و ئەو شتومەکەی لە فڕۆکەکەدایە.

(ب) وا دادەنرێت کە فڕۆکەکە لەکاتی ئیشکردندا بێت، هەر لە کاتی ئامادەکردنی فڕۆکەکە، بەر لە فڕین لە ڕێگەی ستافی خزمەتگوزاریی زەمینی، یان لە ڕێگەی ستافی فڕۆکەکە بۆ دەست پێکردنی گەشتێکی دیاریکراو، تا دوای ڕەتبوونی(٢٤) سەعات بەسەر هەر نیشتنەوەیەکی فڕۆکەکەداو، ماوەی خزمەتگوزای بە دێژایی هەموو ئەو ماوەیە درێژ دەکرێتەوە کە فڕۆکەکە لە حاڵەتی فڕیندا دەبێت بەو شێوەیەی لە بڕگەی(أ)ی ئەم مادەیەدا دیاریکراوە.

**ماددەی(٣):**

هەر دەوڵەتێکی ڕێکەوتنامەکە بەڵێن دەدات سزاکانی سەر ئەم تاوانە توندتر بکات کە لە مادەی یەکەمدا هاتوون.

**مادەی (٤):**

**١–ئەم رێکەوتننامەیە ئەو فرۆکانە ناگرێتەوە کە بۆ کاری جەنگی، گومرگی یان کاری پۆلیس بەکار دەبرێن.**

**٢–لەو حاڵەتانەی لە(أ)و (ب)و (ج)و (ھ) لەبڕگەی(١) لە مادەی یەکەمدا هاتوون، ئەگەرچی فرۆکەکە بەکارگیرابێت، بۆ گەشتێکی نێودەوڵەتی یان ناوخۆ، ئەم رێکەوتننامەیە تەنیا لە دوو حاڵەتدا، کاری پیدەکرێت:**

**أ–ئەگەر شوێنی هەستان یان نیشتنەوەی فرۆکەکە، بکەوێتە دەرەوەی قەڵەمڕەوەی ئەو دەوڵەتەی فرۆکەکەی تیا تۆمار کراوە.**

**٣–لەو حاڵەتانەی لە(أ)، (ب)، (ج)، (ھ) لە بڕگەی(١) لە مادەی یەکەمدا هاتوون‌و، بەبێ رەچاوکردنی بڕگەی(٢) لەم مادەیە، ئەم رێکەوتننامەیە کاری پێدەکرێت، ئەگەر تاوانبار لە وڵاتێکی تردا بوو، جگە لەو دەوڵەتەی کە فرۆکەکەی تیا تۆمار کراوە.**

**٤–سەبارەت بەو وڵاتانەی لە مادەی(٩)دا ئاماژەیان پێکراوەو، لەو حاڵەتانەی لە(أ)، (ب)، (ج)و (ھ) لە بڕگەی (١) مادەی یەکەمدا، ئەم رێکەوتننامەیە کاری پێ ناکرێت، ئەگەر هاتوو ئەو شوێنانەی لە(أ) لە بڕگەی(٢)ی ئەم مادەیەدا ئاماژەی پێکراوە، بکەوێتە ناو قەڵەمڕەوی هەمان دەوڵەت، ئەگەر هاتوو ئەو دەوڵەتە یەکێك لەو وڵاتانە بێت کە لە مادەی(٩)دا، ئاماژەیان پێکراوە، مەگەر لە حاڵەتێکدا نەبێت کە تاوانەکە لە قەڵەمڕەوی وڵاتێکی تردا ئەنجام درابێت‌و تاوانبارەکە لە قەڵەمڕەوی وڵاتێکی تردا بێت.**

**٥–لەو حاڵەتانەی لە(د) لە بڕگەی(١) لە مادەی یەکەمدا هاتووە، ئەم رێکەوتنامەیە کاری پێ ناکرێت، مەگەر لەو حاڵەتەی کە یارمەتییەکانی گەشتی ئاسمانی، بۆ مەبەستی گەشتی ئاسمانیی نێودەوڵەتی بەکاربرێت.**

**٦–بڕگەکانی(٢)و (٣)و (٤)و(٥)ی ئەم माددەیە، لەو حاڵەتانەدا کاریان پێدەکرێت کە لە بڕگەی(٢)ی مادەی یەکەمدا هاتوون.**

**مادەی( ٥ ):**

١-پێویستە لەسەر هەر ولاتێکی رێکەوتنامەکە، رێوشوێنی پێویست بگرێتەبەر، بە مەبەستی دەسەلاتی دادوەریی خۆی، لە مەڕ تاوانەکان، لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:

أ-کاتێ تاوانەکە لە قەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتەدا ئەنجام دەدرێت.

ب-کاتێ تاوانەکە لە دژی یان لە ناو فڕۆکەکەیدا ئەنجام دەدرێت کە لەو ولاتەدا تۆمار کرابێت.

ج-کاتێ فڕۆکەکە دەنیشتێتەوە کە لە ناویدا تاوانەکە ئەنجام درابێت، لە قەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتە کە هێشتا تاوانبارەکە لەناو فڕۆکەکەدا بێت.

د-کاتێ تاوانەکە لە دژی یان لەناو فڕۆکەکەیدا ئەنجام دەدرێت کە بەکرێ گیرابێت، بەبێ ستاف لەلایەن شوێنێکی ترەوە کە سەنتەری سەرەکی کارەکانی لەو ولاتەدابێت، یان نیشتەجێ هەمیشەیی ئەو ولاتە بێت، ئەگەر وەها شەنتەرێکی لەو ولاتەدا نەبێت.

٢-پێویستە لەسەر هەر دەوڵەتێکی رێکەوتننامەکە، رێوشوێنی پێویست بگرێتەبەر، بەمەبەستی دەسەلاتی دادگایی خۆی‌و لەمەڕ ئەو تاوانانەی لە (أ)و (ب)و (ج) لە بڕگەی (١) لە مادەی یەکەمدا هاتوون‌و هەروەها بڕگەی(٢) لە هەمان مادده، بەو ئەندازەیەی کە ئەو بڕگەیە پەیوەندیی پێوە هەیە، ئەگەر هاتوو تاوانبارەکە لە قڵەمڕەوەیدا بوو، یان بەپێی مادەی هەشتەم، بەدەستیەوە نەدابێت، بەهەر یەکێك لەو دەوڵەتانەی لە بڕگەی(١)ی ئەم مادەیەدا ئاماژەیان پێکراوە.

٣-ئەم رێکەوتنامەیە، رێگە لە هەر دەسەلاتێکی دادگایی ناگرێت کە بەپێی یاسای نیشتمانی کاری پێدەکرێت.

**مادەی ( ٦ ):**

١-پێویستە لەسەر هەر دەوڵەتێکی رێکەوتنامەکە کە تاوانبارەکە لە قەڵەمڕەویدایە دەستگیری بکات، یان رێوشوێنی تر بگرێتەبەر، بۆ ئامادەکردنی، کاتێ بڕوای بەوەکرد کە دۆخەکە ئەوە دەخوازێت. لەمەڕ دەستگیرکردن‌و رێوشوێنەکانی تردا، دەبێ ئەو رێگایانە رەچاوبکرێن کە لە یاسای ئەو دەوڵەتەدا

هاتوون، کە بەردەوام نەبێت، تەنیا بۆ کاتی پێویست نەبێت، بۆ ئەوەی رێوشوێنی دادگایی یان رێوشوێنی بەدەستەوەدان ئەنجام بدرێت.

٢-پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتە، یەکسەر کاری لێپێچینەوەی سەرەتایی لەسەر رووداوەکە ئەنجام بدات.

٣-پێویستە بەپێی برگەی(١) لەم مادەیە یارمەتی هەر کەسێکی دەستگیرکراو بدرێت کە یەکسەر پەیوەندیی بە نزیکترین نوێنەری پەیوەندار لەو دەوڵەتە بکات کە کەسەکە هاوولاتیی ئەویَ بێت.

٤-کاتیَ ولاتێك، بەپێی ئەم مادەیە کەسێك دەستگیر بکات، پێویستە یەکسەر ئاگاداری ئەو ولاتانە بکات کە لە مادەی(٥) برگەی(١) دا ئاماژەیان پێکراوەو، ئەو ولاتەش کە دەستگیرکراوەکە هەڵگری رەگەزنامەیەتی. و هەر دەوڵەتێکیتر کە پەیوەندیی بەو کارەوە هەبێتو ئەگەر بە پێویستی زانی، لەمەڕ چۆنیەتی رووداوەکەو دەستگیرکردنیو ئەو دۆخەی پاساو بۆ گرتنەکەی دەهێنێتەوە. کە لە برگەی (٢)ی ئەم مادەیەدا هاتووە، راستەوخۆ بەراپۆرتێك ئاگاداری ئەو ولاتانە بکات کە ئاماژەیان پێکراوە، لە ئاکامی لێپێچینەوەکەو، پێویستە ئەوەش روون بکاتەوە کە ئایا دەیەوێت دەسەلاتی دادگایی خۆی بەکاربهێنێت.

**مادەی (٧):**

پێویستە لەسەر ولاتی ئەندامی رێکەوتنامەکە کە تاوانبارەکە لە قەڵەمڕەویدایە، ئەگەر نەیدا بەدەستەوە، کێشەکە رەوانەی دەسەلاتە پەیوەندیدارەکانی خۆی بکات، بۆ دادگایکردنی، بەبیَ هیچ جیاوازییەك چ ئەو تاوانە لە قەڵەمڕەوی ئەو ولاتە یان لە ولاتێکی تردا. ئەنجام درابێت.

پێویستە لەسەر ئەم دەسەلاتانە، بریارەکانی خۆیان بدەن بە هەمان ئەو رێگەیەی کە دەیگرنەبەر، لەهەر کێشەیەکی ئاساییدا، لە روانگەی یاسای ئەو دەوڵەتەوە، کە مۆرکێکی ترسناکی هەیە.

**مادەی( ٨ ):**

١-ئەو تاوانانەی دیاریکراون بەو تاوانانە دادەنرێن کە مەسەلەی بەدەستەوەدان دەیانگرێتەوە، لە هەر رێکەوتننامەیەکی بەدەستەوەدان، لە نێوان

وڵاتانی ڕێکەوتنامەکەدا. وڵاتانی ڕێکەوتنامەکە بەڵێن دەدەن کە ئەم تاوانانە دابنرێن لەهەر ڕێکەوتنامەیەکی بەدەستەوەداندا کە لە ئایندەدا دەبەسترێت، وەکو تاوانگەلێ کە بەدەستەوەدان دەیانگرێتەوە.

٢-ئەگەر وڵاتێکی ڕێکەوتنامەکە، بۆ ئەنجام دانی بەدەستەوەدان، مەرجی بوونی ڕێکەوتنامەی هەبوو، بۆ داوای بەدەستەوەدان لە وڵاتێکی تری ڕێکەوتنامەکە کە پەیماننامەی بەدەستەوەدان لە نێوانیاندا نەبێت. ئەوا بۆی هەیە ئەو ڕێکەوتنامەیە بکات بە بەڵگەیەك، بۆ بەدەستەوەدانی یاسایی، سەبارەت بەو تاوانانەی بڕیاریان لەسەر دراوەو، بە دەستەوەدان ئەو مەرجانەی تر دەیانگرێتەوە کە یاسای ئەو دەوڵەتە بڕیاری لەسەر داوە کە داوای لێدیکرێت پرۆسەی بەدەستەوەدان ئەنجام بدات.

٣-پێویستە لەسەر وڵاتی ڕێکەوتنامەکە، ئەو مەرجانە دانانێت کە پەیماننامە هەبێت، بۆ ئەنجامدانی بەدەستەوەدان، کە لە نێوان خۆیان دان بەوەدا بنێن کە ئەو تاوانانەی بڕیاریان لەسەردراوە بەدەستەوەدان دەیانگرێتەوە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەو مەرجانەی بڕیاریان لەسەردراوە، لە یاسای ئەو وڵاتەی داوای لێدەکرێت پڕۆسەی بەدەستەوەدان ئەنجام بدات.

٤-لەگەڵ هەر یەکێك لەو تاوانانەی بڕیاریان لەسەرداوە، بەم جۆرە مامەڵە دەکرێت: سەبارەت بە ئامانجەکانی بەدەستەوەدان، لە نێوان وڵاتانی ڕێکەوتنامەکەدا، هەر وەکو بڵێی ئەنجام درابێت، نەك تەنیا لەو شوێنەی تیایدا رووی داوە، بەڵام لە قەڵەمڕەوی ئەو وڵاتانەشدا کە راسپێردراون دەسەڵاتی دادوەریی خۆیان، بەپێی(أ)، (ج)، (د)ی برگەی یەکەم لە مادەی پێنجەم پیادە بکەن.

**مادەی (٩):**

پێویستە لەسەر ڕێکەوتنامەکە کە لە نێوانیاندا دامودەزگای وەگەڕ خستنی هاوبەش دروست دەبێت، بۆ گواستنەوە یان ئاژانسی نێودەوڵەتیی گواستنەوەی ئاسمانی، هەستن بە کارکردن بەو فرۆکانەی لەژێر تۆمارکردنی هاوبەش، یان نێودەوڵەتیدان، کە لە نێوان خۆیاندا- بەو شێوازانەی بە گونجاوی دەزانن- ئەو

دەوڵەتە دیاری بکەن کە دەست بەکاری پیادەکردنی دەسەلاتی دادوەریی دەبێت‌و بەهەر فڕۆکەیەك، بۆ مەبەستەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیەو، پێویستە لەسەری ئاگاداری ڕێکخراوی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتی بکاتەوە، کە ئەویش هەموو ولاتانی ئەندام لە ئەم ڕێکەوتنامەیەدا ئاگادار دەکاتەوە.

**مادەی(١٠):**

١-پێویستە لەسەر دەوڵەتانی ڕێکەوتنامەکە هەموو ڕێوشوێنێکی ڕەخساو بگرنەبەر، بۆ ڕێگەگرتن لەڕوودانی ئەو تاوانانەی لە مادەی یەکەمدا هاتوون، بە پێی یاسای نێودەوڵەتی‌و یاسای نیشتیمانی.

٢-کاتێ ڕوودانی یەکێك لەو تاوانانەی کە لە مادەی یەکەمدا هاتوون، دەبێتە هۆی دواکەوتنی یەکێك لە گەشتەکان، پێویستە لەسەر ولاتی ڕێکەوتنامەکە کە فڕۆکەکە لەناو قەڵەمڕەوەکەیدایە، یان سەرنیشینان یان ستافەکە، دەبێت هەموو ئاسانکارییەك بکات بۆ بەردەوام بوونی گەشتی سەرنشینان‌و ستافەکە، بەزووترین کاتی ڕەخساو، هەروەها دەبێ بەبێ دواکەوتن فڕۆکەکە بەکەل‌وپەلەکانیەوە بگێڕێتەوە بۆ ئەو کەسانەی بەپێی یاسا مافی خاوەندارێتیان هەیە.

**مادەی(١١):**

١-پێویستە لەسەر ولاتانی ڕێکەوتنامەکە کە هەر یەکەیان هەموو یارمەتییەك پێشکەش بەوانی تر بکات، سەبارەت بە ڕێوشوێنی دادوەریی سەبارەت بە تاوانەکان. و لە هەموو حاڵەتەکاندا، یاسایی ئەو ولاتە جێبەجێ دەکرێت کە داوای یارمەتیی لێدەکرێت.

٢-ناوەڕۆکی برگەی(١)ی ئەم مادەیە کار ناکاتە سەر ئەو پابەندبوونانەی کە هەر پەیماننامەیەکی تر دەیسەپێنێت، چ لە نێوان دوو ولاتدا بێت یان زیاتر، کە لە مەسەلە تاوانکاریەکاندا هەندێك یا هەموو ئەو یارمەتییە ئاڵوگۆڕانە ڕێکدەخات.

**مادەی(١٢):**

پێویستە لەسەر هەر وڵاتێکی ڕێکەوتنامەکە کە پاساوی هەیە، بەوەی کە یەکێك لەو تاوانانە ئەنجام دەدرێت کە لە مادەی یەکەمدا هاتوون، دەتوانێت بەپێی یاسای نیشتیمانی خۆی، هەر زانیارییەك ڕابگەیەنێت کە هەیەتی بەو وڵاتانەی کە پێی وایە لەو وڵاتانەن کە لە مادەی(٥)، بڕگەی(أ) دا ئاماژەیان پێکراوە.

**مادەی(١٣):**

هەر وڵاتێکی ڕێکەوتنامەکە، بەپێی یاسای نیشتیمانی خۆی، هەڵدەستێت بە ئاگاداركردنی ئەنجومەنی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی فڕۆکەوانیی مەدەنیی، بەخێرایی لەمەڕ هەموو ئەو زانیارییانەی لەبەر دەستیدایە، دەربارەی:

أ-بارودۆخی تاوانەکە.

ب-ئەو ڕێوشوێنەی بە پێی بڕگەی(٢) لە مادەی(١٠) ڕەچاوکراوە.

ج-ئەو ڕێوشوێنانەی، سەبارەت بە تاوانبارەکەو، بە تایبەتی ئاکامەکانی هەر ڕێوشوێنێکی بەدەستەوەدان، یان هەر ڕێوشوێنێکی یاسایی تر کە ڕەچاوکراون.

**مادەی(١٤):**

١-هەر کێشەیەك لە نێوان دوو وڵات، یان زیاتر لە وڵاتانی ڕێکەوتنامەکە، سەبارەت بەراڤەکردن یان جێبەجێ کردنی ئەم ڕێکەوتنامەیە، کە لە ڕێگەی دانوستانەوە چارەسەر نەکرێت، ڕەوانەی دادگا دەکرێت، لەسەر داوای هەر یەکێك لەو دەوڵەتانە. و ئەگەر لایەنەکانی کێشەکە نەیانتوانی بە پێی بڕیاری دادگا لە ماوەی ٦ مانگ لە ڕۆژی داوای ڕەوانەکردنە کە بۆ دادگا ڕێبککەون، ئەوا بۆ هەر لایەنێك هەیە کێشەکە ڕەوانەی دادگای نێودەوڵەتیی داد بکات، بە پێی داوایەك کە بەپێی سستمی دادگاکە پێشکەش دەکرێت.

٢-بۆ هەر دەوڵەتێك هەیە، لە کاتی مۆرکردن یان بڕیاردان لەسەر ئەم ڕێکەوتنامەیە، یان چوونە ریزیەوە پابەندنەبوونی خۆی بە بڕگەی پێشوو ڕابگەیەنێت. وڵاتانی تری ڕێکەوتنامەکە پابەند نابن بەبڕگەی پێشوو، ڕووبەڕووبوونەوەی هەر وڵاتێکی ڕێکەوتنامەکە کە ئەو پابەند نەبوونەی ڕاگەیاند.

٣-بۆ هەر وڵاتێکی ڕێکەوتنامەکە هەیە کە پابەندنەبوونی خۆی ڕاگەیەنێ، بە پێی بڕگەی پێشوو لەو پابەندنەبوونەی پەشیمان ببێتەوە لەهەر کاتێکدا، لەڕێگەی ناردنی ئاگادارکردنەوەیەك بۆ ئەو وڵاتانەی بەڵگەنامەکانیان پێ سپێردراوە.

**مادەی( ١٥ ):**

١-دەرگای مۆرکردن لەسەر ئەم ڕێکەوتنامەیە لە مۆنتریال دەکرێتەوە، لە ٢٤ی ئەیلولی ١٩٧١وە، سەبارەت بەو وڵاتانەی بەشدارییی لە کۆنگرەی دەوڵەتیی یاسای فڕۆکەوانیدا دەکەن کە لە مۆنتریال بەسترا لە ٨-٢٣ی ئەیلولی١٩٧١(کە دواتر بە کۆنگرەی مۆنتریال ناوبرا). و لە مۆسکۆو لەندەن و واشنتۆن لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٧١، سەبارەت بە هەموو وڵاتان و هەر وڵاتێك کە ئیمزای ئەم ڕێکەوتنامەیە ناکات، بەر لەدەست بەجێبەجێکردنی بکرێت بەپێی بڕگەی(٣)ی ئەم مادەیە، بۆی هەیە، لەهەر کاتێکدا بچێتە ڕیزیەوە.

٢-ئەم ڕێکەوتنامەیە لەلایەن ئەو وڵاتانەی ئیمزایان کردووە، بڕیاری لەسەر دەدرێت. و بەڵگەنامەکانی بڕیاردان و بەڵگەنامەکانی چوونەڕیزەوە لای وڵاتانی یەکێتی سۆڤیەت و بەریتانیاو ئیرلەندەی باکوورو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەسپەردە دەکرێن کە لەم ڕێکەوتنامەیە دیاریکراون وەکو وڵاتانی ئەسپەردە.

٣-ئەم ڕێکەوتنامەیە، دوای ٣٠ ڕۆژ لە مێژووی سپاردنەوە، لەلایەن (١٠) وڵاتی ڕێکەوتننامەکە، کە بەشدارییان لە کۆنگرەی مۆنتریالدا کردووە دەکەوێتە بواری جێبەجێ کردنەوە.

٤-ئەم ڕێکەوتنامەیە، دەکەوێتە بواری جێبەجێ کردنەوە، سەبارەت بەو وڵاتانەی تر، لەڕۆژی جێبەجێ کردنیەوە، بەپێی بڕگەی(٣)ی ئەم مادەیە، یان دوای ٣٠ ڕۆژ لە مێژووی سپاردنی بەڵگەنامەکانی بڕیاردانی، یان چوونە ڕیزیەوە، واتە کام بەروار دەبێت بە پاشکۆی ئەوی تریان.

٥-پێویستە لەسەر ئەو وڵاتانەی بەڵگەکانیان پێ دەسپێردرێت، یەکسەر ئاگاداری هەموو ئەو وڵاتانەی ڕێکەوتنامەکەو ئەوانەی چوونەتە ڕیزییەوە،

بکەنەوە لە مێژووی هەر ئیمزایەك‌و، مێژووی سپاردنی هەر بەڵگەنامەیەکی بڕیاردان یان چوونە ریزەوەو، مێژووی جێبەجێکردنی رێکەوتنامەکەو هەر زانیارییەکی تر.

٦-لەگەڵ دەست بەکاربوون، بەپێی رێکەوتنامەکە، ئەو دەوڵەتانەی ئەرکی سپاردنیان پێ سپێردراوە هەڵدەستن بە تۆمارکردنی بە پێی مادەی(١٠٢)ی بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان‌و، مادەی ٨٣ لە رێکەوتنامەی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتی(شیکاگۆ، ١٩٩٤)

**مادەی( ١٦ )**

١-بۆ هەر وڵاتێکی رێکەوتننامەکە هەیە، لەم رێکەوتننامەیە بکشێتەوە لە رێگەی نووسراوێکەوە، بۆ ئەو وڵاتانەی ئەرکی راسپاردنیان لە ئەستۆدایە.

٢-دوای رەتبوونی(٦) مانگ بەسەر مێژووی وەرگرتنی ئاگادارییەکە لەلایەن ئەو وڵاتانەی ئەرکی راسپاردنیان پێ‌سپێردراوە، کار بە کشانەوەکە دەکرێت. بۆ سەلماندنی ئەوە، ئەم رێکەوتننامەیە لەلایەن ئەم نوێنەرانەی خوارەوە ئیمزاکرا، بەپێی ئەو دەسەڵاتەی لەلایەن حکومەتەکانیانەوە پێیان دراوە: لە رۆژی ٢٣ی ئەیلولی ساڵی ١٩٧١، بەسێ وێنەو، هەر یەکەیان بەچوار دەق بەزمانی ئینگلیزی‌و فەرەنسی‌و روسی‌و ئیسپانی، لە مۆنتریالدا نووسرا.

# پرۆتۆکۆڵێك سەبارەت بەراستکردنەوەی ڕێکەوتنامەی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتیی کە لە ۱۰ی مایسی ۱۹۸٤دا لە مۆنتریال مۆرکرا.

کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتی لە خولی(۲۵) واتە نا ئاسایی، لە مۆنتریال لە ۱۰ی مایسی ۱۹۸٤دا دەبەستێت و تێبینی ئەوەی کرد کە فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتیی ڕەنگە یارمەتی بدات، بۆ هێنانەکایەی ڕاستگۆیی و تەبایی لە نێوان وڵاتان و گەلانی جیهاندا، بەڵام خراپ بەکارهێنانی فڕۆکەوانی ڕەنگە ببێتە مایەی هەڕەشە لەسەر ئاسایشی گشتی و، تێبینی ئەوە دەکات کە پێویستە ململانێ لە نێوان گەلاندا دروست نەبێت و هاوکاریی نێوانیان بەهێزبێت، کە ئاشتی جیهانی لەسەریان پابەندە. و کە تێبینی کرد پێویستە فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتی گەشە بکات و گیانی ئەو کەسانە پارێزراو بێت کە لەناو فڕۆکەدان، بەپێی مافەکانی مرۆڤ و بەوەی کە وڵاتانی ڕێکەوتنامەکە لە فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتیدا کە لە شیکاگۆ لە ڕۆژی ۷ی کانونی یەکەمی ۱۹٤٤دا مۆرکرا، بۆیە دان بەوە دادەنێت کە هەر دەوڵەتە سەرەوەریی تەواو ورەهای خۆی هەیە، بەسەر قەڵەمڕەوی ئاسمانی خۆیدا، کاتێ بنەماکانی تایبەت بە فڕۆکەکانی ئەو دەوڵەتە دادەڕێژرێن، دەبێ ئاسایشی گەشتی فڕۆکە مەدەنییەکان ڕەچاو بکات و ڕەزامەندیی لەسەر ئەوە هەبێت کە بەکار نەهێنانی فڕۆکەوانیی مەدەنیی، بۆ چەندین مەبەست کە نەگونجێن لەگەڵ ئامانجەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیەدا، و بەوەی تێبینی ئەوەی کرد کە سووربوونی وڵاتانی ڕێکەوتنامەکە، لەسەر گرتنەبەری ڕێوشوێنی گونجاو، بۆ ڕێگەنەدان بە بەزاندنی قەڵەمڕەوی ئاسمانی وڵاتانی ترو ڕێگەنەدان بە بەکارهێنانی فڕۆکەوانیی مەدەنی، بۆ مەبەست گەلێ کە نەگونجێت لەگەڵ مەبەستەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیەو بەرادەیەکی بەرچاو ئاسایشی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتیی پتەوبکات، و

بەوەی ئارەزووی گشتیی وڵاتەکانی ڕێکەوتننامەکەو جەختکردنیان لەسەر پرەنسیپی بەکارهێنانی چەك دژی فڕۆکەی مەدەنی لە کاتی فڕیندا:

١-بڕیاری ئەوە درا، کە باشتر وایە کار بە ڕێکەوتنامەی فڕۆکەوانیی نێودەوڵەتی بکرێت کە لە شیکاگۆ لە ٧ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٤دا مۆرکرا.

٢-ڕەزامەندی، بە پێی دەقی مادەی ٩٤(أ) لە ڕێکەوتنامەی ناوبراو، لەسەر ئەم راستکردنەوە پێشنیارکراوەی خوارەوە لەسەر ڕێکەوتنامەی ناوبراو.

لە دوای مادەی(٣)دا، مادەیەکی نوێ(٣ی دوبارە)دەنووسرێت.

**مادەی(٣)ی دووبارە:**

أ-هەموو وڵاتانی ڕێکەوتنامەکە بڕوایان وایە کە پێویستە لەسەر هەر وڵاتێك پەنا نەباتە بەر بەکارهێنانی چەك دژی فڕۆکەی مەدەنی لە کاتی فڕیندا، هەروەها پێویستە لە کاتی ڕوودانی بەرەنگاربوونەوە کە گیانی ئەو کەسانەی لەناو فڕۆکەکەدان نەکەوێتە مەترسییەوەو ئاسایشی فڕۆکەکە لە مەترسی بپارێزرێت و نابێ ئەم دەقە وا راڤە بکرێت کە بەهەر شێوەیەك لە شێوەکانی ماف و پابەندبوونی ئەو وڵاتانە ئەوە راستدەکاتەوە کە لە بەڵگەنامەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا هاتووە.

ب-هەموو وڵاتانی ڕێکەوتنامەکە بڕوایان وایە هەر وڵاتێك مافی ئەوەی هەیە سەروەریی خۆی پراکتیزە بکات کە هەر فڕۆکەیەکی مەدەنی ناچار بکات لە فڕۆکەو خانەیەکی دیاریکراودا بنیشێتەوە کە بەبێ بەڵگە بەقەڵەمڕەوی ئاسمانی ئەوەدا ڕەتبێت، یان چەند هۆیەکی لەبار هەبێت وا دەربخات کە ئەو فڕۆکەیەی بەکار دەبرێت، بۆ هەر مەبەستێك کە ڕێك نەکەوێت لەگەڵ ئامانجەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیەداو، بۆ دەوڵەتەکەش هەیە هەر زانیارییەك دەربکات بۆ ئەو فڕۆکەیە، بۆ دانانی ئاستێك بۆ ئەو سنوور بەزاندنانەو، بۆ ئەم مەبەستە، بۆ وڵاتانی ڕێکەوتنامەیەك هەیە پەنا بباتە بەر هەر شێوازێکی گونجاو کە یەك بگرێتەوە، لەگەڵ بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتیی پەیوەندیداردا، بەو بڕگە

پەیوەندیدارانەشەوە کە لەم ڕێکەوتنامەیەدا هاتوونو، بە تایبەتی بڕگەی(أ) لەم مادەیە. و هەموو وڵاتێکی پەیماننامەکە، لەسەر بڵاوکردنەوەی یاساو ڕێوشوێنە تایبەتەکانی خۆی، لەمەڕ ڕێگەگرتن لە فڕۆکەی مەدەنی ڕەزامەند بێت.

ج-پێویستە هەر فڕۆکەیەکی مەدەنی ملکەچی هەر فرمانێك بێت کە بەپێی بڕگەی(ب) لەم مادەیە بۆی دەردەچێتو بۆ ئەم مەبەستە پێویستە لەسەر هەر دەوڵەتێکی ڕێکەوتنامەکە، هەموو بڕگە پێویستەکان لە یاساکانی خۆیدا دابنێت، تاوەکو هەموو فڕۆکەیەکی مەدەنی تۆمارکراو لەو دەوڵەتەدا پێوەی پابەند بێت، یان یەکێك کاری پێبکات کە بارەگای سەرەکیی کارەکەی، یان بە هەمیشەیی نیشتەجێی ئەو وڵاتە بێت. ئەو یاسانە، لە ڕێگەی سزای توندەوە سزا بدرێتو حاڵەتەکە بە پێی یاسای ئەو وڵاتە بگەیەنێتە دەسەڵاتە پەیوەندیدارەکان.

د-پێویستە لەسەر هەر وڵاتێکی ڕێکەوتنامەکە، ڕێوشوێنی گونجاو بگرێتەبەر تا ڕێگە بگرێت، لە بەکارهێنانی بە ئەنقەستی هەر کارێك لەگەڵ ئامانجەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیەدا یەك نەگرێتەوە هەر فڕۆکەیەکی مەدەنی تۆمارکراو لەو وڵاتەدا. یان کەسێك هەستێت بەکارکردن پێیو بارەگای سەرەکیی کارەکەی، یان هەمیشە نیشتەجێی ئەو وڵاتە بێتو ئەم دەقە کارناکاتە سەر بڕگەی(أ) یان کاری هەردوو بڕگەی(ب)و (ج)ی ئەم مادەیە ناشێوێنێت.

و بە پێی بڕگەکانی مادەی ناوبراو ٩٤(أ) لە ڕێکەوتنامەی ناوبراو ژمارەی ئەو وڵاتانەی ڕێکەوتنامەکە دیاری دەکات کە ڕاستکردنەوەی پێشنیارکراوەکە دوای بڕیاردان لەسەری کە(١٠٢)ە.

٤-و بڕیاردرا کە سکرتێری گشتیی ڕێکخراوی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتی پرۆتۆکۆڵێك دابنێت بە زمانی ئینگلیزیو فەرەنسیو ڕوسیو ئیسپانی، بە شێوەیەکی یەکسان کە ئەو ڕاستکردنەوەیە پێشنیارکراوە ئاماژ پێکراوەی تیادا بێت، جگە لەم بابەتانەی خوارەوە:

أ-سەرۆکی کۆمەڵەی گشتی و سکرتێرە گشتییەکە ئیمزای پرۆتۆکۆلەکە بکەن.

ب-دەرگای بڕیاردان لەسەر پرۆتۆکۆڵەکە کراوە بێت، بۆ هەر وڵاتێك بڕیاری لەسەر ڕێکەوتنامەی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتی ناوبراو دابێت، یان چووبێتە ریزییەوە.

ج-بەڵگەنامەکانی بڕیاردان لای ڕێکخراوی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتیی هەڵدەگیرێن.

د-کار بە پرۆتۆکۆڵەکە دەکرێت لەلایەن ئەو وڵاتانەی بڕیاریان لەسەردرا لەو مێژووەوەی کە بەڵگەنامەی بڕوا کردنی(١٠٢) تیادا، بە شوێنی خۆی دەسپێردرێن.

ه-سکرتێری گشتی یەکسەرە هەموو وڵاتانی ڕێکەوتنامەکە، لەمەڕ بەرواری سپاردنی هەر بڕیاردانێك لەسەر پرۆتۆکۆڵەکە، ئاگادار دەکاتەوە.

و-سکرتێری گشتی ئاگاداری هەموو وڵاتانی لایەن دەکاتەوە لەو ڕێکەوتنامەیەدا، سەبارەت بەو مێژووەی کە تیایدا پرۆتۆکۆڵەکە دەکەوێتە بواری جێبەجێ کردنەوە.

ز-سەبارەت بەهەر دەوڵەتێکی ڕێکەوتنامەکە کە بڕیار لەسەر پرۆتۆکۆڵەکە دەدات، دوای ئەو مێژوە، پرۆتۆکۆڵەکە کاری پێدەکرێت دوای ئەوەی بەڵگەنامەی بڕیاردان لەسەری دەسپێردێت بەڕێکخراوی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتیی و لە ئاکامی ئەنجامدانی بڕیاری ناوبراوی کۆمەڵەی گشتی، سکرتێری گشتیی ڕێکخراوەکە هەستا بە ئامادەکردنی ئەم پرۆتۆکۆڵە.

بۆ سەلماندنی، سەرۆك و سکرتێری گشتیی خولی(٢٥)ی نا یاسایی ڕێکخراوی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتیی، بەپێی ئەو دەسەڵاتەی لە کۆمەڵەی گشتیدا پێی درا، ئیمزای پرۆتۆکۆڵەکەی کرد لە ڕۆژی ١٠ی مانگی مایسی ١٩٨٤دا، بە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ڕوسی و ئیسپانی دەرکراو، هەموو دەقەکان وەکو یەکتروان.

ئەم پرۆتۆکۆڵە لە ئەرشیفی ڕێکخراوی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتیدا هەڵدەگیرێت و سکرتێری گشتیی ڕێکخراوەکە وێنەی دەقاودەقی، بەسەر هەموو وڵاتانی ڕێکەوتنامەی فڕۆکەوانیی مەدەنیی نێودەوڵەتیدا، دابەش دەکات کە لە شیکاگۆ لە ڕۆژی ٧ی کانونی یەکەمی ١٩٤٤دا مۆرکراوە.

( ئیڤی لامبرێت )
سکرتێری گشتی
ئەسعەد قوتەیب )
سەرۆکی خولی ( ٢٥)ی نا ئاسایی کۆمەڵەی گشتی

# پێرست

## بەشی سەرەتا



## بەشی یەکەم

## بەشی دووەم

بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بەقەڵاچۆکردنی تیرۆری نێودەوڵەتیی

بابەتی یەکەم: ڕێکەوتننامەکانی قەدەغەکردن و بنبڕکردنی کارە تیرۆرییە ئاراستەکراوەکانی دژی دەوڵەت

یەکەم: ڕێکەوتننامەی جنێف بۆ قەدەغەکردن و سزادانی تیرۆر ساڵی ۱۹۳۷

۱-چوارچێوەی جێبەجێکردنی ڕێکەوتنامەکە

۲-دەسەڵاتی دادوەری

۳-بەدەستەوەدان

دووەم: ڕێکەوتننامەی ساڵی ۱۹۷۷ی ئەوروپا بۆ بنبڕکردنی تیرۆر

۱-چوارچێوەی جێبەجێکردنی ڕێکەوتنامەکە

۲-دەسەڵاتی دادوەریی

۳-بەدەستەوەدان

بابەتی دووەم: بەڵگەنامە تایبەتەکان بۆ قەدەغەکردن و سزادانی کردەی تیرۆریی ئاراستەکراو دژی تاکەکان و ئەو کەسانەی لە ژێر پارێزگاریی نێودەوڵەتی

یەکەم: ڕێکەوتنامەی قەدەغەکردن و سزادانی کاری تیرۆر کە شێوەی تاوانی دژی کەسەکان لەخۆ دەگرێت و کاری وەرس کردن کە بایەخی نێودەوڵەتی هەبێت

۱- چوارچێوەی جێبەجێکردنی ڕێکەوتنامەکە

۲- دەسەڵاتی دادوەریی

۳- بەدەستەوەدان

دووەم: ڕێکەوتنامەی ڕێگەگرتن و سزادانی ئەو تاوانانەی ئاراستەی ئەو کەسانە دەکرێن کە لە ژێر پارێزگاری نێودەوڵەتیدان بە کەسانی دبلۆماسییەوە کە لە نیۆیۆرک لە ساڵی ۱۹۷۳ مۆرکراوە

۱- چوارچێوەی جێبەجێکردنی ڕێکەوتنامەکە

۲- دەسەڵاتی دادوەریی

٣- بەدەستەوەدان

سێیەم: ڕێکەوتنامەی نێودەوڵەتی بۆ بەگژداچونەوەی بەبارمتەگرتن کە لە نیۆیۆرك لە ساڵی ١٩٧٩دا مۆرکراوە

بابەتی سێیەم: ڕێکەوتنامە پەیوەندیدارەکانی بە بنبڕکردنی دەست تێوەردا نایاسایی لە خزمەتگوزاری فڕۆکەوانی مەدەنی نێودەوڵەتیدا

یەکەم: ڕێکەوتنامەی تاوانەکان و کردەکانی تر کە لەناو فڕۆکەدا ئەنجام دەدرێن کە ساڵی ١٩٦٣دا مۆرکراون.

١- چوارچێوەی جێبەجێکردنی ڕێکەوتنامەکە

٢- دەسەڵاتی دادوەریی

٣- بەدەستەوەدان

دووەم: ڕێکەوتنامەی بنبڕکردنی دەست بەسەراگرتنی ناڕەوای فڕۆکەکە لە ساڵی ١٩٧٠دا مۆرکراوە

١- چوارچێوەی جێبەجێکردنی ڕێکەوتنامەکە

٢- دەسەڵاتی دادوەریی

٣- بەدەستەوەدان

سێیەم: ڕێکەوتنامەی نەهێشتنی تاوانەکانی دەست درێژی کردنە سەر ئاسایشی فڕۆکەوانی مەدەنی لە ساڵی ١٩٧١دا ئیمزاکراوە

١- چوارچێوەی جێبەجێ کردنی ڕێکەوتنامەکە

٢- دەسەڵاتی دادوەریی

٣- بەدەستەوەدان

چوارەم: چەند تێبینییەك سەبارەت بە ڕێکەوتننامەکانی بنبڕکردنی دەستێوەردانی نایاسای لە خزمەتگوزارییەکانی فڕۆکەوانی مەدەنیی نێودەوڵەتیدا

بابەتی چوارەم: چەند ڕێکەوتنامەیەکی تر هەندێ دیاردەی تیرۆری نێودەوڵەتی

یەکەم: لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی

دووەم: لەسەر ئاستی ئیقلیمی

# بەشی سێیەم

## بەشی چوارەم

## بەشی پێنجەم